**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

● **سروشتی مەعریفە و فەلسەفەی مێژوو**

● نووسینی: پ. د. موحسین محەمەد حوسێن

● نەخشەسازی ناوەوە: باران

● بەرگ: وریا بوداغی

● ژمارەی سپاردن: (٢٧٣١) ساڵی ٢٠١١

● نرخ: ٣٠٠٠

● چاپی یەکەم: ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠

● چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٦٠٢)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# پێشەکی

هەر لە سەرەتاکانی خوێندنەوەوە، هەوای خوێندنەوەی بابەتگەلی هزری لەکەڵڵەی دام، تا وام لێ هات بتوانم لە ساڵی ١٩٥٥- ١٩٥٧ دا لە دواناوەندیی هەولێر، کە ئەو دەمە لە قۆناغی چواری ئامادەییدا قوتابی بووم، پەیڤێك لەبارەی هزری ئیبن خەلدون لە بلاوکراوەی سەر دیواری قوتابخانەکەدا بنووسم و بلاوبکرێتەوە. لەبەرئەوە بەلای هیچ کەسێکەوە سەیر نەبوو، کە بە شێوەیەکی بەرچاو لە ماددە هزرییەکانی قۆناغی زانکۆشدا (١٩٥٨ — ١٩٦٢) سەرکەوتن بە دەست بێنم. نەخاسمە لەلای مامۆستای هزری ئیسلامی دکتۆر محەمەد ئەلهاشمی کە لە ساڵی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی ماجستێرەکەم دا (١٩٧١- ١٩٧٢) هەمان بابەتی دەگوتەوە، ئەو حاڵەتەش بە روونی دەرکەوت کاتی لە ساڵی (١٩٦٦- ١٩٧٠) دا، لە هەولێر بۆ خانەی مامۆستایانی سەرەتایی ( دار المعلمين الابتدائيه) گوازرامەوە.. پێداهەڵدان و ستایشی مامۆستای کۆچکردوو دکتۆر فەیسەل ئەلسامریشم قەت لەبیرناچێ، کاتێ بەرزترین نمرەم، لە بابەتە هزرییەکاندا، کە لەژێر دەستی پیرۆزی ئەودا دەمانخوێند، وەدەستهێنا. ئەو رایسپاردم کە نامەکەم لەبارەی بابەتێکی هزری بنووسم و ئاماژەشی بۆم کرد، لەبارەی مێژووی کورد بنووسم، ئەگەر بشتوانم، بابەتی "هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیان دا" دەستەبژێر بکەم ئەوەیان باشتر. منیش سێ و دووم لێ نەکرد و لە فەرمانی ئەو لام نەدا. ئەوەشی فەرموو، کە پاش بەدەستهێنانی ماجستێرەکەم و بۆ رۆژانی ئایندەش، لە خوێندنەوەی بابەتی هزری دانەبڕێم و بەهەند وەری بگرم. بەڵێ، ئەو چۆنی وت، منیش وەهام کردو لە ئامۆژگاری ئەو نەترازام.

لەگەڵ ئەو مامۆستا خاوەنفەزڵە و لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوو محەمەد تۆفیق حسێن، بەردەوام ڕاوڕێگەی ڕووناک، سەرومڕ پیشان دەداین . مامۆستای بەڕێز محەمەد تۆفیق حسین، پاشان بووە سەرپەرشتیاری نامەی دکتۆراکەم.

پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٨١ دا، لە هەمان کۆلێژ واتا لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا دکتۆراکەم وەرگرت و لە ساڵی ١٩٨٢ دا لە بەشی کوردییەوە گوازرامەوە بۆ بەشی مێژوو لە کۆلێژی یەکەمی پەروەردەی ( ابن رشد)، لەوێ وانەی - ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژووم دەوتەوە، هەرچەندیشە هەستم بە حەوانەوە دەکرد، کە بە تەنیا بووم بەدرێژایی ساڵی یەکەم یان لە قۆناغی ماجستێرەکەم دا، وەلێ ئەو بابەتە، بابەتێکی هزری نەبوو، بەڵکو زێتر لە بابەتی (ڕێبازی لێکۆڵینەوە) دەچوو، کە قوتابی لە کۆتایی قۆناغی زانکۆدا دەینووسێت یان لە بابەتێکی وەهادا دەینووسێت، کە پێوەندیی هەبێت بە پشکنین و گەڕان بە دوای دەستنووس و بەڵگەنامە و سەرچاوەی سەرەتایی و نیمچە سەرەتاییەکان و گۆڤارە ئەکادیمییەکان (خولا و خولەکانەوە). وێڕای ئەو بابەتانەی کە لە ئیش و کاری ئاوەزەوە نزیکن و لە توێی بەشەکاندا دەبینرێت، لەگەڵ بەشێکی تەواو لە لێکدانەوەی ڕووداوی مێژوویین.

ئەو کتێبەش، کە ئەو دەمە پشتی پێ دەبەسترا، هەر کتێبەکەی خوالێخوشبوو ماموستای میسری دکتۆر حەسەن عوسمان بوو.

بۆ ساڵی ئاینده کە هێشتا لە بەشی مێژوو بووم بۆ یەکەم جار، لە زانکۆی بەغدا و زانکۆکانی دیکەشدا بابەتی فەلسەفەی مێژوو بوو بە بابەتێك لەو بابەتە تازەیەی بیلێمەوە، منیش دەستبەجێ ڕەزامەندیی خۆم دەربڕی بەمەرجێ کارنامەی هەبێت، وەلێ سەرۆکی بەش داوای لێ کردم کە خۆم کارنامەی بۆ دابنێم. ڕاستیشت دەوێت. ئەم کارە لەسەرەتای هەشتاکاندا کارێکی ترسناك بوو، نەخاسمە ماموستایەکی کورد بابەتێکی (بۆمبڕێژکراو)ی وەك ئەو بابەتە بلێتەوە و ماموستاگەلێکی بەئەزموون و لە من گەورەتر تەکلیفیان لێ کردبن و نەیان گوتبێتەوە.

بەهەر حاڵ بەدرێژایی مانەوەم لەو بەشە لە ١٩٨٢ ەوە، تا ساڵی ١٩٩٤ گوتنەوەی ئەو بابەتەم خستە ئەستۆی خۆم و دانانی مەلزەمەیەکیشم لەئەستۆگرت ،دواتر کولێژەکە چاپی کرد. پاشان سەرۆکایەتیی بەش داوای لێ کردم، کتێبێك لە بارەی فەلسەفەی مێژووەوە دابنێم تا بۆ قوتابیانی بەشەکە ببێتە بەرنامە ، وێڕای ئەوەش کە من وەهام پێ باشتربوو، کتێبی "لە فەلسەفەی مێژوو دا" کە ماموستای دکتۆر ئەحمەد مەحموود سوبحی دایناوە، ئەو بکرێت بە بەرنامە و پشتی پێ ببەسترێت، چونکە تا ئێستا کتێبێکم نەدیوە

ناوەڕۆکەکەی وەکو ناوەڕۆکی کتێبەکەی دکتۆر سوبحی گونجاوبێت. ئەمە وێڕای ئەو کۆششانەی وانەبێژانی زانکۆی موسڵ بەخەرجیان دا، کە شایانی ڕێز و سوپاسن بەتایبەتیش مامۆستای دکتۆر هاشم ئەلمەلاح و دکتۆر غانم ئەلحفو دکتۆر عیمادەددین خەلیل.

بەر لەوەی سەرۆکایەتیی بەش داوا بکات، توێژینەوەیەکم بلاّوکردەوە بیرۆکەی ئیبن خەلدونم تێدا بەبیرۆکەی ڤیکۆ لە (بەدوایەکداهاتنی خولا و خول)دا (التعاقب الدوری) بەراورد کرد و لە گۆڤاری المجله العربیه للعلوم الانسانیه)دا لە ساڵی ١٩٨٥ دا بلاّوکرایەوە، ئەو گۆڤارەی کە کۆلیژی ئادابی زانکۆی کوەیت دەری کردووە. پاشان کتێبەکەم بەپێی بەرنامەی داواکراو دانا و ڕەشنووسەکەیم دا بە لیژنەی سەلامەتی هزر( السلامه الفکریه)، وەلێ لیژنەی ناوبراو ناوەڕۆکی کتێبەکەی هەندەی لەم دێر و ئەو دێر لێ لابرد، هەر بە جارێ ڕێچکەی هزر و بیری تێدا نەهێشتبوو، نەشم ویست دووبارە بیری لێ بکەمەوە و بەهزر و بیرەکانم دا بچمەوە، نەخاسمە (شارەزاکانیش) وەك پاشان بۆم دەرکەوت هیچ پەیوەندییەکیان بە بابەتی هزر و فەلسەفەی مێژووەوە نییە، تەنیا ئەوەندەبوو، ئەرکی پۆلیسیی سەرشانی خۆیان، زۆر بە دڵنیاییەوە بەجێ هێنابوو.

ئیدی منیش بڕیارم دا کتێبەکە بەش بەش بکەم و بیکەم بە بابەتگەلێك و هەر بابەتێکی بەجیا لە گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ) دا بلاّوبکەمەوە،بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا کە خۆم ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بووم، چونکە گۆڤارەکە بوو بوو بە گۆڤارێکی ئەکادیمی، وەلێ ئەسڵی کتێبەکە، بە عەرەبی نووسیبووم، هەروا بە تێکەڵ و پێکەڵی مایەوەو هەتا ئێستاش هەرماوەتەوە.

لەبەر ئەوە بڕیارم دا بەغدا جێ بهێڵم و بڕۆم لە شەوێکی تاریك و ئەنگوستەچاوی شەستەبارانی زستانی ١٩٩٤ دا بە خاوخێزانەوە کەوتینەڕێ و بەغدام جێهێشت. ئەوجا لە مەنزڵگای تازەمدا دەستم کرد بە وتنەوەی هەردوو بابەتی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوو (منهج البحث التاریخی) و فەلسەفەی مێژوو، هیچ بەلامەوە سەیر نەبوو، کتوپڕیش نەبوو کە دیتم ئەوا کتێبی بابەتی یەکەم کە - لە سەرەوە باسم کرد - خراوەتە ناو ئەو کتێبانەی کە بوونەتە بەرنامەی خوێندن لە زانکۆی سەلاّحەدین لە هەولێر و کاتی خۆی لە ساڵی ١٩٩٢ دا (دارالحکمه)ی سەر بە وەزارەتی فێرکردنی

بالاّ و توێژینەوەی زانستیی زانکۆی بەغدا چاپی کردبوو، بەلاّم سەیرەکە لەوەدابوو کاتیّ کۆپیگەلێکم لەو توێژینەوانە کە لە گۆڤاری کوردیی ناوبراودا بلاّوکردبوونەوە. بە دەست قوتابییانی قۆناغی سێیەمی زانکۆوە دیت، کە کاتی خۆی لە بەغدا بە برای نووسەر (عەبدولڕەزاق بیمار) م سپاردبوون لە عەرەبییەوە بۆم بکات بە کوردی ئیدی بڕیارم دا ئەو توێژینەوانە بکەم بە کتێبێك، نەخاسمە لەو کاتەی لە سالّی ٢٠٠١ دا لە لیبیا گەڕامەوە، خەتایەکەش خەتای خۆم بوو، چونکە نەدەبوو بڕوا بە کەسێك بکەم هەست بە بەرپرسیاری نەکات و بە بیانووی دووبارە دارشتنەوەی زمانی توێژینەکەوە بۆ ئەوەی لەگەلّ زمانی توێژینەوەی کوردیدا بگونجێت (!) ئاوەها و هەتا ئێستاش لە چاپدانی کتێبەکەی دواخست، ئەو دواخستنەش بێگومان بووە هۆی سەرسوڕمان و پرسیاری پێوەندیداران، نەخاسمە قوتابییەکان، بەراستی خۆیشم دۆش دامام و نەشمویست بۆ خۆم بیکەم بە کوردی و دەمویست کوردییەکەی لەوەی خۆم پاراوتربێت، نەخاسمە بابەتەکەش تایبەت بوو بە بیرۆکەکانی فەلسەفەی مێژوو، واتا بابەتگەلی هزری بوون و گۆڕینیشیان بۆ سەر زمانی کوردی، یان پێداچوونەوەی دەقەکان وردەکارییەکی تەواویان دەویست بۆ ئەوەی قوتابیان بە ئاسانی لە هزرەکانی بگەن. جا لەبەر ئەو هۆیانەی کە ئاماژەم پیّ دان، داوام لە بەڕێز مامۆستا ( عوسمان عەلی قادر) کرد، ئەم بابەتەشم بۆ بکات بە کوردی، چونکە کاك عوسمان پێشتر هەندیّ نووسینی من و نامەی ماجستێرەکەم و بابەتی دکتۆراکەشی کردبوو بە کوردی.

کاتێکیش کاك (محیەدێن تەها محەمەد) پێی زانی چاپکردنی کتێبەکە ئەو هەموو سالّە دواکەوتووە، دەستوبرد هەوالّەی برد بۆ دەزگای موکریانی، بۆ چاپکردنی دەزگای ناوبراویش رەشنووسەکانی نارد بۆ بەشی فەلسەفە بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر بدات و لەگەلّ چاپەمەنییەکانی لای خۆیدا، چاپی بکات. مامۆستای بەڕێز ڕێبوار سیوەیلیش پێی خۆش بوو، وەك ئەرکێکی سەرشانی خۆی، بۆ پڕکردنەوەی بەرنامەکانی بەشی فەلسەفە و بەشی مێژوو، چاپی بکات. سەرباری ئەوەش داوای لە کاك (ئازاد قەزاز) کرد بابەتیّ کە تایبەتە بە ئیبن خەلدون و ڤیکۆ بۆ بکات بە کوردی.

**سوپاسی هەموویان دەکەم، منەتباریانم**

**نووسەر**

دەڵێن سەرسامی پرسیاری بە دوا دێت، واتا سەرسامی پرسیار دروست دەکات، ئەو قسەیەش راستە. دەشڵێن پێداویستی وای لە ئادەمیزاد کرد، کە ناچار بۆ چارەسەرکردن بگەڕێت، ئەوەش دیسان هەر راست دەڵێن. یەکێك لەو پێداویستیانەی ئادەمیزاد ئەوەبوو، کە لە ترس بپارێزرێت. مەسەلەیەکی کوردیی خۆمان هەیە دەڵێت:" لەسەرما هەتیو مەیلی هەتاو دەکات" واتا ئەگەر بێ باوك شرۆڵە و سەرمای نەبێت، ناچێتە بەر هەتاو خۆی گەرم بکاتەوە.

سەرسامی لە شتێك یان لە رووداوویالە دیاردەیەك. ئادەمیزادی ناچارکردووە، هەوڵ بدات نهێنیی ئەو شتە یان ئەو دیاردەیە بدۆزێتەوە و هەوەسی مەعریفی لە مێشکی ناوە، لەبەرئەوە ئادەمیزاد ئەو مەعریفانەی دۆزیوەتەوە، کە هەموومان دەیزانین.

پێداویستییەکانی ئادەمیزاد زۆرتربوون و زیادیان کرد، وەلێ کاتێ ئادەمیزاد نەیدەتوانی وەلامی هەموو خەیاڵ و پرسیارەکانی خۆی بداتەوە، تا پرسیارەکان دەهات زۆرتر و ئاڵۆزتر دەبوون، ئەوجا ئۆبالّی هەموو ئەو رووداوانەی هاویشتە سەر چەند هێزێکی خارق کە هێزی بەسەریاندا ناشکێت و دەکەونە دەرەوەی هێز و فامی ئادەمیزاد. ئالێرەوە تۆی بیروباوەڕی هێزی لاوێتیی بەرپرس و خولقێنەر چەکەرەی کرد. ئیدی بڕوای ئایینی جۆربە جۆر و جیاواز گەشەی سەند و بەپێی ژینگەی جۆرا و جۆر و بەرژەوەندی و تەبیعەتی ئادەمیزاد ململانێی ناویان گەرم بوو ئەوە یەکەم هەوڵی ئادەمیزاد بوو بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکانی خۆی. ئیدی هەر وەلامێکی پێنەدرابایەوە ئۆبالّی دەخستە سەر هێزی خارق و نادیار " میتافیزێق" ئادەمیزاد ئەو بێ مەعریفەتییە و ئەو حەپەساوییەی خۆی کاتێك نهێنی یان بوونەوەر یان جموجووڵی بوونەوەری سەر زەوی یان لە ئاسمان لەناو ئاودا دەبینن یان ئەو قسانەی دەهاتنە گوێی، ئەوانە هەمووی پاڵیان بە ئادەمیزادەوە دەنا کە بە هەموو هێز و توانای خۆی لاسایی ئەو شێوە و شەکل و دەنگانە بکاتەوە. بەتایبەتیش دوای ئەوەی کە زمانی پژاو، دەستی بە

قسان کرد و شتی دەناسییەوە، هەندێ ئامێری خۆی دروست دەکرد و نیشانەی دەکرد و ناوی لێ دەنا. بەو جۆرە سەرسامی و حەپەساویی خۆی بەشێوازی جوان جوان دەربڕی. ئیدی هونەری جۆر بە جۆری دیتراو و بیستراو پەیدابوون و هەنگاوی بەدڵ و بەسوودی بەدودا هات بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکان لە دەرەوەی ئایین و لە دەرەوەی هونەر، تا وای لێ هات ئینجا بە دوای پێوەندیی نێوان مەعریفەت و ئامانجە جەوهەرییەکانی عەقڵ دا گەڕاو فەلسەفە هاتەگۆڕێ.

هەروەها لەئەنجامی ئەم سەرسامییەدا فەلسەفەی لێکەوتەوە وەك دایك ناودەبرێت لەم بارەوە ئەرستۆ دەڵێت: ئادەمیزاد دەبیینی کە پێویستە بە جۆرێکی تازە بیربکاتەوە و بگاتە قووڵایی مەعریفەی نهێنیی هەموو شتێك لە دەرەوەی مەعریفە رابردووەکان، بیرکردنەوەیەکی قووڵی ئەوتۆ کە توانستی ئادەمیزادی بۆ هەستکردن و دۆزینەوەی نوێ، لەناوبرد.

فەلسەفە وەها پێناسە کرا کە هەوڵێکی جددی و بەدڵە، بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت یان بۆ گەڕان بە دوای حەقیقەتدا، بەلاَم حەقیقەتی چی؟ حەقیقەتی دیاردە سروشتییەکان. حەقیقەتی شتەکانی دەوروپشتی، حەقیقەتی دەرەوەی هەست و مەداریکی و گەڕان بە دوای حەقیقەتدا، بە دوای چی بوونی ئادەمیزاد و چارەنووسی ئادەمیزاد دا. راستیشت دەوێت، گەیشتنی ئادەمیزاد بە حەقیقەت، ئەوە لە خودی خۆیدا زانستە. زانستەکانیش بریتین لە کۆمەڵێ حەقیقەت و قانوون . لەبەر ئەوە وتراوە کە فەلسەفە بریتییە لە هەوڵدانێك بۆ گەیشتن بە حەقیقەت واتا بۆ گەیشتن بە زانست، نەك خودی حەقیقەت، واتا، فەلسەفە بەم مانایە رێگاخۆشکەرێك بوو بۆ پەیدابوونی زانست، بەڵکو پێشیان دەگوت "کۆی زانستەکان" یان "زانستی زانستەکان" the science of the sciences لەبەر ئەوە دەبینین کە زانستەکان لە هەناوی فەلسەفەوە کەوتوونەتەوە (لەدایکبوون). ئەگەر ئەو مەسەلانەی ناکۆکییان لەسەرە، حەقیقەتێکی نەگۆڕ بن، ئەوە لە چوارچێوەی فەلسەفە دەردەچێت و دەچێتە چوارچێوەی زانستەوە، جا لەم رێگەیە زانستەکان لە فەلسەفە جیابوونەوە[1]

---

١- د. عبدالرحمن بدوی : مدخل جديد الى الفلسفة، وكالة المطبوعات، الكويت ، دار القلم، بيروت ١٩٧٩ ص: ٨.

سەرباری ئەم لێکجابوونەوەیەش، هێشتا زانست و فەلسەفە پێوەندییەکی سخی هاوبەشیان لە نێواندا هەر هەیە، ئەمە بوو بە کورتی جۆرەکانی مەعریفەی هزری — عەقلی — مرۆڤایەتی.

هەر مەعریفەیەك دەبێت لە چوارچێوەی ئەم جۆرانەدا بێت. واتا هەر مەعریفەیەکی بڕوای ئایینی یان هەر مەعریفەیەکی هونەری نووسین یان بیستەنی (سمعی) یان فەلسەفی یان زانستی، دەبێت لە چوارچێوەی یەك لەو جۆرانەدا بێت.

ئەوەی - بێگومان - ئێمە بە گرنگی دادەنێین مەعریفەی مێژووە، ئایا مەعریفەی مێژوو لە چوارچێوەی کام لەو جۆرانەی مەعریفەدا دادەنرێت. جا بەر لەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە، پێویستە کەمێ بە کورتی باسی مێژوو بکەین و بزانین مێژوو مانا و مەبەستی چییە؟

## ماناو زاراوەی مێژوو:

لە زمانی عەرەبیدا واژەی (التاریخ) مەبەستی لە ئامانج و مادەی شتێکە، واتا ئەو شتە ئامانجی چییە ؟ چەندیش دەخایەنێت تا دەگاتە ئەو ئامانجە؟ لەبەرئەوەی وتویانە "مێژوو لەسەر کتێبەکە دابنێ" واتا رێکەوتەکەی دیاربکە. یان مێژووی ئەو رووداوە دابنێ ،کاتەکەی دەستنیشان بکە. مێژووی شت، ئامانج و کاتی شتەکە، واتا درێژایی کاتی شتەکە نیشان دەدات، جا لەو ماوەیەدا هەر چییەك رووی دابێت یان نەدابێت. سەخاویی مێژوونووس خەسڵەتەکانی مێژوو باس دەکات، دەڵێت:" هونەرێکە بە دوای کات و وەختی زەمانەدا دەگەڕێت، بابەتەکەشی باسی ئادەمیزاد و باسی ئەو وەختەیە، باسی ورد و درشتی ئەحواڵی ئادەمیزاد لە ژێر لەوحەی بەسەرهاتی مرۆڤ و رەوشی زەمانەدا دەخاتە بەرچاو[٢] .

ئیبن خەلدونیش رایگەیاند، کە مێژوو یەکێکە لەو هونەرانەی کە میللەتان و نەوەکانیان دەستاودەستی دەکەن و پیادە و سوارەیان بەلای خۆیدا رادەکێشێت، بە ناسینی خەڵکی رەشۆکی

---

٢ السخاوی: الاعلان والتوبیخ لمن ذم التاریخ، طبعة القاهرة، ١٣٤٩هـ، ص٧، بۆ زیاتر زانین لەسەر واژەی مێژوو، بنۆرە: کتێبەکەی خۆم:" م منهج البحث التاریخی " ،بغداد، دار الحکمة للطباعة والنشر، ١٩٩٢، ص٩، ومابعدها.

(السوقه) و بیٚ ئاوەزان شەرەفمەند دەبێت و مەلیك و سەرۆکان کێبڕکێی لەسەردەکەن و داناو نادان وەك یەك تێی دەگەن ئیبن خەلدون ئینجا دەڵێت: مێژوو بە رواڵەت تەنیا خەبەرگەلی زەمانە و دەوڵەتان باس دەکات و سەدەکانی کۆن دەگێڕێتەوە، باسی کاروباری دنیا دەکات ،کە چۆن چۆنی لە حاڵەتێکەوە گۆڕاوە بۆ حاڵەتێکی دی و دەوڵەتانیش بە هەوەسی خۆیان تەراتێنیٚ تێدا دەکەن و زەوییان ئاوەدان کردووتەوە و خۆشیان بەرەو نەمان دەچن. لە ناوەڕۆکی مێژوودا راوبۆچوون و ساغکردنەوە هەیە، لێکدانەوەی وردی بوونەوەر و بیروباوەر هەیە، زانینی ورد لەبارەی چۆنێتی رووداوەکان و هۆکارەکانیان هەیە، لەبەر ئەوە مێژوو لە عەقڵ و حیکمەتدا رەسەنە و کۆنە، ئەوە دەهێنێت کە شایان ببێت بەیەکێك لە زانستەکان - ٣ پاشان لەژێر ناونیشانی "فضل علم التاریخ" دا واتا لەژێر ناونیشانی " سوودی زانستی مێژوو" دا پێناسەی دەکات بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لە ماناکانی پێشەوەی باسمان کرد هیچ فەرقی نییە ٤.

بەر لە ئیبن خەلدونیش مەسعودی رایگەیاند، کە مێژوو زانستێکە لە خەبەرگەلێك دروست کراوە ٥ جگە لەویش تەبەری پێناسەی مێژوو دەکات و دەڵێت: مێژوو هونەرێکە بە دوای رووداوگەلی زەمانەدا دەگەڕێت ٦. باسی گوزەرانی تایەفەکان و وڵات و رێورەسم و نەریت و سەنعەت و باو و باپیرو مردنیان دەکات٧، مێژوو باسی رووداوگەلی بەناوبانگی زەمانی زووی تێدایە بە نموونە: وەك لافاوی کاولکاریی بیٚ ئامان و بوومەلەرزەی وێرانکار و قڕکەر و پەتای کوشندە و وشکەساڵی و بیٚ بارانیی قڕکەر، جگە

---

٣- ابن خلدون : المقدمة ، مكتبة المدرسة و دار الكتاب اللبناني للطباعة والنشر، بيروت ط ٢، لسنة ١٩٧٩، المجلد الاول، ص٢-٣.

٤- المصدر نفسه: ص:١٢- ١٣.

٥ - مروج الذهب ومعادن الجوهر: تحقيق بيروت، ١٩٦٥، ج٣، ص١٣٥.

٦- الطبري ، تاريخ الرسل والملوك، طبعة دى كوية، ليدن ، هولندا، ١٨٧٩، ج١، ص٦.

٧- طاش كبري زادة، مفتاح السعادة ومصباح السيادة، نشر دار الكتب الحديثة، مطبعة الاستقلال الكبري، القاهرة، ١٩٦٩، ج١، ص٥١.

لەوانە ناوی مەلیکەکان و هەرێمەکان و ژمارەیان و تەمەنیان و ماوەی حوکمکردنیان و نەمانی دەوڵەتەکانیان.. هەمووی تێدایە ٨.

لە زمانەکانی ئەوروپاشدا، وشەی ئینگلیزیی (History)مێژوو لە وشەی گریکی هستۆریا (Historie)واتا فێربوون وەرگیراوە، جۆرە هونەرێکی نووسینە، مێژوونووسی بەناوبانگی گریك هیرۆدۆت (Herodorus ، ٤٨٠ پ. ز٤٢٥ بەکاری هێنا ٩ بەمانای گێڕانەوەی رووداوگەلی کۆمەڵیٚ دیاردەی سروشتی — وەك ئەرستۆتالیس پێناسەی دەکات — یان، وشەکە لە رەگی زمانی گریکدا بەمانای دیتن هاتووە. چونکە وشەی (Histor) بەمانای دیتن و سەیرکردن هاتووە، یان بە مانای قوڵبوونەوە لە پێناوی مەعریفەدا، بەکارهاتووە ١٠ بەتێپەڕبوونی رۆژگار وشەی سنتیا(scientia) ی لاتینی، یان (science) ی ئینگلیزی بۆ گێڕانەوەی رێکوپێك، بەلاٚم بەبیٚ تەرتیبی زەمەنی — بۆ دەربڕینی مەعریفەی دیاردە سروشتییەکان بەکاردەهێنرا، بەلاٚم وشەی (History) تایبەت بوو بە گێڕانەوەی رووداوە کۆمەلاٚیەتییەکانی ئادەمیزاد بە شێوەیەکی تەرتیبی زەمەنی، واتا بە وتنی مێژووی رووداوەکە.

جۆزێف هۆرس دەڵێت : وشەی مێژوو لە زمانی فەرەنسیدا دوو مانای هەیە، هەردووکیان بە باشی لێك جیاناکرێنەوە، لە لایەکەوە مانای مێژوو بریتییە لە کۆی ئەو رووداوانەی کە ژیانی ئادەمیزاد دەردەخەن، ئەو رووداوانە ئەمڕۆش دەردەکەون و سبەینێش هەر دەردەکەون، لە لایەکی ترەوە مانای ئەوەیە کە پێی بزانین و مەعریفەمان لە بارەیانەوە هەبێت. وێڕای ئەوەش کە ئەم مانایەی پاش مانای دووەم هاتووە، بەلاٚم هەر مانای دووەم خۆی بەسەر خەڵکدا سەپاندووە و چووەتە ناو زمانەکانیانەوە. گرنگ لێرەدا ئەوەیە، هۆرس دەڵێت: ئەو رێگەیەیە کە مێژوونووس پێیدا دەڕوات و لەوحەیەك بەپێی مەعریفەی خۆی، بەگوێرەی زنجیرەی رووداوەکانی ئادەمیزاد بەدرێژایی زەمەن و زۆر بەراستی و بەمەرجێکیش

---

٨- ابن فريفون، جوامع العلوم، ص٥٣٩.

٩- هنری جونسون، تدريس التاريخ، ترجمة: ابو الفتوح رضوان، طبعة دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٦٥ ،ص٤.

١٠- د. اسحق عبيد، معرفة الماضي من هيرودوت الى توييني ، القاهرة، ١٩٨١، ص١.

سووربێت لەسەر دروستی قەومانەکانیان رەسم دەکات ١١. هەروەها مانای مێژوو ئەوەیە ئەو رووداوانەی ،کە لە مەودوا روودەدەن پێوەندییان بە رووداوەکانی رابردووەوە هەیە، ئەمەش بناغەی بۆچوونی تازەی موستەقبەلییە بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوەی مێژوودا، کە ناونراوە (Eutureology)١٢ لە پێناسەیەکی زۆرتر بلاّودا، وشەی مێژوو بە رابوردنی زەمەن ، ماناکەی بووە بە "رابردووی ئادەمیزاد". لە زمانی ئەڵمانیشدا واژەی (Geschichte) کە لە فیعلی (Geschehen) وەرگیراوە بە مانای روودەدات (دەقەومێ) دێت، چونکە وشەی مێژوو لەم زمانەدا بە مانای" ئەو شتەی قەوما" دێت ١٣.

بەلاّم مانای واژەی مێژوو لەلای موسوڵمانان مانای وشەی (History) نابەخشێ، کە لە لای ئەوروپاییەکاندا باوە، چونکە مەسەلەی فەلسەفە لە بیرۆکەی مێژوودا یەکێکە لە پێشکەوتنەکانی هزری نوێ، لەبەر ئەوە لەبارەی مانای مێژوو لە لای مێژوونووسانی ئیسلام بە تەواوەتی جیاوازە. هەرچەندیشە پێوەندییەکی ئامێری لەنێوان هەردوو دەستەواژەکەدا هەیە ١٤.

لێرەدا باشتر وایە ئاماژە بەو تێکەڵ و پێکەڵییە بدەین، کە لە زەمانەدا لە بارەی واژەی مێژوو پەیدابووە، جاری وەها هەیە بە رابردووی خودی ئادەمیزاد دەگوترێت، جاری وەهاش هەیە بەو کۆششە عەقڵییە دەگوترێت، کە بۆ مەعریفەی ئەو رابردووە و گێڕانەوەی خەبەرەکانی دەگوترێت، یان بە زانستی بابەتەکە دەگوترێت، ولش —

---

١١- جوزيف هورس: قيمته التاريخ، ترجمة: نسيم نصر، منشورات عويدات، بيروت، ١٩٧٤،ص١٠- ١١.

١٢- د. رأفت غنيمى الشيخ: فلسفة التأريخ، دار الثقافة والنشر والتوزيع ، القاهرة، ١٩٨٨، ص ٧.

١٣- لويس جوتشلك، كيف نفهم التأريخ، ترجمة: د. عائدة سليمان عارف و د. احمد مصطفى ابو حاكمة، دار الكاتب العربي، بيروت ١٩٦٦، ص:٥٥- ٥٦.

١٤- فرانز روزنشال — علم التأريخ عند المسلمين، ترجمة: د. صالح احمد العلي ، بيروت، مؤسسة الرسالة ، ط ٢، ١٩٨٣ ص٢٥.

- و. هــ. وولَش: مدخل الفلسفة التاريخ ، ترجمة: احمد حمدى محمود، مؤسسة سجل العرب ،القاهرة ١٩٦٢، ص ١٥.

دەڵێت: وشەی مێژوو هێشتا نادیارەو نەزانراوە، جاری وەها دەبێت بەسەرجەم ئیشەکانی رابردووی ئادەمیزاد دەوترێت، جاری وەهاش دەبێت، بەو چیرۆکە دەوترێت کە لەسەر ئەو ئیشانە دامەزراوە.

وا دیارە زەینی ئادەمیزاد، بەبێ ئەنقەست فەرق و جیاوازی لە نێوان هەردووکیاندا ناکات. ئێمە هەمان ئەم تێکەڵ و پێکەڵییەمان لە زمانە بیانییەکاندا دیت. بەنموونە، واژەی فەرەنسی Histoire و واژەی ئینگلیزی History و واژەی ئەڵمانی Geschichte هەموویان بۆ یەکسانی بۆ هەردوو ماناکە بەکاردەهێنرێت. زۆرجاران مەبەست لە هەریەکەیان (رووداوەکانی رابردوودا)، جارجاریش مەبەست (خەبەرەکانی رووداوەکانە، یان زانستی وەدیهێنانیان)ە. هەندێ لە پێوەندیدارانی رۆژاوا، بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دا ئەم دوو مانایە لێك جیابکەنەوە. بە نموونە هەندێ فەرەنسایی ناویان لێ نا (Histoire) واتا بە پیتی (H) بۆ رابردوو، و (Histoire) واتا بەپیتی (h) ی بچکۆڵە بۆ زانستەکە، واتا (هزری مێژووکرد و، مەعریفەی مێژووکرد). هەندێ لە ئەڵمانەکانیش (Geschichte) یان بۆ مانای یەکەم و (Histoire) یان بۆ مانای دووەم هێشتەوە.

ئەم جیاوازییەی مانای دوو وشەکە، وای لە فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانیا هیگڵ (Hegel)(١٧٧٠- ١٨٣١)کرد، کە بگەڕێتەوە سەر لاتینەکە و هەردوو دەستەواژەی (Regestae) و (Historia rerum gestarum) لێك جیابکاتەوە. لە کاتێکدا کە هیگڵ گوتی: ئەڵمانەکان بە شێوەیەکی ئاسایی (Historik) بە مانای کۆکردنەوەی خەبەر و رووداو یان هونەری مێژوو و، (Geschichte) بەمانای مێژوو کە ڕاو بۆچوونی ئاودامان لە مانا و ئامانجیدا هەبێت، لێك جیادەکەنەوە ١٥.

---

١٥- هيجل، محاضرات في فلسفة التاريخ ، ترجمة: امام عبدالفتاح امام ، طبعة دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة ، ١٩٨٠، ج١، ص١٧٢.

بەلاّم عادەتی خۆی چۆن بوو، هەروەها بەزاڵی مایەوەو نەگۆڕاو، ئەم تێکەڵ و پێکەڵییە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە، دیارە ئەم هەستە لە ئادەمیزاد دا قووڵەو بە تەواوی مەعریفەی رابردوو، بە خودی رابردووەوە گرێ دەدات. ئەم هەستەش بە تایبەتی لەو کاتانەدا بەهێز دەبێت، کە ئادەمیزاد هەستی بە رابردووی خۆی زیاد دەکات و دەکەوێتە ژێر کاریگەریی رابردووی خۆیەوە١٦.

مانای زاراوەی مێژوو، لە لایەنی زمانەوانییەوە، لە هەندێ زمانی ناسراودا باس کرد، ئێستا دەمانەوێت وەك مانایەکی مەعریفی واتا وەك زاراوە پێناسەی بکەین، بۆ ئەوەی ڕاوبۆچوونی هەندێك لە پێوەندیدارانیش بزانین، مێژوو پێناسەکرا کە: دەفری ئەزموونی ئادەمیزادە و زانستی تایبەتی کۆششی ئادەمیزادە کە لە زەمەنی رابردوویدا بە خەرجی داوە، یان کۆششێکە بۆ وەلاّمدانەوەی ئەو پرسیارانەی پێوەندییان بەو کۆششانەی رابردووەو هەیە، تا کۆششی دوارۆژی لێ هەڵێنجێ ١٧.

مێژوو ڕووداوگەلی کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەکان هەڵدەداتەوەو دەپیشکنێت و سەرنجی ژیانی شاردراوە و فکرو هزری یەك بەیەکیان دەدات تا بزانێت پێوەندیی ئەو هزرانە بە گوزەرانیانەوە چەندە، پاشان پێوەندیی ئەو ژیان و فکر و هزرانە بە رەوشی ئادەمیزادەوە و بە کۆششی بەردەوامی ئادەمیزادەوە چییە؟! کە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی رۆشنبیری و ئابووری و زانستی و هزریی خۆی تێدەکۆشێ، مێژوو دەیەوێت بزانێت، تا چەند رابردووی کۆمەڵگە یان رابردووی میللەتان پێوەندیی بە ژیانی ئەمرۆیانەوە هەیە؟! ژیانی ئەمرۆیان چ پێوەندییەکی بە ژیانی دوارۆژیانەوە هەیە.

---

١٦- د. رجاء ريان، مدخل لدراسة التأريخ ، دار ابن رشد للنشر والتوزيع عمان ، الاردن، ١٩٨٦، ص٣ . د. قسطنطين زريف ، نحن و التأيخ ، دار العلم للملايين ، بيروت ١٩٨١ ، ص ٥ ص ١٤.

١٧- ويدجرى ، التأريخ وكيف يفسرونه من كونفوشيوس الى توينبي ، ترجمة : عبدالعزيز توفيق جاويد، طبعة الهيئة المصرية ، القاهرة ١٩٧٢، ص ج المقدمة .

کۆلنجوود( Collingwood ۱۸۸۹- ۱۹٤۳) رایگەیاند، کە مانای مێژوو لەو رابردووەدایە کە مێژوونووس لی دەکۆڵێتەوە، ئەو رابردووەش مردوو نییە، زیندووە. بەلاّم ڕابردووە، بەهەرحاڵ تا ئێستاش هەر ماوەو دەژی. ئەی، (بێنێدیتتۆ کرۆشە – Benedetto Croce ۱۸٦٦- ۱۹٥۲ ) نەیگوتووە کە: هەموو مێژوویەکی راستەقینە، مێژووی هاوچەرخە، واتا مێژووی ئەمڕۆیە[18]. خۆ ئەگەر مێژوونووس، کاری مێژوویی یان ڕووداوی مێژوویی بە مردوو دابنێت، ئەوا ئەو کاتە ناتوانێت لەو بیر و هزرانە بگات کە ڕووداوەکەیان هێناوەتە ئاراوە. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە مێژوو بە گشتی مێژووی هزرە [19].

ئەمەش مانای وایە کە ژیان لەسەر ئەم گۆی زەمینە چەندە ناو و ناوکی فراوانە، مێژوویش هەندەی ژیان بەرفراوانە و رابردووی زۆر کۆن دەگرێتەوە و ئەمڕۆش دەگرێتەوە، بەڵکو لە هەندێ مانا و لایەندا ئایندەش دەگرێتەوە " چونکە ژیان، یەکەیەکی تەواوکارە و ئەو هەڵوێستانەی بەرامبەر بە ڕووداوی رابردوو وەردەگیرێت، بیروبڕوای ئێستا و ئاواتی ئایندە کاریان تێ دەکات، ئەو ئاواتانەش، دیسان، دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو بیروبڕوایانەوە [20]"

هەروەها مێژوو بەو زانستە لە قەڵەم دراوە، کە لە باس وخواسی ڕووداوەکان و دەستکەوتەکان و میراتی ماددی و فکری دەکۆڵێتەوە، هەر لە سەرەتای هزری ئەفسانە و هزری ئاییینەوە پێداوەرە و بەدەنگوباسی ڕووداوەکان دا برۆ و ئەوانەش کە عەقڵی مرۆڤ دایمەزراندووەو دەستی مرۆڤ دروستی کردووە هەروەها لە کاروباری کۆمەڵەکان و

---

۱۸ _جوزف هورس، مصدر سابق ، ص۱۹.

۱۹ _ادواردکار : ماهو التأريخ ، ترجمة احمد حمدي محمود ، مؤسسة سجل العرب. مطبعة الجيلانى ، القاهرة ۱۹٦۲، ص۲۹.

۲۰- د. زريق : المصدر السابق، ص٥٠.

پێوەندی و بزووتن و چالاکی و بەربوومی ڕابردوویان دەکۆڵێتەوەو زەمەن و جێگەکانیشیان نیشان دەدات.

وای بە باش دەزانین کە ڕای هەندێ لە پێوەندیداران لەبارەی مێژوو باس بکەین و بشزانین چۆن چۆنی پێناسەی دەکەن.

کولنجوود پێناسەی مێژوو دەکات و دەڵێت: تۆمار (سجل) یان دەفتەری پێشکەوتنی ئادەمیزادە و سجلی تەواوکاریی مەعریفە و زیادبوونی عەقڵە.

فەیلەسووفی فەڕەنسایش گ.مۆند (G.Mounod) ئامانجی بەرزی مێژوو پێناسە دەکات و دەڵێت: مێژوو سەرلەنوێ نیشاندانەوەی ژیانی ڕابردووی ئادەمیزادە بەبێ دەسکاری هەروەکو خۆی. هەروەها دووبارە ڕەسمکردنەوەی دیاردەکانی چالاکیی هزرییە بە هەموو گۆڕان و پێشکەوتن و قۆناغ بە قۆناغ و هاوڕێژەبوونیانەوە. ئەمەش هەر لە ڕای مێژوونووسی گەورەی ئەڵمانی لیۆپۆلد ڤۆن ڕانکە ( Leopold von Ranke) دەچێت، کە دەیگوت: ئامانجی مێژوو ئەوەیە کە بە تەواوی شێوەی ڕووداوی ڕابردوو بخاتە بەرچاو ٢١. ئەم قسەیەش، لە سەدەی ڕابردوودا ناوبانگی دەرکرد، تا وای لێهات لە لای مێژوونووسان بووە نوشتە و دروشمی پیرۆز.

هەرچی مێژوونووسی ئەمەریکی — هنری جۆنسۆن —ە، ئەوە، ئەو لە پێشەنگی کتێبەکەی خۆیدا "وتنەوەی مێژوو" دەڵێت: مێژووی پڕ بەمەعنا هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە ڕابردوون، لە ڕابردوودا روویان داوە، مێژوو بریتییە بە ڕابردوو، چاك یان خراپ٢٢.

---

٢١- ایمری نف : المؤرخون وروح الشعر. ترجمة: د. توفيق اسكندر ، مكتبة الانگلو، مصرية القاهرة ١٩٦١، ص: ٢٤٠ ، و ارنست كاسيور في المعرفة التاريخية ، ترجمة: احمد حمدى محمود ، دار النهضة العربية ، القاهرة ، ١٩٦٢، ص٢٠

٢٢- المصدر المذكور، ص١.

مێژوونووسی فەرەنسایش هـ.مارۆ (H.Marrou) دەڵێت: مێژوو، زانینی ڕابردووی ئادەمیزادە، ڕابردووی کۆنی ئادەمیزادە لە ڕێگەی ئادەمیزادی ئەم زەمانەوە، لە ڕێگەی ئادەمیزادی ئایندەوە، کە خودی خۆی دەبێت لە مێژوو- ٢٣. هەروەها مێژوونووسی ئینگلیزی (و. هـ. ولش- W.H.Walsh) دەڵێت: هەموومان لەسەر ئەوە ڕێککەوتووین، کە ئامانجی یەکەمی خوێندنی مێژوو رابردووی ئادەمیزادە٢٤-.

## ئایا مێژوو چ جۆرە مەعریفەیەکە ؟

پرسیاری لێکۆڵینەوەکە، ئاشکرایە دەڵێت: ئایا مێژوو چ جۆرە مەعریفەیەکە؟ ئایا یەکێکە لە مەعریفەیەتی میتافیزیقی (واتا، لە مەعریفەت (زانینی غەیب و ئایین)؟ یان هونەرێکە لە هونەرەکانی نووسین، یان زانستێکە لە زانستەکان؟ یان فەلسەفەیەکە لە فەلسەفەکان؟

پێشەکی، دەڵێین ئەم هەموو پرسیارانە لەسەر سروشتی مەعریفەی مێژوو، هەروەها بەوەڵامهێنانی مێژوو، لەبەردەمی دادگای ئەم هەموو مەعریفەی ئادەمیزاددا، خودی پرسیارەکەی وەها لێکردووە، کە ببێتە شتێکی ڕەواو مەشروع. ئایا دەشێت مەبەستی لە مەعریفەیەك بێت لە دەرەوەی ئەو مەعریفانەی کە باس کراون؟

وادیارە، وەڵامی ئەم پرسیارە بەئەرێ (الایجاب) بێت واتا. دەڵێ. ئەگەر مێژوو یەکێك بێت، لەو مەعریفانە، ئەوا مەسەلەکە دەبڕێتەوە و یەکلادەکرێتەوەو پرسیار تەواو دەبێت کە ئەمە بیستو چوار سەدەیە هەر دەکرێت و دەکرێتەوە. واتا لەو ڕۆژەوەی کە ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دەنووسرێنەوە، ئەم پرسیارە هەر بەردەوامە ئادەمیزاد پرسیار لەسەر سروشتی ئەم ڕووداوانەی مێژوو دەکات.

---

٢٣- د. شاكر مصطفى: التاريخ هل هو علم؟ مجلة (عالم الفكر)، الكويت ، المجلد الخامس ، العدد الاول، ١٩٧٤، ص١٧٤.

٢٤- وولَش: المصدر السابق، ص٣٨.

## پێوەندیی مێژوو بە باوەڕی ئایینیەوە:

مێژوو، لەو ڕۆژەوەی کە ئادەمیزاد خووی داوەتیٚ و گرنگیی پێداوە هەر لەژێر کاریگەریی ئاییندا بووە، لەو وەختەوەی کە مانا و نهێنیی هەموو شتێك، ئایین یان بە ئایین لێك دەدرایەوە. دیاردەکانی سروشت و ڕەفتارەکانی ئادەمیزاد هەر بە ئایین لێك دەدرانەوە، ئایین سەرپشك بوو هەموو شتێك: کە ڕووی بدابووایە و ئادەمیزاد دیتبای یان بیستبای یان بڕوای پیٚ بهێنایە، بە ئایین لێك دەدرایەوە و شرۆڤە دەکرا.

مێژوو یەکێك بوو لەو بڕوایانە و ڕووداوەکانی مێژوو کە تۆماردەکران، لەوە دەچوو کە ئیشی ئادەمیزاد نەبووبن، بەڵکو ئیشێك بوو لە ئیشەکانی خوداوەند.

خەڵك وەهایان دەزانی کە ئادەمیزادی حوکمڕان خوداوەندە، لەبەرئەوە بەمەزندەی خۆیان، خوداوەندیان لە شێوەی ئادەمیزادێکی حوکمبەدەست ڕەسم دەکرد. کە حەز و ئارەزووی خۆی بەسەر مەلیك و سەرۆکەکاندا دەسەپاند، هەروەك چۆن، مەلیك و سەرۆکەکان حەز و ئارەزووی خۆیان بەسەر مسکێنەکانیاندا دەسەپێنن٢٥.

ئیدی، بەو جۆرە هەموو کردار و ڕووداوێك مۆرکی پیرۆزیی لیٚ دەنراو حکومەت بریتی بوو لە ویست و ئارەزوی خوداوەند. حاڵەکە، کە ئاوەها بێت، مێژوویش، ڕەفتاری ئادەمیزادی نیشان نەدەدا و ئادەمیزادی لەو ڕەفتارانە بە دوورگرتبوو، قارەمانانی چیرۆکە مێژووییەکان هەموویان خوداوەند بوون.

ئەم جۆرە نووسینانەش کە لە بابەتی مێژوو دەچن، یان ئەو مێژووە ئایینی و ئەفسانانە بیر و هزری خۆرهەلاتی ناوەڕاستی کۆنترۆڵ کردبوو تا ئەو کاتەی کە نووسینی مێژوو لە ولاٚتی گریکدا پەیدابوو.٢٦

---

٢٥ _کولنجوود. ر.ج. فکرة التاریخ، ترجمة: محمد بکیر خلیل، منشورات لجنة التالیف والترجمة والنشر ، ١٩٦٨ ، ص ٥١.

٢٦ _کولنجوود: مصدر سابق٠٠، ص ٥٤.

ئەو بڕوا ئایینییە، بووە سەرەتایی لێکدانەوەی ئایینی بۆ مێژوو، کە کۆنترین لێکدانەوە لە بیرۆکە و مەسەلەی مێژوودا کە هەتا ئێستاش هەر لە کاردایەو کاری پێ دەکرێت و لای وایە کە مێژوو دەچێتەوە سەر حەز و ئارەزووی خوداوەند ٢٧ و مێژوو هیچ ئامانجێکی نییە لە بەرزاگرتنی ناوی خوا بەو لاوە، وەك قەشە جاك بۆسویە ( Jacaues Bossuet ١٦٢٧ – ١٧٠٤ ) لە کتێبەکەی خۆیدا " وتارێك لەبارەی مێژووی جیهان" باسی کردووە، کە ئایین تەنیا دیاردەیەکە، پێویستە لەناو هەموو دیاردەکانی شارستانییەتدا، تۆماربکرێت ٢٨.

یان وەکو سان ئۆگستین (St.Augstine ٣٥٤ -٤٣٠ز) کە لە کتێبەکەی خۆیدا (شاری خوا) دا دەڵێت:" مێژوو، شانۆیەکە خودا دای ناوە و ئادەمیزاد تەمسیلی دەکات". ئیدی مێژوو بەم جۆرە سەری هەڵداوە و — باقیمەنی مەعریفەکانی ئادەمیزادیش- لە بیروباوەڕی ئایینی، لەسەدەکانی کۆنەوە، هەر بەو جۆرە هاتوونەتە ئاراوە.

بەڵام ئەگەر پاشماوەی کاریگەرییەکانی ئایین، هەتا ئێستاش چەند لایەنێکی هزری مێژوونووسانیان بە مۆرکی ئایین مۆرکردبێت، ئەوە ئەو مانایە نابەخشێت کە مێژوو بریتی بێت لە مەعریفەی ئایین.

گریکەکان، خۆیان، مێژوویان کرد بە مەعریفەیەکی سەربەخۆی جیاواز لە ئایین کاتێك کە نووسینی مێژوو بە شێوەیەکی جیاواز بە دەستی مێژوونووسی بەناوبانگ هیرۆدۆت ( Herodotus ٤٨٤ -٤٢٥پ.ز) و جێگرەکەی مێژوونووسی بەناوبانگ توکیدیدس (سۆسیدید – Thucydides ٤٤٦ - ٣٩٥ پ.ز) تۆمارکرا.

هیرۆدۆت یەکەم کەس بوو کە تەواوی مێژووی جیهانی ئەو سەردەمەی نووسی. ئەوەتا فەیلەسووفی گریك. شیشرون (cicero ١٠٦ -٤٣ پ.ز )باسی خەسڵەتەکانی هیرۆدۆت

---

٢٧ _ول دیورانت : مباهج الفسلفة ، ترجمة: د. احمد فؤاد الاهواني — الکتاب الثاني ، فصل ١٤، ص٧٠.

٢٨-د. صبحی، احمد محمود: فلسفة التاريخ، مطبعة للثقافة الجامعية، الاسكندرية ميصر،١٩٧٥،ص١٧٢.

ـ انظر كتاب ايمرى نف، على سبيل المثال، المؤرخون و روح الشعر"

دەكات و دەڵێت: (باوكی مێژووە) چونكە مێژوو باسێكی لێكۆڵینەوەی زانستییە) شیشرون، وتی: مێژوو لە بابەتی ئەفسانە نییە، بەڵكو كۆششێكە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لە بارەی چەند كاروبارێكەوە دەكراو ئادەمیزاد بڕوای وابوو كە نایان زانێت.

ئەوە مێژووی ئایینی نییە، بەڵكو مێژووی ئادەمیزاد. كێشەكانیش كێشەی خوداوەند نییە، كێشەی بابەتی ئادەمیزادە، كێشەی چالاكیی ئادەمیزادە. ئینجا وتی: مێژوو لەوانەیە زانست بێت، بەڵام ئەم قسانەش مانای ئەوە نییە، كە خودی هیرۆدۆتیش لە كاریگەریی ئەفسانەو ئایین رزگاری بووە. نەخێر، ئەمە مەسەلەیەكە نامانەوێت زۆری لەبارەوە بڕۆین و درێژەی پێ بدەین، چونكە لەو بابەتانە نییە كە دەمانەوێت قسەیان لەسەر بكەین.

وەلێ مێژوونووسی دووەم (توكیدیدیس) بە شێوەیەكی هونەرمەندانەی ئەوتۆ كە عەقڵ لە مێشك دەفڕێنێت، وەكو لێكۆڵەرێكی زانستی پشت بە گفتوگۆی ئەو واقیعانەی كە شاهیدحاڵێك دەیگێڕێتەوە هەموو ئەفسانە و عەجایەبەكانی رەت كردەوە و گوێی بە سروشی خوداوەندەكان نەداو بەهای بۆ پێشبینی و نوقلانەی كاهینەكان دانەناو، رووداوەكانی بردەوە سەر هۆكارە سروشتی و ئادەمیزادییەكان كە عەقڵیش قبووڵی دەكات. لە هەموو ئەوانەوە چەند حوكمێكی وردو دروستی بە دەست هێناو، یەكەم كەس، ئەو بوو قسە بەناوبانگەكەی كرد و وتی:" مێژوو خۆی دووبارە دەكاتەوە".

پاشان نووسەرانی مێژوو دوابەدوای یەك هاتن و زۆربوون كە تا ڕادەیەك رووداوەكانی مێژوویان بە شێوەیەكی قوڵ و دوور لە كاریگەری ئایین خستەڕوو، سا، ئەوانە لە نووسەرانی رۆمانی بن وەك: لیڤی و تاسیتۆس و یۆلیۆس قەیسەر و نووسەرانی دی، یان هەر نووسەرێكی تر بن. یان وەك ئەوەی لە ئەورووپا لە چاخی ڕێنیسانس ڕۆشنگەریدا رووی دا.

Enlighten mentage کاتێك کە مێژوو لە لاهوت، بەکاریگەریی ڤۆلتێر (Voltaire ١٦٩٧- ١٧٧٨) رزگاری بوو، هەروەها بە مونتسکیۆ و جیبوون و کەسانی تریش کاریگەرییان هەبوو.

نووسینی مێژوویش لای موسوڵمانان لەسەر بیرمەندی گەورەی وەکو ئەوان پەکی نەکەتبوو، لە ئیسلامەتیشدا نووسەری بەناوبانگی گەورەی وەکو ئەوان هەبوون ئەوەتا مەسکەوەیهی (٤٢١ ك/ ١٠٣٠ز مردووە) ئەوەتا ئیبن خەلدون (٨٠٨ ك/ ١٤٠٦ز مردووە) و مەقریزی میسری (٨٤٥ك/ ١٤٤٢ز مردووە) ئەمانە لەبەرچاوترینی پێشەنگی فەلسەفەی مێژوو بوون. داوایان کرد. کە هۆ بە هۆکردەوە، واتا (ئەنجام بە هۆکارەوە) ببەسترێتەوە.

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەعریفەی مێژوویی ناتوانرێت بە یەکێك لە بڕوای ئایین یان بە یەکێك لە مەعریفە ئایینییەکان لە قەڵەم بدرێت.

بەڵکو مێژوونووسان هەر لە زەمانی کۆنەوە، ویستوویانە کیانێکی تایبەتی سەربەخۆ پێپڕوبکەن و مێژوو بوو بە خاوەنی بیر و هزر و مانا و شێواز و ڕێگەی تایبەتی خۆی و زۆر لە هزر و ماناو ڕێگە تایبەتەکانی ئایین جیاوازە. هەرچەندیشە مێژوو لە سەردەمەکانی پێشوویدا بەشێك بوویێت لە ئایین و پاشان لە ئایین پەیدابوویێت و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار و زەمانە، لە ئایین جیابوویێتەوە، بەڵام مێژوو لە ئاسەوار و نووسراوەکانیدا زانیاریی لەبارەی ئەفسانە و بڕواو ئایینگەلێك بووە، مردووە و نەماوە، وەلێ هێشتا لە زەینی مێژووودا ماون.

### ئایا مێژوو ئەدەبێکە لە ئەدەبیات؟

جۆری نیشاندان و نووسینی مێژوو کە پشتی بە نووسین و دەربڕینی نووسراوی جوانناسی ورەوانبێژی دەبەست و نیشاندانی ئەوانەش کە خەبەرەکانیان دەنووسی، کە ئەوان پیاوی زانست و خاوەنی نووسراوی جوانن، بووە هۆی ئەوەی کە زۆربەی زۆری پێوەندیداران بە مەسەلەکانی مێژووەوە، بە ئەددبیاتی لە قەڵەم بدەن.

نەك هەر ئەوە، بەڵكو مێژوونووس هەبوون، هەر بۆ خۆیان ئەدیبی ڕەسەن بوون و ڕووداوەکانی مێژوویان بە جۆرێك دەنووسی هەر وات دەزانی کە چیرۆك دەگێڕنەوە، تا وای لێهات گەلێ جار زۆر بە زەحمەت ئەدیب و مێژوونووس لێك جیادەکرانەوە. لە کولتووری میللەتاندا لەو نموونانە زۆرن بە نموونە لە مێژووی ئیسلامیدا: جاحز و ئیبن قوتەیبەی دینەوەری و، عیماد کاتب ئەسفەهانی و، ئیبن مستەوفی، ئەوانە ڕووداوەکانی مێژوویان بە نووسینێکی ئەدەبی و هونەرییانە دەخستە پێش چاو. مێژوونووسی ناوداری جیهانیش هەبوون. بەنموونە: وەك گیبون (Gibbon) و جۆرج ماکولی تریڤیلیان (George Macauy Trevelyan) لە خوێندنەوەی کتێبەکەیان بۆمان دەردەکەوێت کە لە ریزی مێژوونووسە ئەدیبەکاندا دادەنران. هەروەها. رانکە (Rankc) و تۆینبی ( Toynbee) یش هەمان خاسڵەتیان پێوەدیارە.

ئایا هەر کتێبی (ئەلیادە)ی شاعیری گەورەی گریك (هۆمیرۆس) نەبوو کە جەنگی تەروادەی بە شیعر، بە نەمری هێشتەوە؟ ئەو داستانە دەگمەنە بووە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوەی مێژووی گریك و ئەدەب و ئەفسانە و ئایین و زمانی گریك.

وەلێ ئەم نموونانە بەڵگەی ئەوە نین کە مێژوو، ئەدەبە مرۆڤ هەندێ جار لە نووسینەکانی هەندێ لە مێژوونووساندا هەندێ خەسڵەتی ئەدەبی و جوانیی ڕەوانبێژی و لەزەتی دەربڕین دەبینێت، بەڵام ئەمانە هەموویان تەنیا پێوەندییان بە شێوە و شێوازەوە هەیە، نەك بە ناوەرۆك.

لێرەدا پرسیارێك بە خەیاڵدا دێت، ئایا مێژوونووسەکە دەبێ چی کردبێت کە نووسراو و کتێبەکەی بە ئەدەب لە قەڵەم نەدرێت؟ ئەوەتا دکتۆر گ. ب. بیوری (J.B.Bury – ١٨٦١ – ١٩٢٧) مامۆستای مێژووی نوێ لە زانکۆی کێمبێرج،

له ئینگلتەرا له موحازەرەی کردنەوەی زانکۆکه له ساڵی ۱۹۰۳دا دەڵێت:" حەزدەکەم پێتان بڵێم که مێژوو لقێکی ئەدەب نییه"۲۹.

ئەو مێژوونووسه ئاسەوارەکانی هەڵدایەوەو هەموویانی پاك کردەوەو ژێدەرەکانی که له سەدەکانی پێشەوە نووسرابوون هەموویانی خوێندەوە.

پاشان هەموو ئەو پاشماوانەی دانان و ڕیزی کردن و ڕەخنەی لێ گرتن و دووبارە گێڕانییەوە، بەپێی مەزندەی خۆی، هەندێ شرۆڤه و لێکدانەوەی ڕووداوەکانیشی له خودی خۆیەوە، بۆ زیادکردن. پاشان بووە کتێبێك و وەك لێکۆڵینەوە یان وەك کتێبێك پێشکەش بە خوێندەوارانی کرد. ئا بەم جۆرە مێژوونووس بوو بە تەتەر( ساعی البرید) یان بووە پردێك که خەڵك بەسەر عەقڵیدا بپەڕنەوە.

ئەمەش مانای وایە که ئەوەی پێشکەشی خوێندەوارانی کرد له خەڵکی ترەوە وەری گرت ولەپاشماوەی نووسەرە کۆنەکانەوە دەری هێناو، له واقیعی دەرەوە دایتاشی و له داهێنانی خۆی نەبوو، له خەیاڵ و ویژدانی خۆیەوە نەخوڵقابوو، بەڵکو دوای کۆشش و سەبر و وچانێکی زۆر ئەوەی بە شێوەیەکی مەوزوعی نووسیبووی لێی لانەداو پێشکەشی خوێندەوارانی کرد.

لەبەرئەوە دەبینن که فەرقێکی زۆر له نێوان نووسینی هونەری (ئەدەبیی پەتی) و نووسینی مێژوودا هەیه. واتا له نێوان کاری داهێنانی هونەری که قەڵەمی ئەدیبان تۆماری دەکەن و له نێوان کاری مێژوویی ور ،که توێژەرێکی زانستی دەینووسێت، جیاوازی هەیه.

لەبەر ئەوە ئەرستۆی فەیلەسووف که باسی هێرۆدوتسی مێژوونووس دەکات. دەڵێت: ئەگەر هیرۆدۆتس، مێژووەکەی بە شیعریش هۆنیبایەوە. هەر مێژوونووس دەبوو، نەدەبوو بە شاعیر. واتا روحی هونەر بەسەر ئیشی مێژووییدا سەرکەوت و زاڵ

---

۲۹- أ.ل. راوس : التأريخ اثره وفائدته ، ترجمة: مجدالدين حفني ناصف ، مؤسسة سجل العرب، القاهرة، ص ۸۳.

بوو، ئەمەش ئیشێکی جوانە. وەلێ ئیشی ناو چوارچێوە و ناوەڕۆکەکەی هەر ئەو ئیشەیە کە لە مەسەلە واقیعییەکاندا یان لەیەك لە مەسەلە رابردووەکاندا کراوە. لێکۆڵەری مێژوویش هیچی ئەوتۆی لەسەر نامێنێت. لەوە زێتر کە ژێدەرە زانستییەکانی ئاسەوار و پارەو بەڵگەنامە و کتێبەکانی خۆی رێك بخات. بێگومان ئەم ئیشەش بەداهێنان لە قەڵەم نادرێت، تەنیا لایەنی دەروازە و بەش و رێکخستنی پەراوێزەکان نەبێت. پاشان شتی گرنگیش لە بواری داهێناندا — ئەوەیە کە هۆکاری ڕووداوەکان بوترێت یان لێك بدرێنەوە. لەم حاڵەتەدا کتێبەکەی دەبێت بە بابەتێك لە بابەتەکانی فەلسەفەی مێژوو.

شاعیری ئینگلیز فیلیپ سیدنی بەزەیی بە مێژوونووسدا دەهاتەوەو، دەیگوت، ئادەمیزادێکە هەموو ژیانی خۆی خستووەتە ژێر باری گرانی بەڵگەنامە و سجلەکانەوە. کە مشك نیوەیانی قرتاندووە. بۆ راستیی قسەکانیشی پشت بە مێژوونووسی وەکو خۆی دەبەستێت، ئەوانیش بۆ راستی قسە و ئیشی خۆیان پشت بە ڕۆمان و حەکایەتی دەماودەم و دەستنووسی رەش (خراپ) و باقیمەندی کەلاوەکان و پاشماوەکان دەبەستن ٣٠.

بەلاّم ئەمە لە بواری بەراوردی نێوان هونەرمەندی (ئەدیب) و مێژوونووسدا مانای ئەوە نابەخشێت کە مێژوونووس بووەتە پردێك بۆ گواستنەوەی باس و خواس و هاوردنی باسی ڕووداو و دەنگوباس. بێگومان مێژوونووس ئیشی ئەوەیە باسی ئەو ڕووداوانە بکات، کە لە ڕابردوودا ڕوویان داوە. خۆی بە چاوی خۆی نەیانی دیتووە. خۆ ئەگەر خودی مێژوونووسەکە شاهێدحاڵ بێت، ئەوا ئەوەی کە دەینووسێت دەچێتە خانەی خەبەرەوە یان دەچێتە باسی ڕەوشتی کەسێکەوە و هەر شتێکی لە بارەی ڕووداوەکانەوە نووسیبێت سەرنج و تێبینی و ڕای خۆیەتی لە مەسەلەیەك لە مەسەلەکانی ئەو کاتەدا و، ناچنە ئەو خانەیەوە کە مێژوو ـ ی پێ دەڵێن، بەلاّم بەکەڵکی ئەوە دێن کە بخوێنرێنەوە و سەرنجیان

---

٣٠- لیدل هارت : التاریخ فکراً استراتیجیا : ترجمة: د. حازم مشتاق طالب .طبع الدار العربیة، بغداد، ١٩٨٨، ص: ١٨٥.

لێ بدرێت و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکرێت و لە دواڕۆژدا بابەتەکانی مێژووی لێ وەربگیرێت[31].

کەواتە مێژوونووس ناتوانێت لە خۆیەوە ڕووداو بخولقێنێت یان بە خەیاڵ کەسایەتییەکان داهێنێت، لەبەر ئەوە ئەو حەقیقەتەی کە مێژوونووس بۆی دەگەڕێت، جیاوازە لەو حەقیقەتەی کە نووسەری هونەرمەند (چیرۆکنووس و شاعیر) بۆی دەگەڕێت، هەرچەندیشە هونەرمەندەکە حەز دەکات حەقیقەتەکە بزانێت و ڕوونی بکاتەوە، هونەرەکەشی لەسەر بناغەی ڕێکار و شەرتوشرووت و سنووری ئەوتۆ دامەزراوە، کە ڕێزی لێدەگرێت و پێوەی پابەند دەبێت، بەڵام ئەو بە دوای حەقیقەتێکی دیکەدا دەگەڕێت کە خۆی هەڵیبژاردووە.

ئەویش ئەو حەقیقەتە مێژووییەیە کە بە نیشانەکانیدا ناسراوە. قسە لە کورتی ببڕینەوە باشە، ئەوەیە کە هونەرمەندەکە بەپێی ویژدانی ناسکی خۆی، بەپێی خەیاڵی خولقێنەری خۆی بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕێت.

گەلێ جاریش مێژوونووس لەو بابەتەیدا کە لێی دەکۆڵێتەوەو دەینووسێت، حەز لە نووسینی شتی درامی دەکات لەبەر ئەوە مل دەداتە نووسینی هونەری بۆ تەواوکردنی ئەو سوودەی کە بە تەمایەتی. ئەو مێژوونووسە هەرچەندێکیش لەو ڕەگەزە دراميیانە بەکاربهێنێت و دەمی خۆی پێ شیرین بکات، بەڵام هەر بە کۆتکراوی حەقیقەت دەمینێتەوە و ناتوانێت لێی لابدات، دەنا نابێــتە مێژوونووس.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە نووسینی مێژوو پێویستە جوانکاری و هونەری تێدا نەبێت، کە دڵی خوێندەواران رابکێشێت یان لێکۆڵەری مێژوو دەبێت لە کەفوکوڵی دڵ بە دووربێت. نەخێر،... ئەوەتا جۆرج ماکولی تریڤلیان (١٨٧٦ — ١٩٦٢) مامۆستای مێژووی نوێ لە زانکۆی کێمبێرج دەڵێت:

---

٣١- د. حسن عثمان: منهج البحث التاريخي، طبعة دار المعارف، طبعة خاصة، القاهرة، ١٩٨٤، ص٦١.

"هەر کەسێ کەفوکوڵی لە دڵدا نەبێت و کەللەی گەرم نەبێت، کەمتر هەست بە کەفوکوڵی دڵی خەڵك دەکات و ناشتوانێت ئەو کەفوکوڵە لە دڵی خۆیدا پەیدا بکات".

ئێمە مێژوو بە هونەرێکی نووسین دانانێین، وای بە باش دەزانین مانای خەسڵەتی ئەو هونەرەی کە ئیبن خەلدون بە مێژووییەوە ناوە، بە وردی بزانین مەبەستی چییە، ئیبن خەلدون کاتێك کە دەڵێت:" مێژوو لەو هونەرانەیە کە میللەتان و نەوەکانیان دەستاودەستی دەکەن"٣٢ یان کاتێك کە دەڵێت:"بزانە کە هونەری مێژوو هونەرێکی مەزەب قایمە" ٣٣ مەبەستی لەو هونەرانە نەبووە، لە زەمانی ئەودا باوبوون. ئیبن خەلدون لە بەرایی کتێبەکەیدا بڕگەیەکی بەناونیشانی "لە سوودی زانستی مێژوو" نووسیوە. ئەو وشەی (هونەرەکان ) و (زانستەکان) بە شێوەیەکی کورت بەکاردێنێت، چونکە هێشتا سنوور لە نێوان ئەم دوو جۆرە مەعریفەیەدا دانەنرابوو، کابرا دەشیزانی کە مێژوو دوو رووی هەیە، روویەکی ئاشکراو دیارە، رووەکەی تری نادیارە، "لە ئاشکراکەیدا لە دەنگوباسی ڕۆژگار و دەوڵەتان زیاتر و لە سەدەکانی پێشووتر، بەولاوە هیچی دیکەی تێدا نییە"، بەلاّم "لە نادیارەکەیدا بۆچوون و ساغکردنەوە هەیە، هۆکاری وردی بوونەوەر و سەرەتاکانی بوونەوەر هەیە، زانستیی قووڵی چۆنێتی و هۆکارەکانیان لەئارادایە " ٣٤ ئەمەش مانای ئەوەیە کە مێژووی بە هونەر دانەناوە. مەبەستیشی ئەوە نەبووە کە بە زاستی دابنێت. ئەوپەڕی مەبەستی ئەوەبوو کە "مێژوو " جۆرە مەعریفەیەکە میللەتان کەوتووەتە سەر زمانیان و دەساودەسی دەکەن و هیچی دیکە.

---

٣٢_ المقدمة: ص ٢.

٣٣ -المصدر نفسه ص ١٢.

٣٤ -المصدر نفسه: ص ٢.

## ئايا مێژوو زانستە؟

زانست مەعریفەیەکی ڕێکوپێك، یان ریزکراوە( knowledge systematized ) لەو تێبینی و لێکۆڵینەوە و ئەزموونەوە پەیدا دەبێت، کە بە مەبەستی دیارکردنی سروشتی، یان ئوسوولی ئەو لێکۆڵینەوەیەوە تەوا دەبێت، کە بەهۆی ئەزموون و گریمانەکانەوە دەکرێت. فەرهەنگی تازەی (وێبستەر) ئەو پێناسەیەی بۆ داناوە کە لە سەرەوە باس کرا ٣٥.

وەلێ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد پێناسەی زانست دەکات و دەڵێت: ئەو لقەی لێکۆڵینەوەیە کە پێوەندیی بە قالبێکی (جسد) یەکگرتووی حەقیقەتە نەگۆڕە جۆربەجۆرەکانەوە هەیە و قانوونی گشتی حوکمی دەکا و ڕێگە و بەرنامەی بڕواپێکراوی تێدایە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتە تازەکان لە چوارچێوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا٣٦.

وەلێ لۆرد ئەکتن (Lord acton ١٨٣٤ -١٩٠٢) لە زانکۆی کێمبێرج، وەسفی زانست دەکات و دەڵێت: زانست بریتییە لە کۆبوونەوەی کۆمەڵێ گەورە ڕووداوی هاوشێوە. لەم کۆبوونەوەیەدا، یەکەیەکی گشتی، بەشێوەی پرەنسیپ، یان بە شێوەی قانون پەیدادەبێت، کە بە هۆیەوە دەتوانین لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا پێشبینی ڕووداوی هاوشێوەی ئەو ڕووداوانە بکەین ٣٧.

---

٣٥ -Websters new twentieth century DIctionary of English Language , ١٩٦٠.p.١٦٢٢.

٣٦- Shorter oxford English Dictionary .١٩٥٩- p.١٨٠٦.

٣٧ هرنشو: علم التأريخ، ترجمة: عبدالحميد، ط، الثانية ، دار الحداثة للطباعة والنشر، بيروت: ١٩٨٢، ص٤.

بێگومان، هەر مەعریفەیەك ئەم پێناسانەی بەسەردا پەیڕەو بکرێت، یان هاوشێوەی ئەم پێناسانەیان بەسەردا بچەسپێت. ئەوە زانستە، ئەگەر وەهاش نەبوو، ئەوە زانست نییە، ئێستا هەوڵ دەدەین، بەشێوەی کردارەکانی وەرزشی مێشك (الریاضیات) ئەو بەرنامانەی لەسەر پێناسەی زانست دامان نابوو، ئەگەر بتوانین هەموویان بکێشینەوە و بگەین بە ئەنجامێك !

سەرەتا دەڵێین، ئەم گفتوگۆیە پێش سەدەها ساڵ دەستی پێکردووە. لە ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیحەوە، هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە، لەوانەیە بەبێ وەستان هەر بڕوات و بەردەوام بێت! ئایا دەتوانین لە هەوڵێکی وەهادا بەشداری بکەین کە ئەو بۆچوونە لێکجیاوازانە، لەیەکتری نزیك بکەینەوە بۆ ئەوەی بگەینە چارەسەرێکی ئەوتۆ کە ڕەزامەندیی لەسەر بکرێت؟ یان ئەم هەوڵەمان باری مەسەلەکە قورس دەکات و، ئاڵۆزییەکە ئاڵۆزتر دەکات؟

دوای ئەوەی کە نەمانتوانی ناکۆکییەکە یەك لابکەینەوە؟ لەو ڕۆژەوەی کە (سێو)ەکەی نیوتن و گومانەکەی دیکارت و تاقیکردنەوەکانی بیکون، سەرکەوتن. پرسیاری (زانستیبوونی) مێژوو، بێزارکەرانەی — وەك دەڵێین — بەدوای مێژوونووسان کەوتووەو داوێن و کتێبەکانیان دەدڕێنێت[38].

مێژوو دەتوانێت ببێت بە زانست، بەو حسابەی کە بریتییە لە کۆمەڵێك زانیاریی ڕێکوپێك و بەرنامەیەکی زانستی پەیڕەو دەکات و ڕەخنەی پاك و ورد دەگرێت.

فەیلەسووفی بەریتانی کیرو (١٨٣٥- ١٩٠٨) یەك لەوانەیە کە دەڵێت: مێژوو زانستە، ئەوەشی ڕاگەیاند، کە مێژوو هەرچەندیشە وەکو زانستی ئامێرەکان و عەددەسەکان و ڕووەکەکان زانستێکی بڕواپێکراو نییە، بەڵام لە ڕووی ئەنجامەکان و شێوازەکانییەوە، ڕێژەیەکی زۆری لەو زانستانە وەرگرتووە. لەبەر ئەوە دەتوانین درێغی لێ نەکەین و بە زانستی دابنێین[39].

---

٣٨- د. شاکر مصطفی : التأریخ هل هو علم؟ المصدر السابق، ص، ١٦٩.

٣٩- د. خلیل سعید عبدالقادر : منهج البحث التاریخی وزارة التعلیم العالي ، جامعة بغداد، ١٩٨٨،ص:٢٤.

وابزانم سوودی هەیە ئەگەر ئاماژە بە مارکسییەکان بدەین، چونکە ئەوان مێژوویان بە زانستێك داناوە، ملکەچی قانوونێکە، پێویستە بخرێتە کار، کە ئەو قانونەش، قانونی بزووتنەوەی کۆمەڵگەیەو مێژوو بە جۆرێك لێکدەدەنەوە، کە گۆڕانی کۆمەڵگەکان لە سیستەمێکی ئابووری بۆ سیستەمێکی پێشکەوتووتر، بەناو چاخەکان و بەناو ململانێی چینایەتی دا گوزەر دەکات٤٠. راوبۆچوونی ئنگلز (F.Engels، ١٨٠٢- ١٨٩٥) کە لەگەڵ کارڵ مارکس دا (K.Marx ١٨١٨- ١٨٨٣) لە چەندین دانراوی تیۆریدا بەشدار بووە، ئەوەیە کە خەڵکان پێکەوە لەو کارانەدا کە دەیکەن، لە بەروبوومی کۆمەڵایەتیدا بەشدار دەبن و لەو کۆمەڵگەیەدا پێوەندیی دیارکراویان لە نێواندا هەیە و ناتوانن دەستی لێ هەڵبگرن. ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتیانە سەربەخۆن و بە ئارەزووی خۆیان نین، واتا لە خۆیانەوە ئەو پێوەندییانەیان قبووڵ نەکردوون و، ناشتوانن قبووڵی نەکەن. پێوەندی بەرهەمهێنان لە قۆناغێکی دیاریکراودا، هێزی ماددی بەرهەمهێنان دەگۆڕێ و بەرەو چاکتری دەبات.

کۆی گشتیی ئەم پێوەندییانەش ژێرخانی ئابووریی کۆمەڵگەکە پێك دەهێنێت. ئەوەش بناغەی راستەقینەی دامەزراندنی سیستەمی قانونی و سیاسییە، کە وەك چەند شێوەیەکی دیاریکراوی ئاگایی کۆمەڵایەتی وایە ٤١.

بەڵام ئەوانەی کە لە "زانستبوونی " مێژوو دەکۆڵنەوە، تا بزانن تا چەند ئەم مەسەلەیە بابەتییە، هێشتا هەر لەسەر پرسیاری بێوچان بەردەوامن و دەپرسن: ئایا مێژوو، تاچەند لە بواری (زانست) نزیك بووەتەوە، یان دوورکەوتووەتەوە؟

---

٤٠- ج. بليخانوف: العال الاقتصادى في التاريخ ، ترجمة: جورج طرابيشي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت ١٩٧٨ ، نفس المؤلف ، تطور النظرة الواحدية الى التاريخ، ترجمة: محمد مصطفى مستجير ، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر ، القاهرة، ١٩٦٩.

٤١- مختارات من انجليز. التفسير الاشتراكى ، ترجمة: د. راشد البداوى ، طبعة دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٦٢، ص١٢١- ١٢٢.

پرسیارەکە لە ساڵی ١٩٤٠. دا لەبەرنامەیەکی رادیۆییدا ئاڕاستەی فەیلەسووفی بەریتانی جود (Joad ) کرا، کە ئایا مێژوو زانستە ؟ لە وەڵامدا وتی: ئەو پرسیارە لەسەر پرسیاری "مەبەستمان لە وشەی  زانست چییە؟" وەستاوە. دەشتوانین، باشتر بڵێین، کە ئەو پرسیارە پێوەندیی بەو مانا تایبەتەوە هەیە، کە لە هزر و مێشکی خۆماندا لە بارەی "زانست" دوە هەمانە٤٢.

مێژوو، بەو حسابەی کە جیهانێکی پڕ لە پێوەندیی مەعریفە پێشکەش دەکات، کە بە بەرنامە دۆزیویەتەوە، دەبێتە زانست، بەڵام زانستێکە لە بارێکی تایبەتیدا، زانستێکی پەتی نییە، بەڵکو زانستێکە، بەڵام لە بارێکی تایبەتیدا مێژوو بە مەعریفەی گشتی کۆتایی نایەت، بەڵکۆ بە مەعریفەی حەقیقەتە تەنیاکان کۆتایی دێت. خۆ ئەگەر ئەو قسەیە راست بێت، ئەوە بە خاڵی لاوازی مێژوو دانانرێت، بەڵکو لەوە دەچێ بە خاڵی بەهێزی مێژوو دابنرێت٤٣

ئەم قسەیە، وەك گفتوگۆکەی کریستۆفەر بلاك (Christopher Black ) وەهایە کە لە وتارێکیدا بەناونیشانی "ئایا مێژوو دەکرێت ببێتە مەوزوعی؟"  کە لە ساڵی ١٩٥٥ دا لە گۆڤاری (mind) دا بلاّوی کردەوە، وتی: (ئەو پرسیارەی لە بارەی مەوزوعییەتی مێژووەوە دەکرێ، پرسیارێکی بۆشە، ئەگەر هەندێ مێژوو بە بابەتی وەسف نەکەین، ئەوا ناتوانین بزانین، مەبەست لەم پرسیارە چییە؟٤٤.

ئەوەش ئەرنەست رینان ( Ernest Renan  - ١٨١٣- ١٨٩٢)، کە دوای دەرچوونی کتێبەکەی (ئایندەی زانست) لە ساڵی ١٨٤٨، پێگەی بۆ (زانستەکانی ) مێژوو لەناو زانستەکاندا دانا. هاوڕێی ئەو پیاوە، مێژوونووسی فەرەنسایی فوستێل دی کولانگ

---

٤٢- د. شاکر مصطفی: المصدر السابق ، ص١٧٣.

٤٣ وولش. و. هـ: مدخل الفلسفة التأريخ، ترجمة: احمد حمدی محمود، منشوارات سجل العرب ، القاهرة،١٩٦٢، ص ٥٤.

٤٤- وولَش . و. هــ. مدخل لفلسفة التأريخ ، ص٢٣١.

(fustel de coulange ۱۸۳۰ – ۱۸۸۹) چەندین جار ئاماژەی دا کە " مێژوو، زانستە. وەك زانستەکانی دیکە حەقیقەتی رووداوەکان نیشان دەدات، پاشان شیکاریان دەکات و لە نزیکبوونەوەی نێوانیان دەکۆڵێتەوە و ئاماژە بە پێوەندییەکانیان دەدات. مێژوونووس وەك کیمیازان وایە، کیمیازانەکە رووداوەکان لە تاقیکردنەوەکاندا دەبینێت، بەلاّم مێژوونووسەکە بۆ ئەوە دەگەرێت کە بە تێبینی وردی خۆی بیان گاتێ". پاشان دی کولانگ بە کورتی دەڵێت: رێگەی مێژوو هەر هەمان رێگەی زانستەکانی دیکەیە و فەرقیان نییە ٤٥.

وادیارە ئەگەر ئەو هەموو راوبۆچوونانەی کە لەبارەی وەلاّمی پرسیاری "ئایا مێژوو زانستە؟" هەموویان کۆبکەینەوە، ئەوا قسەکەمان درێژە دەکێشێ و تەواو نابێت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ راوبۆچوون لەم بارەیەوە هەیە، نابێت پشتگوێ بخرێ، ئەوەتا جۆرج ماکولی تریڤیلیانی دەڵێت:" مێژوو لە سنوورێکی دیارکراو دا کە کاری وردبینی و گەران و دۆزینەوە دەکا، زانستە٤٦.

راستیشت دەوێت، کەمێك لە قسەی مێژوونووسان زریانێك گفتوگۆی هێنایە مەیدان، بەنموونە، وەکو قسەکەی بوری (Bury) ئەوەبوو وتی:" مێژوو، زانستە، زۆر و کەمی پێ ناوێت" (History is ascience, no more, no less). ئەم راگەیاندنەی (بوری) کۆششێك بوو، بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو گفتوگۆ بەردەوامەو بانگهێشتێکیش بوو، بۆ بێمنەتی و بێپەروایی. بوری ئەو قسەیەی لە موحازەرەیەکی زۆر گەرمدا لەبەرایی ساڵی ۱۹۰۳ دا کرد٤٧.

ئەدوارد گار دەڵێت، لە ماوەی پەنجا ساڵەی ٤٨ دوای موحازەرەکەی مامۆستا بوری کاردانەوەیەکی بەهێز لە دژی قسەکانی ئەو موحازیرە گەورەیە پەیدابوو.

---

٤٥- جوزف هورس: المصدر السابق، ص:٦٥.

٤٦-د. حسین مؤنس : التاریخ والمؤرخون، مجلة عالم الفکر، الکویت، المجلد الخامس، العدد الاول، ۱۹۷٤، ص۹۳.

٤٧ _راوس: المصدر السابق ، ص۸۳.

٤٨- ادوارد کار: یتحدث في حدود عام ۱۹٥۳.

ئەوانەش کە بە مێژووەوە خەریك بوون و خزمەتی مێژوویان دەکرد، هەر بۆ لاقرتێ و پلار ئاماژەیان بە (پەندەکەی بوری) دەدا.

بەڵام ئەوانە لەبیریان چووبوو، کە هەمان ئەو زانستە، شۆڕشێکی گەورە و قووڵی لێ هاتەدی و دەمانهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە ڕاوبۆچوونی بوری، لەوەی کە مەزندەمان دەکرد، ڕاستتر دەرچوو٤٩.

بێگومان ئەو بێمنەتییەی لایەنگرانی (مێژوو زانستە) تا ڕادەیەك ڕێی تێدەچوو، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە چەندین پیاو لە ریزی موحازیرە ئینگلیزەکەدا وەستابوون، ئامادەبوون بچنە شەڕە شمشێر و لەوبەریشەوە لەبەرامبەریاندا چەندین پیاو وەستابوون.

دەبینین، فەیلەسووفەکانی سروشت — کە زاناشیان لەگەڵ دایە — دژ بەو ڕاوبۆچوونە وەستاون و دەڵێن: ماددەی مێژوو لە ماددەکانی زانست جیاوازە، چونکە مێژوو ماددەیەکی ناجێگیرە سنووری بۆ نییە، ناشتوانرێت بە ئاسانی ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ببینرێت و تێبینی و ئەزموون و تاقیکردنەوە و پشکنین لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا نەکراوەو ناکرێت و هەر ڕووداوێك لە ڕووداوەکانی مێژوو بە تەنیا ڕووی داوەو لە ڕووداوەکانی دیکە سەربەخۆ و جیاوازە، مەزندە ناکرێت هەلومەرجی ئەو ڕووداوانەش دووبارە ببێتەوە، ناشتوانین جۆرە گشتاندن و قانوون گەلی گشتی بدۆزینەوەو ڕووداوی ڕێکەوتی ئەمرۆش هەموو قەرساندنێك و نوقلانەیەکی دوێنێ پووچ دەکاتەوەو، ڕووداو تا ڕوونەدەدات ناوترێ و باس ناکرێت و تاقیش ناکرێتەوە. لەبەرئەوە، دامەزراندنی مێژوو لەسەر بناغەی زانستیی بەهێز کۆششێکی بزروبێ مانایە و گاڵتەجارییە ٥٠ وەك — ولیام ستانلی جیفونز ( William Stanley Jevons ١٨٣٥ -١٨٨٢) دەڵێت: هیچ مانای نییە مێژوو بە زانستی تەواو دابنێین.

---

٤٩ -ادوارد کار: المصدر السابق، ص٧٦.

٥٠ -هرنشو: المصدر السابق، ص٢.

هەندێ ئەدەبزانیش، مێژوو بە هونەرێك لە هونەرەكان دادەنێن جا زانست بێت یان زانست نەبێت، ئەوان هەر بە هونەری لە قەڵەم دەدەن، دەڵێن: زانست لە ئێسكی وشكەڵاتوو زێتر هیچی دیكەمان لە رابردووەوە ناداتێ و مەگەر بە خەیاڵ ئەو ئێسكانە زیندووبكەینەوە و ژیانیان بەبەردابكەین، ئەمەش دیسان پێویستی بەتوانایی نووسەرێك هەیە، كە بەو بەرگە جوانەوە پیشانی بدات كە شایانی بێت ٥١.

بەنموونە كاتێك ناپلیۆن پۆناپەرت لەساڵی ١٨١٢ دا مۆسكۆی بە سووتاوی گەمارۆدا، زانستی سروشتی ناتوانێت ئەو ئاگرەمان بۆ لێك بداتەوە مەگەر لەسەر بناغەی قانوونەكانی ئاگر و سووتان نەبێت، لێرەدا رۆڵی مێژوونووس دەردەكەوێت، كە پێویستە دەست لە رووداوەكە وەربدات و هۆكار و هەلومەرجی سیاسی و سەربازیی ئاگرەكە شرۆڤە بكات و لێكی بداتەوە٥٢. قەڵەمی مێژوونووسەكەش یان قەڵەمی ئەدیبەكەش پێویستە ئەو ئاگرەمان بۆ وەسف بكات و ئاسەواری وێرانكاری ئەو ئاگرەمان بۆ شرۆڤە بكات، كە بە هۆی ئەو فەرماندارە فەرەنسییەوە كەوتەوە.

هەریەكە لە زانای سروشت و مێژوونووس و ئەدیب، خۆی چۆنی دەوێت، ئاوەها رووداوەكە شرۆڤە دەكات ، هەر یەكەشیان قسەی ئەوی دیكەیان تەواو دەكات. بێلایەنیی دۆگمای زاناكەش هیچی تێدا مەبەست نییە و جێگای نابێتەوەو لە توانای خەڵك بەدەرە، وەلێ مێژوونووسەكە، گرنگی بە لایەنی هەستەوەری خەڵكەكە دەدات.

هرنشۆ و هنری تۆماس هەردووكیان لایان وایە، وێڕای ئەوەش كە ئێمە ناتوانین قانوون گەلی نەگۆڕی زانستی وەكو قانوونەكانی زانستی سروشتی لە لێكۆڵینەوەی مێژوو دەربهێنین، بەلاّم ئەم حاڵەتە ناشێت مێژوو لە سیفەتی زانستی داماڵێت. هەروەهاش كە ئێمە بە نموونە نەتوانین ئاماجگەلی دیاركراو لە لێكۆڵینەوەی زانستی كەشوهەوا (میتۆرولۆژیا - meteorology) زانستی كەشوهەوا دەربهێنین، لەبەر ئەوەی كە قانونەكانی وركار نینە،

---

٥١- المصدر السابق: ص٣.

٥٢ _حسن عثمان : المصدر السابق، ص١٧... وەرگیراوە لە .Fling the writing of history

خۆ ناشێ لە خەسڵەتی زانست رووتی بکەینەوە... تەنیا ئەوەندە بەسە سیفەتی زانست بدەین بە بابەتێك لە بابەتەکان. بە مەرجێك توێژەرەکەی لە توێژینەوەکەیدا بەردەوام بێت و بۆ حەقیقەت بگەڕێت و لەسەر حوکمی ڕەخنەگرێك دابڕێژێت لە هەوا و هەوەس بە دووربێت و خۆی لە گریمانی پێشترو رابردوو بە دوور بگرێت و بتوانێت بەش و دەروازەکانیشی بۆ دابنێت ٥٣.

بەڕای هرنشۆ، مێژوو زانستە، بەڵام زانستی تاقیکردنەوە و ئەزموون نییە، بەڵکو زانستی رەخنە و ساغکردنەوەیە، زانستەکانی سروشتی واتا زانستی لێکۆڵینەوەی چینەکانی زەمین (جیولۆجیا) زیاتر لەو دەچێت و لێی نزیکترە. هەریەك لە مێژوونووس و جیۆلۆجی لە شوێنەواری رابردوو و پاشماوەی شوێنەواری رابردوو دەکۆڵنەوە بۆ ئەوەی بە گوێرەی توانا حەقیقەتی رابردوو و ئێستاش دەربهێنن. ئیشی مێژوونووس ئەوەی لە ئیشی جیولۆجی زیاترە کە مێژوونوسەکە ناچارە لێکۆڵینەوەکە بکات و هۆکاری ئیداری و کەفوکوڵی بەشەری لێك بداتەوە، تا بتوانێت بە گوێرەی توانا لە حەقیقەتە مێژووییەکان نزیك ببێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیی نێوان جیۆلۆجی و مێژوونووس ئاشکراو ڕوونە، یەکەمیان واتا جیۆلۆجی، لەو پاشماوە وشکەڵاتووەی زەمین دەکۆڵێتەوە، کە پێوەندیی بە هەست و سۆز و بنەچە و بیروباوەڕی ئایینی و نیشتیمانی و نەتەوایەتی و مەزەبی و دابونەریت و فەلسەفەی سیاسییەوە، نییە" بەڵام مێژوونووس لە شتگەلیك دەکۆڵێتەوە کە پێوەندی بە ئینتیما و ئەسڵ و سۆز و هەستەوە هەیە. ئەمە لەلایەك لە لایەکی دیکەوە، جیولۆجییەکە تەنیا لەسەر وەسفەکەی خۆی سوورە، کە ئەویش (وەسفێکی بابەتیانەیە، بەڵام مێژوونووسەکە لە سنووری وەسفەکە دەردەچێت و حوکمی دیاریکراو بەسەر رووداوەکاندا دەدات.

لاوازی و بێهێزیی لایەنی زانستی لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا لەبەر ئەوەیە ئەو حوکمانەی کە مێژوونووس دەریان دەکات زۆرتر بەهای رووداوەکان و کەسەکان دەگرێتەوە، نەك وەسفی خودی رووداوەکان و کەسەکان. دوای فەرقی نێوان مێژوو و جیۆلۆجی ئەوەیە

---

٥٣_ هرنشو: المصدر السابق، ص٥. هنری جونسون: المصدر السابق، ص١٦.

جیۆلۆجی بە پێی ڕێساگەل و قانون گەلی دیاریکراو دەڕوات، کە لەسەری پێکهاتوون ، وەلێ مێژوو، هەتا ئێستاش، هەندێ لەوقانوون و ڕێسایانەی نین٥٤. کۆششی ڕێکچوواندنی مێژوو، بەجۆرێك لە جۆرەکانی زانستی وەك میتۆرولۆژیاو جیۆلۆجیا، وێکچوواندنێکی بەجێیە. وەلێ هیچ زانستێك نییە، لە زانستێکی دیکە بچێت. لەبەرئەوە هەر زانستێك ناوی جیاوازی خۆی هەیە، وەلێ ئەوەی کە ڕێ لە مێژوو دەگرێت و بە زانستی دانانێت ئەوەیە کە ڕێسا و قانوونەکانی زانستەکانی دیکە پەیڕەو ناکات و ڕاوبۆچوونیش بە بەردەوامی دەربارەی سروشتی مێژوو هەر جیاواز بووە.

بەلاّم مێژوونووس و بیرمەندی ئیتالی جیۆفانی باتیتا ڤیکۆ ( Giovanni Battista vico ١٦٦٨- ١٧٤٤) هەولّی دا قانوونێك بدۆزێتەوە ڕێنمایی ڕەوتی مێژوو بکات، تا ئەو کتێبەی کە لەبارەی مێژوو بە زمانی ئیتالی دای نابوو ناوی نا زانستی تازە" scienzo naova "

ئیبن خەلدون زیاتر لە سێ سەدە پێش ڤیکۆ و، شپینگلەر دوای ڤیکۆ بە نزیکەی دووسەدە، بیرۆکەکەی ڤیکۆیان ڕاگەیاندبوو، کە دەیگوت: تەنیا یەك ڕێگە هەیە کە مێژووی هەموو میللەتێکی پێدا دەڕوات، ئەم ڕێگەیەش بە قۆناغی گەشەکردن و پێشکەوتنی بەرەو ژوورو، هەرەسهێنان و مردندا دەڕوات و تەواودەبێت٥٥.

بەلاّم ئەم بیرۆکەیەی ڤیکۆ، بیرمەندانی وەك ئەو، تەنیا بریتی بوو لە نیمچە کۆششێکی نزیککردنەوەی مێژوو لە شتێك، تا لە چوارچێوەی فەلسەفەی مێژوودا لە زانست بچێ کۆلنجوود، وەکو گەلێ کەسی دیکە، خەسلّەتی زانستی، هەر بەو شێوەیەی ڕابردوو بە مێژوو دا، بەلاّم ڕازی نەبوو، لە زانستێك لە زانستە باوەکانی ئەو سەردەمەدا دابنرێت و وتی: ئێستا ئەو پرسیارە ناکەم کە ئەو لێکۆڵینەوەیە چ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکە، گرنگ ئەوەیە کە مێژوو بە ئەسلّ لە لیستی زانستەکاندا دادەنرێت،

---

٥٤ _د. نوری جعفر : التأریخ مجال و فلسفته مطبعة الزهراء ، بغداد، ١٩٥٥ ، ص ١٤٠- ١٤١.

٥٥- د. حسين مؤنس : الحضارة، الكويت، ١٩٧٨، ص، ٢٨٠، ایری نف: المصدر السابق ، ص١٠٧- ١١٠.

مەبەستمان لەوەیە، کە چەند جۆرە بیرکردنەوەیەك دەمانخاتە سەر چەند پرسیارێکی دیاریکراو، هەوڵ دەدەین وەڵامیان بدەینەوە.

گرنگیش ئەوەیە بزانین زانست بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو ئەو جۆرە مەعریفانە پێك نەهاتووە، کە بە دەستمان هێناون و پاشان بەریز دامانناون، بەڵکو لەو کۆششە پێکهاتووە، کە لەسەر شتێك چڕمان کردووتەوەو ناشزانین ئەو شتە چییە تا حەقیقەتەکەی بزانین٥٦.

لەوانەیە فێڵکردن لەو شتانەی کە دەیانزانین ببێتە ئامرازێکی بەسوود بۆ ئەو ئامانجە، بەلاّم ئەم ئامانجە ئەو ئامانجە نییە، کە لە خودی خۆیدا هەیە، باشترین گریمانیش ئەوەیە کە وەك ئامرازێك نە زۆر نەکەم سوودی لێ وەربگرین.

واتا بەها زانستییەکەی مەرجی ئەوەیە، کە بتوانێت شتەکان بە شێوەیەکی تازەی ئەوتۆ رێك بخات، بتوانێت وەلاّمی ئەو پرسیارەمان بداتەوە، کە بۆ وەلاّمەکەی دەگەڕێین.

هەر لەبەرئەوەشە هەموو زانستێك لەو قۆناغەوە دەست پێدەکات کە دڵنیاین لەوەی هەموومان بێ عەقڵین — وەك کولنجوود دەڵێت لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە، کە لە هەموو شتێکدا بێ عەقڵ و نەزان بین، نەخێر، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە تەنیا لە شتێکی دیاریکراودا نەزانین، بە نموونە وەك ئەوەی نەزانین ئەسڵی پەرلەمان چییە، یان هۆی شێرپەنجە چییە، یان پێکهاتەی کیمیایی رۆژ چییە، یان نەزانین بەبێ ماندووبوونی ماسوولکەکانی پیاوێك یان ئەسپێك یان زیندەوەرێکی دیکە ترۆمپایەکی ئاو بخەینە ئیش.

زانست دەرخستن حەقیقەتی هەموو شتێك ئەوەیە، مەبەستمان کە دەڵێین مێژوو، زانستە٥٧.

بەڕاستیش، کۆشش بۆ بەزانستکردنی مێژوو — وەکو باسمان کرد - پێش چەندین سەدە دەستی پێکردووە. گریکەکان — بە عەقڵ و خەملاندنی وردی خۆیان، دەیانزانی کە مێژوو زانستە یان ڕەنگە زانست بێت، چونکە مێژوو باسی ئیشی رابردووی ئادەمیزاد دەکات و جۆرێك نییە لە ئەفسانەکان.

---

٥٦- کولنجوود: المصدر السابق، ص ٤٢.

٥٧- المصدر نفسه: مع نفس الصفحة.

بەلاّم زۆرکەس لەوانە کە بە مەسەلەی سروشتی مەعریفەی مێژووبینی تازەوە پێوەندیدارن هەتا ئێستاش رایان وایە، کە مێژوو بە زانست دانانرێت، چونکە مێژوو ناچێتە ژێر ئەو قانوونانەوە کە زانستەکان دەچنە ژێرباری و پێڕەوی دەکەن و، تاکە تاکەی حەقیقەتی مێژوو ئەو حەقیقەتە نییە، کە لە زانستەکانی سروشتدا هەیە.

چونکە زۆربەی ئەوانەی کە پشتی پێ دەبەستین، قسەی خەڵکە کە لە بارەی رووداوەکانی رابردووەوە دەیکەن و باسی خودی رووداوەکان نییە٥٨.

دەشبینین چەند بیرمەندێکی ئەڵمانی بەتایبەتی و چەند بیرمەندێکی فەرەنسی و ئینگلیزی لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگەکەدا، ئەو بیرمەندانەیان لەو بەرگە داماڵی کە بانگهێشتی " زانستبوونی" مێژوویان هەڵدەداو بیروباوەڕی لاواز و ساکاری ئەو بیرمەندانەیان نیشان دەدا، ئەوەش لە توێژنەوەکانی زمل (siemmel) و، ولهام دلّسای Dilthey و فیبڤەر و ریچی (Ricci) و کرۆچە (Croce) و بیرمەندانی دیکەدا دەردەکەوێت، ئەو توێژینەوانە لە هەڵوێستی "بە زانستبوونی" مێژوودا جۆرە تەنگانەیەکی پەیداکردو کون و کەلەبەری لە قالب و هەیکەلی مێژوودا دەرخست، نەك لە رووخاندنی بیروباوەڕی بە زانستبوونی مێژوودا، بەڵکو لە دیاریکردنی ماددەکەی و سنوورەکەشیدا تا وای لێهات، لە سەدەی نۆزدەمدا هەموو دروشمەکانی (بەزانستبوونی) مێژوو بوو بە پوولێکی قەڵب و بە دەستی خەڵکەوە دەساودەست دەکرا بەبێ ئەوەی کەس فرێی بدات و لێی رزگاربێت.

مەعریفەی مێژوویی هێشتا نە "گالیلۆ" ی خۆی دۆزیوەتەوە ، نە "ئاینشتاین"ی خۆی دیتووەتەوە، تا کلیلی دۆزینەوەکانی زانستە سروشتییەکانیان دەربخەن و بدەنە دەست ٥٩.

ئەوەتا یەك لە گەورە مێژوونووسەکانی فەرەنساو کە یەکێکیشە لە فەیلەسووفەکانی سەردەمی ستراکچرالیزم مێشال فۆکۆ (M.foucault) کە لە ساڵی ١٩٨٤دا کۆچی دوایی کردووە، دەڵێت: ئەو شتەی کە لە مێژوودا رۆڵ دەگێڕێت بۆ هیچ قانوونێك و هیچ پێداویستییەك ملکەچ ناکات و پێڕۆی ناکات، نەخێر، بەڵکو

---

٥٨- د. اسد رستم: مصطلح التأريخ، ط٣، بيروت ١٩٥٥، ص١١٠.

٥٩ - د. شاكر مصطفى ، بحثه المذكور، ص:١٨٩

بە پێچەوانەوە ئینتیمای بۆ دایەرەی ڕاڕایی و ڕێکەوتی ڕەهاو ڕووداوی سەیری (تاك) و بێ وێنە هەیە ٦٠.

فۆکۆ بەم قسەیەی لەگەڵ هزری فەیلەسووفێکی ناسراوی دیکەدا کە ریمۆن ئارۆنە و کتێبێکی بەناوی "پێشەکییەك بۆ فەلسەفەی مێژوو" داناوەو لە ساڵی ١٩٤٨ دا دەرچووە یەکدەگرێتەوە. ریمۆن ئارۆن لەو کتێبەیدا دەڵێت: "هیچ حەقیقەتێکی مێژوو یان هیچ واقیعێکی حازربەدەستی مێژوو نییە، پێش زانست کەوتبێت" ئینجا دەڵێت: "پێویستە لەسەر مێژوو بۆ جێگایەکی زۆر تەوازوع بکشێتەوە و واز لە ئاواتی بە زانستبوون بهێنێت "٦١. ئەم بۆچوونە لەگەڵ بۆچوونی گەورە فەیلەسووفی فەرەنسایی ئەمڕۆ" کلود لیڤی شتراوس (CLaud Levi Strauss) دا ،کە هەموو جیهان گەڕاوە و لە کۆمەڵگە جۆربەجۆرەکانی کۆڵیوەتەوەو رای خۆی لەسەر مێژوو ڕاگەیاندووە، یەك دەگرێتەوە. ئەم ڕای وایە، کە هیچ قانوونێك بە شێوەیەکی تەواو حوکمی مێژوو ناکات، بەڵکو مێژوو بریتییە لە ڕێکەوت وەك ڕێکەوتی گەمەی بەخت "ڕۆلێت" و "هەموو کۆمەڵە ڕووداوێکیش کتومت وەك کۆمەڵە یاری وایە. بەکەڵەکەبوونیان ئەنجامی زۆریان لێ دەکەوێتەوە. لەو حاڵەتانەشدا، ئەگەر لە گەمەی بەخت و چانسی مێژوویيدا "گەمەی دۆڕاو" دامەزرێنین ئەوە، حاڵەتی بێ ڕەواجی و نەزۆکیی شارستانییەتی لێ دەکەوێتەوە. گەمەی براوە بزووتنەوەی ئاوەدانی و گەشەکردنی شارستانییەتیەوە، گەمەی بەخت و چانس قازانج و زەرەریش لە ڕێگەیە، چونکە قانوون گەلی ڕێکەوتیان لەپێشە. مادامێکی مێژوو لە ڕووداوە پێشبینی نەکراوەکاندا خۆی حەشارداوە. کەواتە پێویستە هێڵی مێژوویی بە وردی بەدواداچوونی بۆ بکرێت و بەگوێرەی توانست هێڵی ڕەوت و پێچ و پەناو بادانەوەکانی بزانرێت.. بە

---

٦٠- فرانسوا دوس، میشال فوکو: الفیلسوف الملتزم ، مجلة (المنار) العدد(٢) شباط ١٩٨٥، پاریس ، ص١٥٦.

٦١- المصدر السابق.ص١٥٦.

بۆچوونی شتراوس ئەمەیە جیاوازیی جەوهەریی نێوان مێژووی بەڕێکەوت بارکراوی ئادەمیزاد و نێوان سروشتیدا، کە کەوتووەتە ژێر حوکمی حەتمییەت و پێویستییەوە.

لە زانستە سروشتییەکەدا تەنیا هێزی بنبڕ و کوێرانەی بێ هەستی (نا ئادەمیزادی) کاریگەرەو، قانوونە گشتییەکان دەردەکەون و هیچ ئامانجێکی بەهەستی بە ئاوات، وجودی نییە نە لەمەبەستە ڕووالەتەکان، نە لە کۆتایی ئەنجامەکانیشدا کە تەئکید لەسەربوونی ڕێکخستن لەناو ئەو مەبەستانەدا دەکات، بەلاّم لە مێژوودا مەسەلەکە بە تەواوەتی جیاوازە ٦٢.

لەمەوە بە تەواوەتی دەردەکەوێت کە ڕێبازی تەواوی هزری مێژوونووس لە هزری زانا (عالم) جیاوازە، چونکە مێژوونووسەکە سەرەتا مەبەستی لە تاکە تاکەی ڕووداوەکانی رابردووە، بەلاّم زاناکە مەبەست و ئامانجی ئەوەیە کە قانوونە گشتییەکان دابڕێژێت.

لەبەرامبەر ئەو ڕایەی کە مێژوو بە زانست دادەنێت و لەبەرامبەر ئەو بۆچوونەشدا کە داوا لە مێژوو دەکات لە بواری زانست خۆی بکێشێتەوە، چەندین ڕاوبۆچوونی دی هەن، کە شانوشەوکەتی مێژوو پێشێل دەکەن و بێ بەهای دەکەن و گرنگیی لەناو مەعریفەکانی ئادەمیزاددا کەم دەکەنەوە" ئەوەتا- پۆل ڤاین – (paul veyne) دەڵێت: مێژوو نابێت بە زانست٦٣.

(هنری فۆرد) یش ڕای خۆی لەبارەی مێژوو دەخاتەڕوو، دەڵێت:" مێژوو قسەی هەلەقوبەلەقەو بە زمانی ئینگلیزی(History is bunk)ی پێ دەکوترێ٦٤.

---

٦٢ _د. عبدالمنعم الحفني: المثالية والمادية وازمة العصر، طبعة المركز العربي للثقافة والعلوم، بيروت (بدون تأريخ) ص ٨٥.

٦٣_ د. محمود الطاليي: التأريخ ومشاكل اليوم والغد، مجلة (عالم الفكر) الكويت ، المجلد الخامس، العدد الاول، ص٤٤.

٦٤- الطالبی، المصدر السابق، ص ٤٨.

ڕۆژێکیان فۆرد، بە (ڕاوس) ی مێژوونووسی گوت کە: " مێژوو، هەر هەمووی بە کەڵکی هیچ نایەت "٦٥. پێش ئەویش فەیلەسووفی ئەڵمان نیچە (Nietzshe ١٨٤٤- ١٩٠٠) ڕایگەیاند کە "مێژوو مردووە" و ئەم مردنی مێژووەشی بە پێویست دانا بۆ ڕزگارکردنی ئادەمیزاد لەو بیروباوەڕەو وتی:" تام و بۆی بۆگەنیی شتە کۆنەکان گەمارۆی ئادەمیزادی داوە"٦٦.

کابرایەکیش کە گاڵتە بە مێژوو دەکات و قەشمەری بە ڕاستییەکانی دەکات، دەڵێت:" ئەگەر بەردیش بێتە زمان مێژوو هەمووی درۆی گەورەیە و هیچی دیکە".

سەیرەکەش لەوەدایە کە - هیگڵ (Hegel – ١٧٧٠-١٨٣١) یش دانەری کتێبی (فەلسەفەی مێژوو) ئەویش ڕایگەیاند و وتی:

" ئەو شتەی کە مرۆڤ لە مێژووەوە فێری دەبێت ئەوەیە، کە هیچ کەسێك هیچ شتێك لە مێژوو فێرنابێت"٦٧.

بە کورتی ئەو پێناسەی تەنگەبەرەی زانست، هەموو ئەو بابەتە زانستیيانە ناگرێتەوە، کە لێکۆڵەران بەبێ ناکۆکی بە زانستییان دادەنێن. لەبەرئەوە پێوەندیداران وای بە باش دەزانن کە زانست بە شێوەیەکی فراوانتر پێناسەبکەن و بڵێن: (زانست کۆمەڵێ حەقیقەتی ڕێکوپێکی ڕێکخراوە، بە بەرنامەیەکی تایبەتی لێکۆڵینەوەو پشکنین و تێبینی و ساغکردنەوە دەستکەوتووە و هەمیشە هەوڵ دەدات ڕێسا گشتییەکان بدۆزێتەوە و دەریان بهێنێت، واتا دۆزینەوەی ئەو قانوونانەی حوکمی ئەو دیاردانە دەکەن.

هەرچی مێژووە ئەوە بەردەوام هەوڵ دەدات بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێسا گشتی و قانوونانەی کە مێژوو دەجووڵێنێت و قانونەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگەکان دەبزوێنێت... بێگومان مێژوونووس ناتوانێت ڕووداوەکانی ڕابردوو کە نەماون و ئاسەواریان کوێربووەتەوە و دەنگوباسیان تەنیا لە پاشماوە مێژووییەکانی وەك ئاسەواریان کوێربووەتەوە و

---

٦٥- راوس: المصدر السابق، ص ٢٥.

٦٦- مجلة المنار العدد(١٠) لسنة ١٩٨٥، ص١٤٧.

٦٧- راوس: المصدر السابق، ص٢٥.

دەنگوباسیان تەنیا لە پاشماوە مێژووییەکان وەك، ئاسەوار و بەڵگەنامە نووسراوەکاندا ماوەتەوە ، ئەوانە هەمووی بگێڕێتەوە و بیانهێنێتەوە و ناشتوانێت، وەکو زانستەکانی ماتماتیك سوود لە تێبینی راستەوخۆ و بەڵگەی پەتیی عەقڵی وەربگرێت، بەڵکو لەو پاشماوانەی ئادەمیزاددا دەگەڕێت، کە بۆ زانینی ڕووداوەکانی ڕابردوو بەکاری دەهێنا. ئێمە ئەگەر مێژوو بە زانست دابنێین، دەبێت بە وردی وەسفی مێژوو بکەین و بڵێین: مێژوو لە زانستەکانی بەڵگەنامەیە (Ducumencary sciences) وەك ئینجلۆ و سینوبۆس وەسفی دەکەن. بەڵام قانوونەکانی ئەم زانستە هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو وردبینییەی کە زانستە حەقیقییەکان (Exact sciences) پێیگەیشتوون، نەخاسمە لە توانستی چاودێری و پێشبینیدا.٦٨ لەبەرئەوە پاسمۆر (pasmore) لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ژێر ناونیشانی "مەوزوعییەت لە مێژوودا" کە لە گۆڤاری (philosophy) ی ساڵی ١٩٥٨ دا بلاّوی کردووەتەوە ڕەخنە لە بیروبۆچوونی بەراوردی زانستی سروشتی لەگەڵ مێژوودا دەگرێت و دەڵێت:" بەراوردی دروست و ڕاست ئەوەیە کە لەگەڵ دەروونناسی و زانستی کۆمەڵایەتیدا بەراورد بکرێت"٦٩.

هەرچی پۆل ڤالیرییە (paull valery) ئەوە ئەو رای خۆی لە ڕۆڵی وروووژێنەری مێژوودا ڕاگەیاند و بە ڕەشبینییەوە وتی:" مێژوو ترسناکترین بەروبوومی کیمیای زەینی مرۆڤە و خەیاڵی دەرووژێنێت و گەلان مەست دەکات و یادەوریی خەیالاّوییان لەلا دروست دەکات و کاردانەوەیان لە لا تیژتر دەکات و برینی کۆنیان تازە دەکاتەوە و ئیستراحەتیان لێ دەبڕێت، وایان لێ دەکات وڕێنە بە شانازی یان بە چەوساندنەوە بکەن. میللەتان وەها لێ دەکات، کە هەست بە ژیانی ترش و تاڵی یان بە عەجاییبان بکەن و وەهایان لێ دەکات، کە نەتوانن شانازیکردنیان بە خۆیانەوە قبووڵ بکەن٧٠.

---

٦٨- طه باقر، و د. عبدالعزيز حميد: طرق البحث العلمي في التأريخ والاثار، طبعة جامعة الموصل ، ١٩٨٠، ص١١ -١٢.

٦٩- وولَش: المصدر السابق، ص ٢٣٢.

٧٠- د. محمد الطالبي: المصدر السابق، ص ٣٤.

لەبەرئەوە بیرکردنەوە لە کۆمەڵگە یان لە ئادەمیزاد زەحمەتە بیرکردنەوەیەکی "بابەتییانە" یان بیرکردنەوەیەکی "بێلایەن " بێت، بە هیچ جۆرێك وەك مەزوعییەت و بێ لایەنیی پەتیی زانست نابێت، چونکە لێکۆڵەری مێژوو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ناوەندی کۆمەڵایەتیی ئایین و چینەوە، ئەم حوکمە ئایدیۆلۆژییانەش کە لەوە پەیدادەبن، کاردەکەنە سەر چۆنێتی حوکم و گریمانەکانی و کاردەکەنە سەر ئەو ماناو بەرنامانەش کە بەکاریان دەهێنن سا پێ بزانێت یان نەزانێت و ئاگای لێ نەبێت، بەڵام بەهەر شێوەیەك بوویێت دەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە بەبێ هیچ گفتوگۆیەك. پاشان بڕوا بەو مێژووە ناکرێت کە دەیدۆزێتەوە، بەڵکو ئەو بڕوا زانستییە مۆرکێکی ڕێژەیی یان نیمچەیی بەردەوامی لێ دەنیشێت. جا لێرەوە ئیدی زەحمەتیی لایەنگیری زانستە کۆمەڵایەتیەکان پەیدادەبێت، نەخاسمە مێژوو ئیدی گومان لە ئەنجامەکانیشی دەکرێت و بە زەحمەتیش قانوونگەلێك دەدۆزرێنەوە، کە مۆرکی زانستی پێوەبێت و بە گشتیش ڕای لەسەر بدرێت.

گومان لە "بەزانستبوونی مێژوو" پاڵی پێوەنا کە سوود لە بەرنامەڕێژی و هۆکارەکانی زانستی پەتی وەربگرێت و کەموکورتییەکانی پێ داپۆشێت یان چارەسەریان بکات"٧١.

چونکە مێژوو شێوەیەکی ناگونجاوی تاقیکردنەوەیە و ناتوانێت بگاتە پلەیەکی وجود یان حەقیقەت. وەك بوزانگیر(Bosanguet) لە کتێبەکەی خۆیدا (پرەنسیپەکانی تاك و بەهاکانی) دا باسی دەکات٧٢.

لێرەدا پێم خۆشە ئەو بەڵگانەش پیشان بدەین، کە لایەنگرانی "بەزانستبوونی مێژوو" پشتی پێ دەبەستن. ئەوان وەهای بۆ دەچن کە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی هەندێ خەسڵەتی لێکۆڵینەوەی زانستیی هەیە و پشت بەم بیانوو و بەڵگانەی خوارەوە دەبەستن:

یەکەم: لێکۆڵەری مێژوو کێشەیەکی دیاریکراو بۆ لێکۆڵینەوەکەی دیاردەکات، ئینجا گریمان و ئەو پرسیارانەش دادەنێت، کە پێویستە وەڵامیان بداتەوە، بەیاننامە و

---

٧١_ د. عبدالعليم محمد: التراث بين الاصولية والعلمانية ، بحث في مجلة (المنار) العدد (٥٠) شباط١٩٨٩، پاريس ، ص٩٥.

٧٢_ وولَش: المصدر السابق، ص١٤.

زانیارییە سەرەتاییەکانیش کۆدەکاتەوە و شیکاریان دەکات و گریمانەکەی تاقی دەکاتەوە تا بزانێت لەگەڵ بەڵگە و دەلیلەکەیدا ڕێك دەکەون یان ڕێك ناکەون، پاشان ئەنجامەکانیش دادەنێت.

دووەم: وێڕای ئەوەش کە زانای مێژوو لەوانەیە هیچ ڕووداوێکی دیاریکراوی نەدیبێت، هەروەها یەکە و ڕاست لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەیاننامەکانیشی کۆنەکردبێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا شاهێدییەکی زۆری ئەوانەی بە دەستەوەیە کە لە ڕووداوەکەدا ئامادەبوون و بە چاوی خۆیان ڕووداوەکەیان لە هەموو لایەکییەوە دیتووەو لەوانەشە ڕووداوەکانی پاش ئەو زانیاریی تازەمان بدەنێ، کە بینەرە هاوچەرخەکانی نەیان دیتووە.. کەواتە زانای مێژوو بەڵگەکەی پابەند دەبێت بە شیکاریی ڕەخنەییەوە بۆ ئەوەی بزانێت، کە ئەسڵ و ڕاستگۆ و دروست و وردە.

سێیەم: کاتێك زانای مێژوو ئەنجامەکانی دەخوێنێتەوە، ئەو ڕێسایانە بەکاردەهێنێت کە لەوە دەچێت وەك ئەوانە وەهابن، کە زانایانی سروشت بەکاری دێنن.

چوارەم: وێڕای ئەوەش کە زانای مێژوو ناتوانێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵی گۆڕاوەکان بکات، ئەم کەموکورتییە تەنیا بەرنامەی مێژوویی ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو توێژینەوە رەفتارییەکانیش دەگرێتەوەو لێکیان جیادەکاتەوە نەخاسمە ئەوانەی بەفیعلی کە توێژینەوەی تاقیگەییان تێدا بەکارناهێنرێت، بە نموونە وەك زانستی کۆمەلایەتییەکان sociology ، زانستی سیاسەت politic ، دەروونناسی psychology و، ئابووری Economy و زانستی دیکە[73].

وابزانم هێشتا پرسیارەکانمان یەکلانەکردووەتەوە، قسەکانمان لەسەر ئەم مەسەلەیە درێژەی کێشا، لەوانەیە چەند ڕێگرێك هەبن "لەبەرامبەردا" نەیانهێشتبێت مێژوو بخەینە سەر زانستەکان، چەند ڕاوبۆچوونێك هەیە وەکو دیتمان لەبارەی چالاکییەکانی توێژەری مێژوو، ئایا کۆششەکانی بە کۆششی زانستی لە قەڵەم دەدرێن؟ جا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم

---

٧٣ د. احمد بدر: اصول البحث العلمي و مناهجه، طبعة وكالة المطبوعات الكويت، ط٤، ١٩٧٨، ص١٣٨.

پرسیارانە و بۆ پیشاندانی جیاوازیی نێوان سروشتی مەعریفەی مێژوویی و نێوان سروشتی زانستی پەتی لە پێشەوە باسی ئەم جیاوازیانە دەکەین:

یەکەم: یەك لە مەبەستەکان و ئامرازەکانی زانست پێشبینییە، بەلاّم لێکۆڵەری مێژوو هەمیشە ناتوانێت لەسەر ئەساسی رووداوەکانی رابردوو گشتاندن (Generalizc) بکات، چونکە رووداوەکانی رابردوو، لە زۆر حاڵەدا، پلانی بۆ دانەنرابوو، یان بە گوێرەی پلانەکەی گەشەی پێ نەدرابوو، چونکە هۆکاری دیکەی زۆر هەبوون نەدەتوانرا کۆنترۆڵ بکرێن، هەروەها کاریگەریی یەك هۆکار، یان ژمارەیەکی کەمی خەڵك مەسەلەکەی یەکلادەکردەوە، لەبەرئەوە نموونەکەو هەموو هۆکار و کردەکانیشی ئیدی دووبارە نابنەوە.

دووەم: توێژەر ، پێویستە پشت بە تێبینییەکانی کەسانی دیکە ببەستێت. زۆر جاریش لە پاکی لێهاتوویی ئەو شاهێدانە دەکەوێتە سەر شك و گومان، چونکە شاهێدەکان هەموویان وەك یەك نین و جیاوازن مانای ئەوەش، ئەوەیە کە مەوزوعییەت لە توێژینەوەی مێژوودا مەسەلەیەکی گوماناوییە و جێگەی بڕوانییە.

سێیەم: توێژەری مێژوو زۆر لەو کەسە دەچێت کە بە پێکەوەلکاندنی وێنەیەکی پارچە پارچە کراوەوە خەریکە و دەیەوێت هەموو پارچەکان پێکەوە بلکێنێت و بزانێت کێیە، بەلاّم پارچەکان تەواونییە و زۆریان دیار نین و هیچ بەڵگەیەکیشی بەدەستەوە نییە، کەواتە توێژەر پێویستە لەسەری (هەوڵ بدات) و بەتالاّیی وێنەکە بە مەزندەی خۆی پڕ بکاتەوە و بزانێت هۆی رووداوەکە چییە. لەوانەیە کەسێکی دیکەی لێ پەیدابێت، ئەویش هەر وەکو کەسی یەکەم بکات، بەلاّم بە شێوەیەکی جیاواز.

چوارەم: مێژوو لە جێگایەکی داخراو سیستەمێکی داخراوو کارناکات، وەکو ئەوەی کە لە تاقیگەی زانستە سروشتییەکان و وەرزشی مێشکدا (ماتماتیکدا) ڕوودەدات. توێژەری مێژوو ناتوانێت کۆنترۆڵی هەلومەرجەکانی تێبینی بکات و ناشتوانێت گۆڕاوە گرنگەکان و بەڵگەدارەکان وەربگرێت٧٤.

---

٧٤ _د. احمد بدر: المصدر السابق ، ص ٢٣٧- ٢٣٨.

پێنجەم: ڕووداوەکانی مێژوو بەکات وشوێنەوە بەستراون، ڕووداوەکانی لە چاخێك و جێگەیەکی دیاریکراودا ڕوویان داوە، ئەگەر ئەم دوو هۆکارە، واتا ئەگەر ئەم دوو رەگەزە لە ڕووداوەکان بستێنینەوە، ئەوا خەسڵەتی مێژوویی نامێنێت و ناتوانرێت هیچ سوودێکیان لیّ بەدەست بێت، مەگەر لە سنوورێکی تەنگی "نامێژووییدا" هەروەکو رووداوەکانی — فۆلکلۆر- کە نازانین چاوگەکانیان لە کوێیەو هی کێیە؟! ئەم دوو رەگەزەش. واتا زەرووری لە زانستی پەتی دا هەبن٧٥.

ئەم کۆششە بەردەوامەی کە بۆ دانانی مێژوو لە خانەی "زانستەکان"دا دەدرێت، مەسەلەی (سروشتی مەعریفە و زانینی مێژووی یەکلانەکردووەتەوە. وێڕای ئەوەش کە لە مێژوودا بۆنی ئاین و وردە زێرمان لە ئەدەب و هونەری نووسین دا دیت و پاش ئەوەش ئامادەیمان بۆ نووسینی بە داڕشتنێکی ئەوتۆ کە هیچی لە داڕشتنی بیرۆکە زانستییەکان کەمتر نییە، دیت، سەرباری ئەوەش لێکدانەوەی ڕووداوەکانی بە لێکدانەوەیەکی زانستییانە کوا؟ کە پێی دەڵێن"فەلسەفەی مێژوو" بەپێی بیرۆکەی ئەو ڕووداوانەو لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا مێژوو ڕایدەگەیەنێت کە نە ئایینە و نە ئەدەبە و نە زانستیشە.

## مێژوو و فەلسەفە:

ئەوەمان لەسەرماوە بڵێین کە مێژوو دەکرێت لە خانەی مەعریفەی فەلسەفەدا دابنرێت. با بزانین فەلسەفە چییە؟

لە پێناسەکردنی فەلسەفەدا درێژە بە قسان نادەین، بەڵام پێویستیشە لەسەرمان شتێك لە بارەی فەلسەفەوە باس بکەین و بزانین زۆر بە کورتی مانای چییە.

---

٧٥_ ايمانوئيل كنت: (التأريخ العام)ضمن (النقد التأريخى)ترجمة: د. عبدالرحمن بدوى، وكالة المطبوعات، الكويت، ط٣، سنة ١٩٧٧، ص ١٦٧- ١٦٩.

فەلسەفە بەوە پێناسەکراوە، کە لێکۆڵینەوەیەکی بەردەوامی بوونە نەخاسمە بوونی خودی ئادەمیزاد، ئەوەش بە هۆی عەقڵ و زانین سوودی ئەم بوونە و لێکۆڵینەوەی ئەم بوونە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە پشت بەبڕوای پێشتر نەبەستێت.

وشەی (فەلسەفە) لەبنجدا گریکییە، مانای (خۆشویستنی حیکمەتە) بەمەش واتا فەیلەسووف گیرۆدەی حیکمەتە (philosophos). دەڵێن فەیلەسووفی گریك — شیشەرون — لە زەمانی خۆیدا داواکارو چاکساز هەبوون ناوی خۆیان نابوو، یان خەڵکی ناوی لێ نابوون " گیرۆدەکانی حیکمەت"٧٦.. ئەفلاتوونیش (plato ٤٢٧- ٣٤٧ پ.ز). پێناسەی فەلسەفە دەکات و دەڵێت: "فەلسەفە کۆششی دۆزینەوە و زانینی حەقیقەتە". لە کتێبەکەی خۆیدا:" کۆمار" دەڵێت: فەیلەسووف ئەو کەسەیە بە تەواوی حەزی لە حیکمەتەو حیکمەت هەموو عەقڵی داگرتووە".

ئەرستۆی قوتابی ئەفلاتوونیش (Aristotle ٣٨٤- ٣٢٢ پ.ز) دەڵێت: فەلسەفە بیرۆکەیەکی زانستییە بە ئەسڵییەکانی هەموو شتێکەوە خەریکە و گرنگییان پێ دەدات" کاتێکیش لە بارەی فەیلەسووفەکانەوە لە (سوکرات یان پرسی (Socrates ٤٦٨- ٣٩٩ پ.ز) وەڵامی دایەوەو وتی:" فەیلەسووفەکان ئەوانەن کە حەز بە دیتنی حەقیقەت دەکەن".

ئامانجی فەلسەفە ئەوەبوو کە لە هەموو شتێکدا بە دوای حەقیقەت دا بگەڕێت.

لەم چاخە تازەیەشدا، فەلسەفە وەها پێناسەکراوە، کە:

" زانینی چالاکیی ئادەمیزادە و ئامراز و ئامانجەکەشی، هەر ئادەمیزادە ٧٧ و عەقڵ لە ترس رزگار دەکات و وەڵامی پرسیارەکانی ئادەمیزاد دەداتەوە و بیرکردنەوە قووڵ دەکاتەوە و ئەگەریش بە بەرنامە بخوێندرێت، هەموو بەربەستەکان تێپەڕدەکات".

---

٧٦_ د. عرفان عبدالحميد فتاح، المدخل الى معاني الفلسفة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد ١٩٨٦، ص ٣٧.

٧٧ -د. فؤاد زكريا: الفلسفة والدين في المجتمع العربي المعاصر، طبعة مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٨٥، ص٤٣.

جا لەو دەقانەوە، دەتوانین بڵێین کە زاراوەی فەلسەفە لە ئەسڵدا، بۆ ئەوە دانراوە کە مەعریفەی خەسڵەت دیارکراوی ئادەمیزاد بزانێت. لەم خاڵانەی خوارەوە ئەو خەسڵەتانەی دەخەینەڕوو:

أ — فەلسەفە، مەعریفەیەکە مۆرکی تەنیایی و پەتی و پاکیی پێوەیە، واتا نیشانەی پەتی و دەستپاکیی پێوە دیارە و نابێت بۆ ئامانجگەلی ئایینیی یان ماددیی دنیا (دنیویە) بخرێتە کار، بەڵکو ویست و ئارەزووی ڕەگداوتاوی نەفسی ئادەمیزاد بە دوایدا دەگەڕێت، لەبەرئەوە مەبەستی زاراوەی فەلسەفەیان بەوە لێکداوەتەوە، کە مەبەست لەو زاراوەیە:"ئارەزوویەکی سروشتی پاکژی نەفسی ئادەمیزادە بۆ بە دوادا گەڕانی مەعریفە".

ب- هۆی گەڕان بە دوای ئەم مەعریفەدا، مەسەلەیەکە لە نەفسی خودی ئادەمیزاددا، یان بە هۆی ئارەزووی بەدواگەڕانی فیکری (حب الاستطلاع الفکری) یان بە هۆی هەستی سەرسامییەوە (wonder) لە دیاردە سروشتییەکان و لە کۆمەڵگەو هاوسۆزی و هاودزینی ناو کۆمەڵگەو مەسەلەی یەکێتی و یەکنەبوون و هاوشێوەیی و هاودژی و حەزکردن لە زانینی حەقیقەت، لەوانەوە سەرهەڵدەدات و پەیدادەبێت.

ج- فەلسەفە کۆرپەی سەرنجی ڕەخنەگرانەی عەقڵە و هزری ڕەهای ئازادییە (Liberety of Thought) فەلسەفە لەگەڵ هیچ مەزەبێکدا نییە و پشتگیری لە هیچ ڕاوبۆچوونێك لە هیچ کۆمەڵ و تاقمێك ناکات، بەڵکو مەعریفەیەکی عەقڵییی ڕووت و پەتییە (pure rational knowledge) و کۆششێکە بۆ لێکدانەوەی گەردوون و دیاردەکانی گەردوون و بۆ لێکدانەوەی ئادەمیزاد و هەڵبژاردەکانی ئادەمیزاد و بۆ مێژووی ئادەمیزاد و هۆی ڕووداوەکانی ئەو مێژووە، کەواتە لەسەر ئەو ئەساسە، فەلسەفە لە دژی مەعریفەی (دۆگماتیزم) (Dogmatism) کە دەسەلاتەکانیان لە سەرچاوەیەکی ئایینی یان لە سەرچاوەیەکی دەرەکی وەردەگرن، دەوەستێنت.

د- فەلسەفە لە شایانی دەربڕینی دەگەڕێ، بە دوای لێکدانەوەی ڕوون و ئاشکرادا دەگەڕێت، بە دوای ڕاستگۆییدا وێڵە و بۆ ئەوەش بەرنامەی دڵنیایی و هێنانەوەی بەڵگە پەیڕەو دەکات، واتا سەیری هەموو نیمچە بەشەکانی دەکات و پاشان بیرۆکەی قەناعەتهێن و پرەنسیبی گشتی دەردەهێنێت و هەموویان دەگشتێنێت و بلاویان دەکاتەوە. جا لەسەر ئەم

ئەساسە، مەعریفەی فەلسەفی — لەم لایانانەوە، بووە بەلگەیەکی مەعریفەی زانستیی رووت و پەتی و گشتاندن و ڕێگای قوولبوونەوە و هەلێنجانی حەقیقەت پەیڕەو دەکات[78].

جا فەلسەفە، لەسەر ڕۆشنایی ئەو باسانە و بەقسەی کارل یاسپرز (K.Jaspers ١٨٨٣-) پال بە ئادەمیزادەوە دەنێت — بەو حسابەی کە بوونەوەرێکی عاقلە — کە عەقلی خۆی بەکاربهێنێت، یەك لەو شتانەش کە دەکەونە دەرووپشتی ئادەمیزاد، مێژووی ئادەمیزادە.

جا لەبەرئەوەش کە سروشتی مێژوو "تایبەتە "و وەکو باسیشمان کرد — لە سروشتی باقیمەنی مەعریفەکانی دی، ناچێت ناچار توێژەری مێژوو لە دوو ڕێگاوە ڕووبەڕووی مێژوو دەبێتەوە: یەکەمیان مەسەلەی بەرنامەیە و دووەمیان مەسەلەی لێکدانەوەیە (التفسیر). توینبی (Toynbee ١٨٨٩ — ١٩٧٥) دەلێت: یەکەم ئامرازی لێکۆلینەوەی مێژوو ئەوەیە، کە بە دوای حەقیقەتەکاندا بگەڕێت و تۆماریان بکات، دووەمیشیان ئەوەیە کە ئەو حەقیقەتانە بەهۆی قانوونە گشتییەکانەوە روون بکاتەوە، ئەو قانوونانەی بە پشکنینی بەراوردی ئەو حەقیقەتانە پەیدادەبن[79].

لەبارەی مەسەلەی یەکەم، بناغەکەی ئەوەیە کە توێژەر، سەرچاوە سەرەکییەکان و لاوەکییەکان، و بزانێت و چیرۆکەکان لە هەموولایەکیانەوە بداتە بەر ڕەخنە و ڕاست و دروستەکانیان هەلبژێرێت و حەقیقەتەکان بسەلمێنێت و ڕووداوەکان تێکهەلکێش بکات، ئەگەر هەندێ لە چیرۆکەکان دیارنەبوون و نەبوون، بۆ خۆی عەقلی خۆی تێدا بخاتە کار و پاشانیش حەقیقەتەکان بخاتەڕوو، واتا بەرنامەکە لێکۆلینەوەی یان خوێندنی مێژووەکە وەها لێ دەکات کە بەپێی ڕێسای زانستی لەسەر ڕێککەوتوو (المتفق علیها) بڕوات. جا لەم ڕووەوە مێژوو دەبێتە زانست، بەلام تەنیا لە رووی ئەو بەرنامەیەوە دەبێتە زانست کە بۆ لێکۆلینەوەکەی پێڕەوکراوە، واتا مێژوو لە رووی توانستی توێژەرەکەوە بۆ دەرهێنانی حەقیقەتەکان و خۆ دوورخستنەوە لە لایەنگیری و نەهێشتنی ڕای پێشوەخت، دەبێتە زانست،

---

٧٨ _ د. عرفان: المصدر السابق، ص ٣٩- ٤٠.

٧٩ _ ارنولد توینبی : بحث في التاريخ. ترجمة: الاستاذ طه باقر، مطبعة التفيض، بغداد ١٩٥٥، ج١، ص٦٣.

واتا ئەگەر خودی مێژووەکە نەیویست ببێتە زانست یا توێژەرەکە ببێتە زانا. ئەمەش ڕەنگە مێژووەکە لانی کەم لەم لایەنەوە بکات بە زانست.

بەڵام لەبارەی مەسەلەی دووەم، واتا لەبارەی "مەسەلەی لێکدانەوە" ئەوە تەماشاکەر بۆ ناسینەوە سروشتی مەعریفەی مێژوویی هیچی بە دەستەوە نامێنێت لەوە زیتر کە مەسەلەی مێژوو هەواڵەی فەلسەفە بکات. جا بە هۆی فەلسەفەکەوە دەتوانرێت لەقانوونەکانی مێژوو بگەین — ئەگەر قانوونی هەبێت مادامێکی فەیلسوفەکان خۆیان حەزدەکەن حەقیقەتەکە ببینن و لە هەموو شتێکدا هەر بۆ حەقیقەت دەگەڕێن. وابزانم فەیلسووفی ئینگلیز — بێرتراند رسل ( Bertrand Russell ١٨٧٢-) لە پیشاندانی مانای فەلسەفەدا، بە شێوەیەکی روونتر و ئاشکراتر، ڕایگەیاندو وتی: ئێمە لە دوو لایەنەوە لە فەلسەفە دەڕوانین: یەکەمیان لایەنی ئایینی و ڕەوشتی میراتە و دووەمیان لێکۆڵینەوەی زانستییە. بەوەش فەلسەفە پێگەیەکی مام ناوەند لە نێوان لاهوت و زانست داگیردەکات، لە لاهوت دەچێت لە ڕووی ئەوەی، کە لەسەر ئەساسی ڕامان لەو بابەتانەی کە هێشتا نەگەیشتوونەتە رادەی دڵنیایی و یەقین دامەزراوە، لە زانستیش دەچێت لە رووی ئەوەی کە زۆرتر لەگەڵ عەقڵدا دەدوێت و تەعامول دەکات و ئەوەندە لەسەر مەسەلەی بڕوا پێ داناگرێت. لەبەرئەوە (ناوچەیەکی ئازاد) لەنێوان ئایین و زانستدا هەیە، ئەویش (ناوچەی فەلسەفە) یە. لەبەرئەوە پێویستە مێژوونووس بە لێهاتوویی بەرنامەی نووسینی خۆی دانەکوێت، کە لێهاتووییەکی زۆر گرنگە، بەڵکو پێویستە لەسەری لە بنچینە زانستییەکان بکۆڵێتەوە، کە لێکدانەوەکەی لەسەر داناوە، واتا پێویستە لەسەری نە بێتە تەنیانەبێت بە مێژوونووس، بەڵکو پێویستە ببێت بە فەیلەسووفیش[٨٠].

بەڵام ڕای کرۆچە ئەوەیە هەردوو مەسەلەکە پێکەوە دەبەستێتەوە و بەیەك مەسەلەیان دادەنێت. بەڵام دەیانکات بە دوو لەت، دەڵێت:" مێژوو یەك ئیشی هەیە، ئەویش گێڕانەوە و حیکایەتی حەقیقەتەکانە ئەوەش کە ناویان ناوە بە دواداچوونی هۆکارەکانی ئەو حەقیقەتانە، لە پشکنینی وردی ئەو حەقیقەتانە زیاتر نییە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێوەندیی نێوان حەقیقەتێك و

---

٨٠- کولنجوود: المصدر السابق، ص٤١.

حەقیقەتێکی دیکە ٨١، بە نموونە فەلسەفەی مێژوو وەك پێوەندیدارانی مێژوو بەکاریان هێناوە، مانای تەعامول کردنی پڕ لە ڕامانە بۆ هەموو مێژوو، واتا چارەسەرکردنی مێژووە، کە ئومێد وابوو نهێنی مێژوو بەیەکجارەکی و هەتا هەتایە بدۆزێتەوە ٨٢.

کەواتە (فەلسەفەی مێژوو) وەك قانوون یان وەك ئەو زانستەی لێهاتووە، کە مێژوو بە شێوەیەکی بابەتی لە ڕێگای لێکدانەوەی (زانستی ) یەوە کە خودی بیرۆکەکەی خۆیەتی یان بڵێین کە خودی (هاوکێشەکانی) خۆیەتی دەبێت بە زانست. وەلێ کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە مێژوو یەك بیرۆکەی نییە، یان یەك هاوکێشەی نییە یا ڕای ڕەتکردنەوە نەبێت، وەك ئەوەی لە زانستە پەتییەکاندا هەیە، بەڵکو مێژوو (بیرۆکە) و (قانوونگەل) و (هاوکێشەگەلی) هەیە، کە یەك لەگەڵ یەکدا گوزەران دەکەن و بەپێچەوانەی زانستەکان، چونکە بیرۆکەی تازە بیرۆکەکەی پێش خۆی تووڕهەڵ دەدات و جێگاکەی دەگرێتەوەو دوو بیرۆکەی دژ بە یەکتری پێکەوە گوزەران ناکەن.

لەبەرئەوە، فەلسەفەی مێژوو لەوە زیاتر کە (ڕاوبۆچوون) بێت هیچی دیکە نییە ، هەروەکو ڕاوبۆچوونی جیاوازی سسیاسەتمەداران لەسەر یەك مەسەلە وەهایە. ئایا مێژوو سیاسەتی دوێنێ نییە؟ سیاسەتیش مێژووی سبەی نییە؟ کرۆچە دەڵێت: " دەبێت تەنها مێژوونووسان فەلسەفە بنووسن" دەشیتوانی بە پێچەوانەی ئەوەش بڵێت:" مێژوو دەبێت تەنها فەیلەسووفەکان بینووسن.

## فەلسەفە چی لە مێژوو کرد؟

فەلسەفە، چی بەسەر مێژوو هێنا؟ یان، فەلسەفە چۆن چۆنی بووە ئەو زانستەی، کە مێژوونووسان ڕێگای خۆیانی پێ دەبینن بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی مێژوو؟

---

٨١ - کولنجوود: ص ٣٣٨.

٨٢ - وولش: ص ١٢.

فەلسەفەی مێژوو وەك وەلاٚمێك بۆ ئەو پێداویستە شارستانییەتییە حەقیقیانە هاتووە، کە لە کۆمەڵگەدا هەیە، بۆ ئەوە هاتووە کە وەلاٚمی ئەم پرسیارە گرنگە بداتەوە: بۆچی ئەوەی رووی دا، رووی دا؟ وەك بزانین، فەیلەسووفی فەرەنسی ڤۆلتێر یەکەم کەس بوو وشەی ئاوێتەی(فەلسەفەی مێژوو) ی بەکارهێنا، مەبەستیشی ئەوەبوو هەموو ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی شیکار و ڕەخنە و زانستی بخاتە بەرچاو.

روونتر بڵێین مەبەستی ڤۆلتێر لە فەلسەفەی مێژوو جۆرە بیرکردنەوەیەك بوو، مێژوونووس بە پێوەرەکانی عەقڵ پابەند بێت، نەك پشت بە وانە ببەستێت کە لە کتێبە کۆنەکاندا هاتووە[83].

فەیلەسووفەکانی مێژوو، نەیاندەویست لێکۆڵینەوەی مێژوو تەنیا ببێت بە کۆمەڵێ جەنگ و شەڕ و پەیماننامەی سیاسی و ڕووداوگەلی یەك لە دوای یەك بەبێ ئەوەی قووڵایی و هۆکاری ئەو ڕووداوانە دەربخەن، جگە لەوەش ئامانجیان ئەوەبوو لێکۆڵینەوەی مێژوو لە مێژوویی سیاسی و سەربازییەوە بگۆڕن و بیکەن بە فەلسەفەی ئاوەدانی، ئیشی سەرەکیی فەلسەفەی شارستانییەتیش ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی مێژوو نەك تەنیا بۆ باس و خواسی مەلیك و ڕەوشی حوکم بەدەست و باسی ڕۆژانەی کۆشك تەرخان بکرێت، بەڵکو دەبێ جێگای شتی گرنگتری وەك بەدواداچوونی ڕەوشی عەقڵی ئادەمیزادو بەدواداچوونی ئەو هۆکارانەی کە دیاردەی بزاڤی مرۆڤ ئاراستە دەکەن. ئەمەش مانای وایە کە ئەسڵی فەلسەفەی مێژوو بریتییە لە حەز و ئارەزووی ئادەمیزاد بۆ دۆزینەوەی وەلاٚمی لێکدانەوەی ڕووداوە سەرسامکەرەکان و هزری، چانس chance ڕێکەوتی رەتکردەوەو بەهێزی بزوێنەری کۆمەڵگە و مێژووی لە قەڵەم نەدا[84]. زۆریش هەوڵی دا کە قانوونی لێکدانەوەی هۆی ئەو ڕووداوانە بدۆزێتەوە، چونکە ئەگەر ڕێکەوت بەهۆی ڕووداوەکان دابنێت، ئەوە مانای وایە لێکدانەوەی هۆی مێژوو یان فەلسەفەی مێژوو لە کوێ دەستی پێکرد، هەر لەوێ کۆتایی دێت، چونکە ئەگەر ڕاست بێت، کاروباری ئادەمیزاد کەوتبێتە ژێر ڕووداوگەلی بێبەرو بەرەوە، ئەوا هیچ پێویست ناکات مێژوو ناوی فەلسەفەی لێ بنرێت.

---

٨٣ کولنجوود: ص٣٠.

٨٤ ـینظر الی: کتاب محمود امین العالم: فلسفة المصادفة ، مکتبة الدراسات. الفلسطینیة ١٩٦٩.

گەورە مێژوونووسان و فەیلەسووفەکانی مێژوو ڕەخنەیان لەم هزری ڕێکەوتە گرتووە. تۆینبی ڕەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت: "ئەو ئیشەی ئادەمیزاد لە مێژوودا دەی کات، وەك ئەو ئیشە نییە بەرۆژ بیرێسی و بەشەو هەڵیوەشێنتەوە هەروەها مێژوو ئەو ئاسیاوەش (**طاحونه**) نییە، کەوتبێتە دەس چەند شتێك، بەبێ هیچ ئامانجێك و تەنیا بۆ ئازاردانی خۆیان هەلێ سوڕێنن٨٥.

لەوەش زیاتر کەسانی دیکە هەن وای بۆ دەچن، کە ئەوەی لە مێژوو دەقەومێت دەکرێت پێشبینی بکرێت، ئەگەر بە وردی سەیری ڕووداوەکان بکەین و لەو هەلومەرجەش بکۆڵینەوە کە دەور و خولی ئەو ڕووداوانەیان داوە، ئەمەش مانای وایە کە لێکۆڵەری مێژوو دەتوانێت حوکمگەلی هەمووەکی ئەوتۆ پێشکەش بکات. هێند هەمووەکی و گشتگیربێت بتوانێت پێشبینی ڕووداوەکان بکات. ئەم پێشبینییەش لە کاتێکدا ڕوودەدات، کە وەها دابنێین چەند قانوونێکی گشتی هەن، حوکمی مێژوو دەکەن و بە کەڵکی بەرکارخستنیش دێن، ئەوانەش ئەو قانوونانەی کە بە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی ئیمپریقی (Empiricism) نەبێت نادۆزرێنەوە. (لێکۆڵینەوەی ئیمپریقی = لێکۆڵینەوەی تاقیکردنەوەی مەیدانی).

پێشەنگەکانی مەزەبی زانستبوونی مێژوو بە نموونە وەك وەزعییەکانی و مارکسی و تاقیکردەبییەکان، رایانگەیاند، کە دەتوانرێت ئەم قانوونە هەمووەکییانە بدۆزرێنەوە کە بەهۆیانەوە پێشبینی دوارۆژ دەکرێت لەو ڕێگەیەوە کە توێژینەوەکانی مێژوو (مباحث التأريخ) بخرێتە ژێر رکێفی بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە و پشت بە تێبینیش ببەسترێت. بەڵام مەرج نییە تێبینییەکان یەکەو ڕاست بن، چونکە بزووتنەوەی بەردەوامی مێژوو ڕێگە نادات بە مێژوونووس بەرنامە تاقیکردنەوەکانی

---

٨٥ _توينبي: بحث في التاريخ ، ج٢، ص ١٢٥ .

- د. صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٦٤.

- ادواردكار: ماهو التاريخ، ص٨٥.

بە تەواوی بخاتە کار. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو فەیلەسووفانە سووربوون لەسەر بیرۆکەی دۆزینەوەی قانونەکانی بزووتنەوەی کۆمەڵگە و داوایان لە مێژوونووسان کرد کە بە شوێن ئەو قانوونانەدا بگەڕێن و بیاندۆزنەوە، هەروەکو چۆن چۆنی زانایانی سروشت قانوونەکانی بزووتنەوەیان لە تەنە سروشتییەکان و ماتماتیك و گەردووندا دۆزییەوە، ئەوانیش قانوونەکانی بزووتنەوەی کۆمەڵگە بدۆزنەوە. بەوەش پێشبینییەکانی مێژوونووس دەبنە زانستی و لەسەر ئەساسی حوکمی قانوونی زانستی دادەمەزرێن٨٦.

وەلێ ئەم بیرۆکەیە لەلایەن هەندێ لە فەیلەسووفەکانی مێژووەوە وەك دیتمان هێرشێکی بەهێزی کرایە سەر لەسەر ئەو ئەساسەی کە هەر ڕووداوێکی مێژوو تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ئەو ڕووداوانە ئاڵۆزن و ئاوێتەن و لێك کەوتنیان لەناودا زۆردو زەحمەتە پێوەندیی چەسپاو و نەگۆڕ و لە نێوان هەندێ تاقیماندا بەکاربهێنرێت، وەکو زانستە سروشتییەکان نییە. ئیدی بەو جۆرە دەگەنە ئەوەی بلێین: زۆر زەحمەتە پێوەندیی چەسپاو و نەگۆڕ لە نێوان ڕووداوەکانی مێژوودا ببێت بە جۆرێکی ئەوتۆ، کە ئۆباڵی ئەنجامەکان بکەونە ئەستۆی ڕووداوەکانی مێژوو. لەبەرئەوە بەپێویستی نازانن، ڕووداوی هاوشێوە ڕوویدات، چونکە ڕووداوەکە بە هیچ جۆرێك دووبارە نابێتەوە وەك جۆرج زمل لە کتێبەکەی خۆیدا (کێشەگەلی فەلسەفی لە نووسینی مێژوودا)٨٧ باسی دەکات، یانیش ئەوەتا، مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەروەکو توکیدیدیس گوتویەتی و (بێرناردو دی فوتو)ش هەوڵی دا کە هەردوو بۆچوونەکە لێك نزیك بکاتەوە و وتی:" مێژوو رقی لە حەتمیەتە، بەلاّم ڕێکەوتەکانیش قبووڵ ناکات"٨٨. هەروەهاش کۆلنجوود ئامۆژگاریی مێژوونووسانی، کرد کە وازبێنن و بۆ قانوونە گشتییەکانی مێژوو حەتمییەتەکانی نەگەڕێن و وتی: باشتر وایە هەوڵ بدەن وەك خەلکی ئەو زەمانە لە

---

٨٦ _د. عفت الشرقاوی: في فلسفة الحضارة الاسلامية، دار النهضة العربية، بيروت، ط٣، لسنة ١٩٨١، ص١٥٠.

٨٧ _د. عفت الشرقاوی: في فلسفة الحضارة الاسلامية، ص ١٥٠.

٨٨ _محی الدين اسماعيل: توينبي، منهج التاريخ و فلسفة التاريخ دار ايف، ١٩٨٢،ص٤٤.

ڕووداوەکان بگەن. یان ئەو ڕووداوانە لە چوارچێوەی زەمەنەکەی خۆیدا نیشان بدەن٨٩. ئەوەش هەمان بۆچوونەکەی لیوپولد ڤۆن رانکەی دامەزرێنەری مەدرەسە ئەڵمانییەکەیە٨٩.

(ئایدیالیتیەکان)کە خۆیان ڕەخنە لە بیرۆکەی قانونی هەموەکی دەگرن، خۆیان ڕەخنەیان لە بیرۆکەی (حەتمییەت) یاخود لە بیرۆکەی جەبرییەت گرت و بەهاودژی سروشتی مێژوو لە قەڵەمیان داوەو ڕایانگەیاند، کە بە تەنیا سروشت ملکەچی جیهانی حەتمییەتە، وەلێ جیهانی مێژوو ئازادییە.. وێڕای ئەوەش ئایدلیستەکان ڕێگا لە مێژوونووس ناگرن بۆ هۆکارەکان بگەڕێت، بەلاّم دەڵێن هۆکارەکانی مێژوو جیاوازن لە هۆکارەکانی زانستە سروشتییەکان، چونکە لە هۆکارەکانی زانستە سرووشتییەکاندا حاڵەتەکە و هۆکارەکەی پێوەندییەکی ئاشکرایان لە نێواندا هەیە، بەلاّم ڕووداوەکانی مێژوو پێوەندییان بە ئادەمیزادەوە هەیەو ئادەمیزادیش ئازادە و مل بۆ بیرۆکەی توندی حەتمییەت کەچ ناکات، کە هەموو ڕێگەیەك بە ڕووی ناودارانی مێژوودا دادەخات، تەنیا ئەو ڕێگەیە نەبێت کە مێژوونووسەکان خۆیان گرتوویانەتەبەر، ڕووداوەکانی مێژوویش بەو شێوەیە نەبێت، کەکار ڕوویداوە بەشێوەی دیکە ڕووی نەدەداو مەزندە نەدەکرا بە شێوەیەکی دیکە یان ڕێگایەکی تر بگیرێتە بەر. ڕاستییەکەی وەهایە مێژوونووس هەڵە دەکات، ئەگەر کارای حەتمی بدات و بە نموونە بڵێت :" هیچ ڕێگایەك نەبوو، هەردەبوو ببێت" یان بڵێت :" نەدەکرا خۆی لێ لابدرێت" یان:" چارنەبوو هەر دەبوایە ڕووبدات" یان:" حەتمی بوو، بمانەوێ و نەمانەوێ هەر دەهات" یان: هەر دەردەکەوت. چونکە ئەو جۆرە قسانە مانای وایە ئیشی ئادەمیزاد دەکەوێتە ژێر دڵڕەقی و توندیی لەرادەبەدەر، خۆ ناوداران و کەسایەتییەکانی مێژوو داوەڵ (دمی) نین، هێزی نادیار بیانجوولێنێت ٩٠.

---

٨٩_ د. مؤنس : المصدر السابق، ص ١١٠.

٩٠ _احمد محمود صبحي: المصدر السابق، ص ٤٣.

ئەوانە چەند نموونەیەکیش لەسەر ڕووداوەکانی مێژوو دەهێننەوە، دەکرا ڕێگایەکی دیکە بگرنەبەر و هەوا و هەوەس تاکەکەس (فرد) لە ڕووداوەکانیدا دەردەخەن و دەڵێن زەحمەتیشە قانوون گەلی هەمووەکییان لیٚ بە دەست بێت، یان یاساگەلی هەمووەکییان لیٚ پێشبینی بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ناڵێن کە ڕەوشی مێژوو بریتییە لە ڕێکەوتی پەتی، کە زەحمەتە هۆکارەکەی دەربهێرێت و بدۆزرێتەوە، ئامانجی ئەوان ئەوەیە بە ئاشکرا بڵێین، زۆر زەحمەتە حوکمگەلی وەها دەربهێنرێت کە مێژوونووس بیانکات بە ئامانجێك لە ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکەی، چونکە مێژوو پێویستە بەردەوام پابەند بێت بەقاڵ و قیلی تایبەتی هەوەسی تاك و هەلومەرجی کات و شوێنی دیارکراوی خۆی. هیچ ڕێگایەکیشی نییە ئەو قسانە تێپەڕبێت و هەموو مێژووی پیٚ بکرێتەوە. دەنا ڕووداوە مێژووییەکە مۆرکی مێژووبوونی خۆی لەدەست دەدات،چونکە "مێژوونووس، مێژوو بۆ ئاوەدانی یاخود بۆ شۆڕش بەمانا هەمووەکییەیان نانووسێت.. بەڵکو مێژووی بۆ شارستانییەتییەك یان بۆ شۆڕشی ولاٚتێکی دیارکراو، لە حەقیقەتێکی دیاریکراودا دەنووسێت. ٩١ ئەمەش مانای وایە، بەڕای ئەوان — زۆر زەحمەتە چەند قانوونێك دابنرێت یان دەربهێنریٚ،مادامێکی لەمێژوودا هەوەسی تاکەکەس و کتوپڕی و ڕێکەوت هەبێت، چونکە ڕووداوەکان ڕەنگە بەپێی کەمترین هۆی بیٚ بەهاو زۆرترین هۆی لابەلا (عرض) ڕوویدەن. یەك لەم هۆکارانەی کە قەوما — وەکو باس دەکەن چارەنووسی میسر و چارەنووسی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی بوو،... خەتاکەشی خەتای "لووتی کلیۆپاترە"بوو، وەك دەگێڕنەوە: ئەنتۆنیۆ شەڕە دەریاییەکەی — ئەکتیۆم- ی دۆڕاند، چونکە کلیۆپاترە ترسی لێنیشت و ورەی بەرداو نەبەردی شەڕەکەی بەجیٚ هێشت و هەلاٚت، ئەنتۆنیۆش فەرماندار و سەربازەکانی خۆی بەجێهێشت، دوای کەوت، جا لەسەر ئەو ڕووداوە ب. پسکاڵ (B.Pascal – ١٦٢٣ -١٦٦٣)ی فەیلەسووف پاشان، بە گاڵتەجاڕییەوە دەڵێت:" ئەگەر لووتی کلیۆپاترە کەمیٚ کورتتربایە، ڕووی مێژوو دەگۆڕاو ئاوەها نەدەبوو". نموونەیەکی دی لەوبارەوە دەڵێت: ئەسکەندەری مەلیکی یۆنان، لە پایزی ساڵی (٣٢٢پ.ز) دا بەگازی مەیموونێکی بەناز (مدلل) گیانی لە دەست دا و مرد. ئەو ڕووداوە چەندین کارەسات و ڕووداوی ناهەموار و پڕ ئیشی لێکەوتەوە، تا دوای ڕۆژگارێکی دوور و درێژ (ونستۆن

---

٩١_ الشرقاوي: المصدر السابق، ص١٥٢.

چەرچل) ی سەرۆکی وەزیرانی بەناوبانگی بەریتانیا، ڕۆژێکیان وتی: بەهۆی گازی (قەپی) مەیموونێك، یەك چارەکە ملیۆن ئادەمیزاد کوژران! هەروەها ترۆتسکی کە لە ساڵی ۱۹۱۷ دا یەك بووە لە فەرماندارەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە پایزی ساڵی ۱۹۲۳دا وازی لە ململانێی خوێناوی هێناو لە ڕقی ستالین هەڵات , بیانووی راکردنەکەشی ئەوەبوو کە چووە بۆ ڕاوی قەلمراوی و تای لێهاتووە.

ئەم قسە و گاڵتەجاڕی و مەبەستانە پێویستی بە تەعلیق نییە، ئەوەتا دەڵێت: "دەتوانیت پێشبینی بکەیت شۆڕشێك یان جەنگێك دەقەومێت، بەلاّم قەتاوقەت ناتوانیت پێشبینی بکەیت، کە دوای ڕاوی پایزەی قەلمراوی چیت لێ دەقەومێت۹۲ .

لایەنگران و داواکارانی تەنیابی مەعریفەی مێژوو و تایبەتمەندیی مێژوو، ئەم نموونانە و نموونەی دیکەش دەهێننەوە تەنیا بۆ بەهێزکردنی ڕاوبۆچوونی خۆیان. وەلیّ ڕاوبۆچوونی ئەوان و کەسانی وەکو ئەوان، کەوتە بەر ڕەخنە و پلار و لاقرتێی لایەنگرانی هزر و مەزهەبەکانی دیکە کە بیرۆکەی ڕێکەوت و تەفەرڕودی ڕووداوی مێژوو ڕەت دەکەنەوە، چونکە ئادەمیزاد — وەك خۆیان دەڵێن — بڕوای بە ڕێکەوت نییە تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت، کە ناتوانێت بگات بە ئامانجەکانی خۆی. مێژوونووسی ئینگلیز ئەدوارد گیبۆن (Adward Gibbon ۱۷۳۹-۱۷۹٤) لە کتێبەکی خۆیدا "هەرەسهێنان و ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمان" ئاماژە دەدات : گریکەکان لەبەر ڕۆمان هەڵاتن و ڕایان کرد، دڵخۆشیی خۆیان بەوە دەدایەوە، کە ئەو هەڵاتنە مانای ئەوە نابەخشێت، کە ڕۆمان لەوان بەهێزترە، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو، ئەمان بەدبەخت و بێ چانسن، داخەکەم، ئەگەر مەلیکی گەورە ئەسکەندەری مەقدۆنی بە گەنجی سەری نەدەنایەوە، ڕۆمانیشی ڕاودەناو خەڵکی ڕۆمایشی دەکرد بە مسکێنی مەلیکەکانی گریك۹۳. کەواتە بەپێی ئەو چیرۆکە — (ڕێکەوت) نیشانەی رەشبینی و نابووتیی هزرە، کاتێ مێژوونووس دەیکات بە بیانوو، کە هۆی ڕووداوێکی گرنگ دەخاتە ئەستۆی شتێکی ناگرنگ و بێ بەها. کوردیش گوتویەتی:- :" بیانووی تڕ، نانی جۆیە". حاڵەتی

---

۹۲ _ادواردکار: المصدر السابق، ص ۱۲٦- ۱۲۷.

۹۳_د. صبحی: المصدر السابق، ص ٤٥.

مێژوونووسێکی وەهاش، لە حاڵەتی ئەو قوتابیانە دەچێت کە سەرناکەون و دەڵێن: بەختی کەچمان نەیبڕی و کاغەزی پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکە بە بلیتی یانسیب دەشوبهێنن.

لە کۆتاییدا دەڵێین، مێژوو پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ فەلسەفەدا هەیە و لەگەڵ مەعریفەکانی دیکەی مرۆڤدا، ئەو پێوەندییە نییە نەخاسمە لەگەڵ مەعریفەی زانستیدا هەر نییەتی، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە زانستەکان — نەخاسمە زانستی پەتیی ناسراو، لەسەر عەقڵی هەمووەکی و قانوونە بەتینەکان دادەمەزرێت و هیچ قسەیەکی لەسەر نامێنێت و هیچ بیروبۆچوونێکی دی هەڵناگرێت، مەگەر بیرۆکەیەکی تازە، ڕێگای کۆنەکە بگرێتەوە، بسەلمێنێت کە هەڵەیە.

لە کاتێکدا مێژوو لەسەر عەقڵێك دادەمەزرێت ڕەنگە گومان لە ڕاستی و دروستیی ئەو عەقڵ و مەنتیقە بکرێت، بەلاّم ئەمە بە هیچ جۆرێك مانای ئەوە نییە مێژوو مەعریفەیەکی بەرەلاّیە، مێژوو بێگومان ڕەگەزێکی زانستیی تێدایە، پاشان ڕەوشی مێژوو بریتی نییە لە کۆمەڵە ڕووداوێکی تاکەکەسیی کە پێوەندییان بە یەکەوە نەبێ، سجلەکانیش بریتی نین لە جانتایەك پڕبێت لە شتی جۆربەجۆر و لەم لاو ئەو لا بەبێ مەبەست و ئامانج کۆکرابنەوە.

ئەم حەقیقەتەش ڕێگای ئاسایی و سروشتی مەعریفەی مێژوومان نیشان دەدات، پێوەندیی فەلسەفەمان بە مێژووەوە، دەخاتە بەرچاو٩٤.

---

٩٤_راوس، المصدر السابق ، ص ٩٠.

چۆن چۆنی دوودڵی و نیگەرانی ڕوحی خۆمان لێك دەدەینەوە، کە ئەمڕۆ لەبارەی چارەنووسی ئادەمیزاد دەگەڕێت، یان ئایا ئەو ڕێوورەسمە چییە کۆنترۆڵی چارەنووسی ئادەمیزاد دەکات؟ ئەگەر هەبێت؟ بۆچی لەسەر زانینی هۆکارەکانی ئەوەی لە دەوروبەرمان ڕوودەدات سوورین . ئایا مێژوو دەتوانێت حەقیقەتمان نیشان بدات، یان چارەسەرێکمان بۆ بدۆزێـتەوە، بە ئامانجمان بگەیەنێت؟ ئایا فەلسەفەی مێژوو دەتوانێت ڕووبەڕووی چارەنووس و دواڕۆژمان بکاتەوە؟ یان ڕێگای حەقیقەتمان نیشان بدات؟

ئێمە لە کاتێکدا، ئەم گرنگییە بە مێژوو بە فەلسەفەی مێژوو دەدەین و داوای لێ دەکەین، کە وەڵامی ئەم پرسیارانە و پرسیاری تریشمان بداتەوە، دەبینین لە لایەکی ترەوە بە چاوێکی پێچەوانەی ئەوتۆ سەیری دەکەین پڕ لە بێ حورمەتی و بێ سوودی، بەڵکو داوای ئەوەش دەکرێت، کە گوێی پێ نەدرێت. هەندێ کەسیش لەوە زیاتریان وتووە و مێژوویان بە هۆیەك لە هۆکارەکانی پاشکەوتوویی کۆمەڵگەکانی داناوە، چونکە مێژوو ململانێ دەورووژێنێت و نایەڵێت خەڵك بەرەو پێش بڕوانن و بەرپێی خۆیان ببینین، بەڵکو گرنگی بە ڕابردووی خۆیان دەدەن، زیاتر لەوەی کە پلان بۆ دواڕۆژی خۆیان دابڕێژن، تا وایان لێهات، داوا بکەن لەبەرنامەی خوێندنیشدا لابدرێت و نەخوێندرێت.

خراپیش نییە هەندێ نموونە، لەسەر ئەم گاڵتەپێکردنە بهێننەوە، بە نموونەجۆرج ئۆروێل( G.ORWELL) جارێکیان وتی: "دەزانم، وەها باوە کە زۆربەی مێژووی تۆمارکراو — بەهەرحاڵ- بریتین لە کۆمەڵی درۆ. من ئامادەم بڕوا بکەم کە مێژوو پێویستی بەوە هەیە کە خۆی لە هەواوهەوەس داماڵێت و وردبین بێت. بەڵام شتی سەیر و سەمەری ئەم چاخەی ئەمڕۆ لەو بۆچوونە دەڵێت: دەتوانرێت لە نووسینی مێژوودا حەقیقەت بدۆزرێتەوە " دەستی هەڵگرتووە و وازی هێناوە٩٥.

---

٩٥ - تشارلز فرنكل، کێشەی ئادەمیزادی نوێ. د. تقولا زیادە کردوویيە بە عەرەبی، مؤسسة فرنكلين. بيروت — نيويۆرك ١٩٥٩. ص١٢٥.

یەك لە گەورە مێژوونووسانی "سەردەمی ڕووناکبیری" The inlightenmentage بەناوی گیبۆن(Gibbon) لەو بۆچوونەدا بەشێوەیەکی توندتر دەدوێت کاتێ کە بۆچوونە ڕەشبینییەکەی خۆی لەبارەی مێژوو بڵاوکردەوە، وتی: " لە حەقیقەتدا مێژوو کەمێك لە سجلی جەریمەو بێ ئەقڵی و نەگبەتیی بەشەر زیاترە"٩٦. هێنری فۆرد (Henry Ford) یش، دەڵێت:" مێژوو قسەی پووچە": (History is bunk).مێژوونووس راوس (Rowse) دەڵێت (لەوە دەچێت مێژوو بە کەڵکی هیچ نەیەت)٩٧.. (نیتچە)ش، مەرگی مێژووی ڕاگەیاند و ئەو مردنەشی بۆ ئازادکردنی بەشەر بە زەروور داناو ڕاشیگەیاند، کە تامۆچێژی شتی کۆن، بە بۆنی بۆگەنی گەمارۆی ئادەمیزادی داوە٩٨. بەردەکانیش کە پاشماوەی ئادەمیزادن ئەگەر بیانتوانیبا قسە بکەن، هەموو مێژوو دەبووە درۆیەکی گەورە. شتێکی سەیریشە کە هیگڵ، ( Hegel ١٧٧٠ – ١٨٣١) دانەری کتێبی (فەلسەفەی مێژوو) ڕابگەیەنێت و بڵێت: (تەنیا شتێك کە مرۆڤ لە مێژوو فێری دەبێت، ئەوەیە کە کەس لە مێژوو هەتا هەتایە هیچ فێر نابێت)٩٩.

لە باشترین حاڵی ئەم سووککردنەی مێژوودا، دەبینین میشال فۆکۆ (M.foucault) (١٩٨٤مردووە) لە کتێبەکەی خۆیدا، (وشەکان و شتەکان) نەك

---

٩٦_ د. حسین محمد سلمان. دەروازەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو. دار الاصلاح، الدمام السعودیە، ١٩٨٤، ص٢٠.

٩٧ _ڕاوس: مێژوو، ئاسەواری مێژوو، سوودی مێژوو، محی الدین حفنی ناصف کردوویە بە عەرەبی مؤسسة سجل العرب – القاهرە، ١٩٨٨.ص٨٣..

٩٨_ گۆڤاری (المنار) ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٨٥، ص١٤٧.

٩٩_ ڕاوس: م. ن ص٢٥..

هەر مێژوو، بەڵکو هەموو زانستە مرۆڤایەتییەکان بە زانستی لاوەکی دادەنێت و بە چڵکاوخۆری زانستەکانی دیکەی لە قەڵەم دەدات.

ئایا مێژوو ئەم هەموو گاڵتەجاڕییە هەڵدەگرێت؟ ئەم هەموو گومان و بێ بەهاییەی دەوێت؟ ئایا بەرپرسیارێتی ئەم بۆچوون و سووکایەتییە دەکەوێتە ئۆباڵی مێژوو؟ یان دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسەی کە مێژوو بە خراپی بەکاردەهێنێت و هەمیشە هەوڵ دەدات بیکات بەماددەیەکی حازربەدەست بۆ وەدیهێنانی مەرامی خۆی و بەرپاکردنی فیتنە و شەڕەنگێزیی دەروونی ئادەمیزاد؟

ئێمە ئەگەر سەیری مێژوو - وەك مەعریفەیەکی- سوودبەخش بە مانای سوودبەخش (پراگماتی) بکەین، ئەوا مێژوو هەر چۆنێك بێت، جێگای خۆیەتی بەم سووکایەتییە سەیری بکرێت، چونکە مێژوو ناگاتە پلەی زانستە پەتییەکان، بگرە ناشگاتە ئاقاری زانستە تیۆرییەکانی وەك "زانستە مرۆڤایەتییەکان" کە بۆچوونەکان بە دەوروبەری سروشتەکەیدا ململانێ دەکەن، بە نموونە وەك زانستی ئابووری و دەروونناسی و زانستی کۆمەلایەتی و زانستی ئادەمیزاد (ئەنثرۆپۆلۆجی)و زانستی سیاسەت... هتد.

لەبەر ئەوە پێویست بوو لەسەر ئەوانەی کە بە دڵ گرنگی بە مەسەلەکانی مێژوو دەدەن و حەزدەکەن ئەم گرنگی پێدانە بەردەوام بێت، چارەسەرێك بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزنەوەو مەعریفەی مێژوو لە چنگی ئەم بۆچوونە کەموکورتە رزگار بکەن. ئەنجام گەیشتنە دوو چارەسەر، یەکیان تایبەتە بە خودی مێژوونووس و دووەمیان ئەوەیە، کە بۆچوونێکی گشتگیر و وردکاری بۆ دابنرێت.

## ئەوەی تۆکیدیدیس بۆ مێژووی کرد:

راستییشت دەوێت ئەم دوو جۆرە چارەسەرە شتێکی زۆر تازە نەبوون، واتا کۆرپەی ئەم سەردەمانە نەبوون، بەڵکو وەها دەگێڕنەوە، کە گریك لە هەردوو بوارەکەدا پێشەنگ بوون. لەیەکەمیاندا بە شان و باڵی ئەو مێژوونووسەیان دا هەڵدەدا، کە هیچ لایەنێکی نەدەگرت و بێلایەن بوو.

نە بیروڕای مەزەب و نەهەستی نیشتمانپەروەری و نەهەرێمدۆستی، کاری لێ دەکرد. پێدەچێ کۆنترین ئاماژە، لەم ڕووەوە درابێت بە نووسینەکانی (تۆکیدیدیس —

Thucy dides ٤٦٦- ٣٩٥ پ.ز) که یەکەم مێژوونووسی ناسراوی جیهان بوو. ئەم مێژوونووسە ناوداره هەنگاوێکی ئازاو بوێرانەی بۆ رزگارکردنی مێژوو له چیرۆك و له خەیاڵکاری، بەرەو پێش ناو، له هەست و ئارەزوو رزگاری کرد و کارێکی وەهای کرد، که ئادەمیزاد بخاته سەر خۆشویستنی مێژوو و حەز به چاکەی مێژوو بکات و دوعای خێری بۆ بکات و واز له بیروڕای نەتەوەو بڕواو شار و هاووڵاتیان، سەرۆکەکانی وڵات و لەشکری وڵات و، چی و چی.. بهێنێت و بێلایەن بێت. تۆکیدیدیس، دەیزانی که خۆشویستنی ئەم کۆمەڵ و لایەنانە مێژوونووس وەها ناچار دەکات، که حەقیقەتیان بشارێتەوەو به شکستهێنانیان غەمبار و نیگەران بێت. لەبەر ئەوە حەزی دەکرد که مێژوونووس ڕاستگۆبێت و هەڵەو لایەنگیری نەکات. تا وای لێ هات بووە مامۆستایەکی ناودار و هەموو مێژوونووسێك ویستبای له هەست و لایەنگری رزگاری ببێت کاتێ که مێژووی دەنووسی یان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرد ئاماژەی بەو مامۆستا گەورەیە دەدا. دوای مامۆستای گەورە، ئەوانەی پاش خۆی چاویان له پاکی و بێگەردی و حوکمە باشەکانی دەکرد، سا مێژوونووسی گریك بن. یان رۆمانی بن، یان هەر مێژوونووسێك بێت. به نموونە سالوست (salust، ٨٦- ٣٤پ.ز) و ویتوس لیڤی (T.livey ٥٩- ١٧پ.ز) ئەم دووانە پاك و بێلایەن و دووربوون له گزی و فزی و شاردنەوەی حەقیقەت و وەرگەڕاندنی ئامانجەکان. له مێژووی ئیسلامیشدا، نموونەی جوانی وەك ئەوانە هەبوون، به نموونە تەبەری ( محمد بن جریر ٣١٠ ك، ٩٢٢ز) و مەسکەوەیهی (احمد کوڕی محمود ٤٢١ك/ ١٠٣٠ز).

دەشبینین بانگەوازی مەوزوعییەت- گەیشتە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیش ئەوەتا دکتۆر تەها حسێن بڕیاردەدات و دەڵێت: پێویستە لەسەرمان کاتێك که باسی ئەدەب و مێژووی ئەدەب دەنووسین هەستی نەتەوایەتیمان و نیشانەکانی بنێیینه لاوە و واز له هەستی ئایینی و هەموو شتێکی ئایینی بهێنین و چاو لەوەش بپۆشین، که به خراپی باسی هەستی نەتەوایەتی و ئایینیمان دەکات و "پێویستە پابەندی هیچ نەبین و مل بۆ کەسیش شۆڕنەکەین، پابەندی هیچیان نەبین، تەنیا بۆ بەرنامەی ڕاست و دروستی

لێکۆڵینەوەی زانستی نەبێت، چونکە ئەگەر ئەم هەستانە لەبیرخۆمان نەبەینەوە، ناچاردەبین ئەم و ئەومان خۆش بوێت و هەست و نەستی خۆمان ڕازی بکەین و عەقڵیشمان حەز بەچی بکات، ئەوە دەکات[100].

دەڵێن تۆکیدیدیس لە زەمانێکدا پەیدابووە نووسینی مێژوو گەیشتبووە پلەیەکی بەرزی سەرکەوتن و گەشەسەندن کاتێ کە ڕۆشنبیری گریك لە بوارەکانی زانست و فەلسەفە و ئەدەب و هونەر و شتی دیکەی لەم جۆرە بابەتانەدا بە تەواوەتی پێگەیشتبوو. بێگومان کەسێکیش لەوەختێکی وەهادا خۆی بۆ نووسینی مێژوو تەرخان بکات، وەهای دەنووسێت کە لەگەڵ بالآیی کۆمەڵگەکەیدا بگونجێت و ڕووداوەکانیشی بە گوێرەی بیری ڕۆشن و بۆچوونی خۆی دەنووسێت. لەبەر ئەوە ئەم مێژوونووسە و هەندێ لەوانەش کە لەو سەردەمەدا ژیاون و لایەنگری ئەم بوون بەروبوومی ئەم سەردەمەن کە پیاوی زیرەك و بلیمەتی وەکو ئەمانی بۆ ئەو بوارانە ڕەخساندووە، تۆکیدیدیس مێژوونووس بوو، لە بواری مێژوودا دەینووسی.

ئەوەبوو چارەسەری یەکەم یان (خودی مێژوونووس) کە مێژوونووسی گریك باسی کرد.

بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار و زۆربوونی ڕووداو، مێژوونووسان ئینجا تووشی کێشەیەکی تازە بوون بە هۆی کەڵەکەبوونی خەبەری ڕووداو و شڵەژاویی ئەو خەبەرانە. لەبەرئەوە مێژوونووسان ناچاربوون ئەم هەموو خەبەرانە بەڕێکوپێکی بەیەك ڕیز بنووسنەوە، ئەم جۆرە ڕیزکردنەش بوو بە سەرەتای پەیدابوونی بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی خەبەرەکان و سەرهەڵدانی ئەو مێژووەی، کە ڕووداوەکانی بەپێی ساڵ یان بە پێی دەوڵەتەکان یان بە پێی کەسەکانی یان بە پێی جوگرافیا ڕێك دەخران. سەرەنجام بوو بە بواری زانینی ڕێکەوتی سەرەتای دەوڵەتەکان و کۆتایی ئەو دەوڵەتانە هەر لە گەشەکردنیانەوە، بووژانەوەیانەوە پێداوەرە تا دەگاتە هەرەسهێنان و ڕووخان و نەمانیان. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو مێژوونووسی وەهایان تێدا هەڵکەوت هۆکاری ئەو ڕووداوانەی لێك

---

١٠٠_ د. طه حسین: في الادب الجاهلي.

دەدایەوە. و هەروا بەسەرپێیی بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێنەدەپەڕی بەبێ ئەوەی لێکیان بداتەوە یان هۆکارەکانیان بدۆزێتەوە، ئیدی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە پاڵی بە دانەری مێژووی ڕووداوەکەوە دەنا، کە خۆی ماندوو بکات و بگاتە مەعریفەی (زانینی) هۆکاری ڕووداوەکان و ئەنجامەکانیشیان، ئیدی بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار وای لێ هات نێوان ئەم ڕووداو و ئەو کارەساتی پێکەوە گرێ دەداو نێوان هۆکارەکان و ئەنجامەکانیشیانی پێکەوە دەبەست و بەهۆی زیرەکی و دانایی خۆیەوە بۆی دەرکەوت، کە ئەنجامگەلێکی هاوشێوە هەن لەیەك دەچن، ئینجا کەوتە کۆکردنەوەی بەڵگە و شوێنپێیەکان (القرائن) بۆ ئەوەی بگات بە لێکدانەوەیەکی عەقلانی، بەو لێکدانەوەیەش بۆی ساغ بۆوە، کە ئەو ئەنجامگەلە هاوشێوانە، ئەنجامگەلی ڕووداوی هاوشێوەن. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە خودی تۆکیدیدیس پڕبەدەم هاوار بکات کە هەتا ئێستاش ئەو دەنگەی لە جیهانی مێژوو و سیاسەت و کۆمەلایەتی و لایەنی دیکەدا دەنگ دەداتەوە، ئەوەبوو وتی " مێژوو ئەوەندەی نەماوە خۆی دووبارە بکاتەوە".

دوورنییە هەر ئەو دەنگە بێت، کە بووە سەرەتای پەیدابوونی ئەوەی کە ناومان ناوە:" مەسەلەی لێکدانەوە یان فەلسەفەی مێژوو". ئەمەبوو چارەسەری دووەم کە بە دۆزینەوەی ڕای گشتگیری وەدەست هات. بەوەش دەردەکەوێت، کە زیرەکی و بلیمەتیی ئەو پیاوە و دەستپاکیی ئەو پیاوە، خۆیشی و هزریشی گەیاندە دۆزینەوەی بەرنامەڕێژی لە مێژوودا، پاشان گەیاندییە لێکدانەوەی ڕووداوەکانی، پاشانیش تیۆرییەکان بە دوای یەکدا هاتن.

### دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

بەلام مەسەلەکە هەروا بە ئاسانی تەواو نەبوو، کێشەکانی مێژوو هەروا بە ئەفسانەیەك چارەسەرنەکران، نووسینی مێژوو بە قۆناغگەلی هەڵکشان و داکشاندا تێپەڕدەبوو، هەتا ئەمڕۆش هەر بەو هەڵکشان و داکشانەدا دەڕوات. هەتا ئێستاش

ئەم بیرۆکەیە و ئەو بیرۆکەیە قبووڵ دەکات و ڕەتیشی دەکاتەوە. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو کەسانێکیش هەن هەر لە بناغەوە ڕازی نابن، کە مێژوو بەهیچ جۆرێك لێك بدرێتەوە. لێکدانەوەیەکی تازەش هاتە ئاراوە ئەویش: (لێکدانەوەی تایبەتی ئەوانەیە کە لێکدانەوەی ڕەت دەکەنەوە)!

ڕاستیش دەوێت، کاتێك پێداویست بۆ لێکدانەوەی گشتیگیر پەیدابوو، کە ئادەمیزادی پڕ سەرنج بۆی دەرکەوت کە نابێت، تەنیا کارەسات و ڕووداوەکان بگێڕێتەوەو تۆماریان بکات، چونکە تەنیا بەو هەڵوێستە نازانرێت چی قەوماوە، بەڵکو پێویست بەو دەکات کە بۆچوونێکی قووڵ و پڕ سەرنج هەبێت بۆ زانینی سروشتی مەسەلەکان، ئەوجا پێداویست و ئیحتیاجی پەیدابوون بۆ فەلسەفە یان بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکان بە هزرێکی گشتیگیری بۆ دۆزینەوەی مانای گۆشتی ئادەمیزاد لەسەر ئەم خاکە بەدرێژایی زەمەن بەو حسابەی کە تەنیا هەر ئادەمیزاد بوونەوەری عاقڵ و کۆمەڵایەتی و مێژووییە لەم جیهانەدا، هەر ئەویش دەتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، کە ئایا مانای گۆشتەکانی چییە و حەقیقەتی بەهای گۆشتەکانی چییە و سوودی ئەو خەبەرانەی پێشکەشی دەکات چییە؟ یان بە مانایەکی دیکە و ڕوونتر، وەڵامدانەوەی پرسیاری بەپەلەی ئەوە، کە ئایا عەقڵ و مەنتیقی لێکدانەوە پەسندەکان پێویستیان بە چییە؟

هەیە، مکوڕە لەسەر ئەوەی: هەر شتێك کە لە مێژوودا ڕووی داوەو — ڕوودەدات- دەتوانرێت سێرەی لێ بگیرێت (یمکن رصده) و پێشبینی بکرێت بەمەرجێ چاودێری بکرێت و هەلومەرجی پێش ئەو ڕووداوە و هەلومەرجی دەوروبەری ئەو ڕووداوە بە چاکی چاودێری بکرێت، چونکە عەقڵ و مەنتیقی لێکدانەوەکە دەتوانێت چەند حوکمێکی گشتیی ئەوتۆمان پێشکەش بکات، هێندە هەمووەکی و گشتگیربێت، بتوانێت ئەو توانایەمان بداتێ کە پێشبینی ڕووداوی دوارۆژ بکەین. جا ئەو عەقڵ و پێشبینییە عەقلانییە کە پێشبینی ڕووداومان لە سێبەری هەلومەرجێکی تایبەت و لەسێبەری هەناسەیەکی مێژوویی دیاریکراودا بۆ دەردەخات، بەگریمانیبوونی

قانوونگەلێکی گشتی کە حوکمی مێژوو بکەن و بۆ تەتبیق بەکەڵك بێت، نەبیّ تەواو نابێت، واتا ئەگەر ئەو قانوونە گشتیانە نەبن، کە حوکمی مێژوو دەکەن و بۆ بەکارهێنانیش بەسوودن، ئەگەر ئەوانە نەبن، تەواونابێت.. ئەو قانونانەش بە لێکۆڵینەوەی تاقیکردنەوە نەبێت، نایەتە دەست۱۰۱.

خاوەنی ئەم بیرۆکانە وتیان: دەتوانرێت ئەم جۆرە قانوونە گشتییانە (هەمووەکییانە) لە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی لێکۆڵینەوەی مێژوو لەژێر بەرنامەگەلی لێکۆڵینەوەی زانستیدا، وەدەست بهێنرێت. دەشبێت، پشت بە تێبینی ببەسترێت و پێڕۆبکرێت.

وەلیّ تێبینی لە چاودێریکردنی کردارەکانی مێژوودا، ناڕاستەوخۆ دەبێت: تێبینیش کە ناڕاستەوخۆ بێت، دۆزینەوەی قانوونەکانی بزووتنەوەی مێژوو دوادەکەوێت، وەك دواکەوت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە زانستە سروشتییەکاندا ڕووی دا، چونکە بزووتنەوەکە، لە زانستە سروشتییەکاندا ڕاستەوخۆ دەبینرێت. دۆزینەوەی قانوونەکانی زانستە سروشتییەکان ئاسانترە لە دۆزینەوەی قانوونەکانی زانستە ئینسانییەکان، نەخاسمە لە مێژوودا. ئەوانە مکووڕبوون لەسەر بیرۆکەی دۆزینەوەی قانوونەکانی بزووتنەوەی کۆمەڵگە و دەیانگوت پێویستە ئەوانیش وەکو زاناکانی زانستە سروشتییەکانی پێش خۆیان بە هەنگاوی یەك لە دوای یەك و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار و سەدەکان قانوونەکانی بزووتنەوەی تەنەکان و بزووتنەوەی گەردوون بدۆزنەوە. بەو جۆرە دەتوانرێت پێشبینییە مێژووییەکان ببێت بە زانستییەکی ئەوتۆ کە لەسەر ئەساسێك دامەزرابێت، قانوونی بزووتنەوەی کۆمەڵگە کۆنترۆڵی بکات۱۰۲.

---

۱۰۱_ ادوارد کار. ماهو التاریخ؟ ترجمە:احمد حمدی محمد، ، مؤسسة سجل القاهرە،. - القاهرة ۱۹٦۲. ص۹٥.

۱۰۲ _ بنۆرە: عفت الشرقاوی، فەلسەفەی ئاوەدانیی موسوڵمانەتی. دار النهضة العربیە — بیروت، ط٤— ۱۹۸٥ ، ص ۱٥۰.

مێژوو زانسته و له كرداری دیاریكراوی مێژوو دەكۆڵێتەوەو "بۆ دۆزینەوەی ئەو یاسایانە هەوڵ دەدات كە لە مێژووی كۆمەڵگەدا چالاكن"١٠٣. گەلێك لە مێژوونووس و فەیلەسووفەكانی مێژوو و بیرمەندەكان لە دژی ئەو بیرۆكەیە وەستاون و رەخنەیان لە بیرۆكەی بوونی قانوونە هەمووەكییەكانی گرت و راپانگەیاند: كە سروشت بە كردار دەكەوێتە ژێر كاریگەریی جیهانی حەتمییەتەوە (determination). بەلاّم جیهانی مێژوو، جیهانی ئازادییە. وێڕای ئەوەش لەگەڵ ئەو بۆ چوونە دان كە مێژوونووس دەبێت بۆ ئەو پرەنسیپ و هۆكارە جوزئییانە قۆناغییانە بگەرێت، كە تایبەتن بە رووداوێك یان بە مێژووی دەوڵەتێك. لەگەڵ ئەوەشدا راپانگەیاند كە مەسەلەی لێكدانەوە لە مێژوودا جیاوازە لە مەسەلەی لێكدانەوەی زانستە سروشتییەكان "بزاڤی مێژوو، مەنتیقی" ناوەوەی رووداوەكانی مێژووە، بەلاّم رووكارەكانی زانستە سروشتییەكان لە ناوەوەدا شتی شاردراوەو نهێنییان نییە. پاشان كەموكورییەكە بە لێكدانەوەی هۆكارەكانییەوە پێوەندییەكی رووكەش بووە. لەوەش زیاتر سوودێكی حەتمی هەبوو، پاشان رووداوەكانی مێژوو بە ئادەمیزادەوە پێوەندیداران، ئادەمیزادیش ئازادە و مل بۆ بیرۆكەی (حەتمییەت) شۆرناكات١٠٤ خۆ ئەگەر ئەوەش بزانین كە ئادەمیزادی دروستكەری مێژوو خۆی بوونەوەرێكی ئاڵۆز و پێكهاتە و سەرسامهێنە، ئەوا بۆمان دەردەكەوێت زۆر زەحمەتە هۆكاری ئیشەكانی رابردووی بدۆزینەوەو سەرەنجام زەحمەتە بتوانین قانوونگەلێك دابرێژین.

بەدرێژایی زەمەن كۆنترۆڵی بزاڤ و ئیشەكانی بكات، چونكە ئەم بزاڤ و ئیشانەی بەیەك جۆر دووبارە نابنەوە.

---

١٠٣_ ف. كيللى – ماددییەتی مێژوو – ترجمه:احمد داود– دار الجماهير دمشق، ١٩٦٧، ص٨٦

١٠٤ _ د. احمد محمود صبحى – لە فەلسەفەی مێژووەوە – مؤسسة الثقافة الجامعةالاسكندرية – مصر، ١٩٧٥، ص٤٦.

لەبەرئەوە، مێژوو هەرچەندە بوو بێت بە مەعریفە یان بە (زانست)ێك تایبەتمەندیی خۆی هەبێت، بەڵام بەیەکێك لەو زانستانە دانانرێت کە لەسەر ئەساسی تاقیکردنەوە تێبینی دامەزرابێت. یان لەسەر توانستی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی دیاردەی (مێژوویی)ەکەی بمانەوێت، دامەزرابێت.

زۆر زەحمەتە مەعریفەی مێژوو بە ڕێگەکانی زانستی نوێ کۆنترۆڵی بکرێت و ناتوانین قانوونگەلی جێگیر و نەگۆڕ و حەتمی وەك قانونەکانی سروشت لە مەعریفەوە مێژوو دەربهێنین، چونکە ڕووداوی مێژوو زۆر زەحمەتە دووبارە ببێتەوە یان پێشبینی بکرێت، لەبەر ئەوەی تەنیا یەك جار لە زەمان و مەکانێکی دیارکراودا لەسەرهەمان شێوە ڕوودەدات و لەبەر کەموکوڕتیی هەستی خۆیشمان زۆر زەحمەتە کە هەموو شتێکی لەسەر بزانین[١٠٥].

بەڵام هەموو ئەم هۆکارانە مێژوو لەوە بێبەش ناکات، کە مافی خۆیەتی بە زانست دابنرێت، بەڵێ مێژوو زانستی تاقیکردنەوە و ئەزموونی واقیع نییە، بەڵام زانستی ئەنجامی ڕەخنەیە و زانستی لێپێچینەوەی ئەو بەڵگانەیە کە ڕووداوەکانی ڕابردووی تێدا نووسراوەتەوە. هەروەها مێژوو لە ڕووی لێکۆڵینەوەی بەرنامەڕێژیی لەسەر ڕۆشنایی ئەو ڕێسایانەی بە تێپەڕبوونی زەمان بە دەستی هێناوە، زانستە کە لێرەدا باسیان لێوە ناکەین.

ئەم دوودڵییە لە دانانی خەسڵەتێکی دیارکراو بۆ مێژوو، کارێکی وەهای کرد، کە بەیەك چاو سەیرنەکرێت. ئەوەش ئەو مێژوونووسانەی کە ئیشی تێدا دەکەن، ناچارکرد لە ناو (لە چوارچێوەی) مەعریفەی فەلسەفیدا پۆلێنی بکەن، دوای ئەوەی هەروا بەسەرپێیی بەسەر مەعریفەی ئایینی و ئەدەبی و زانستیدا تێپەڕی. لەگەڵ ئەوەشدا

---

١٠٥ _ د. محمد عبدالکریم الوافي – بەرنامەی لێکۆڵینەوەی مێژوو و نووسینی مێژوو لەلای عەرەبانەکان. منشورات جامعة قاریونس – بنغازي ١٩٩٠، صص ٣٧- ٣٨.

مەسەلەکە یەکلانەکرایەوەو بیرمەندان دوا قسەی خۆیان لەسەری نەکردو (ڕەنگە نەشیکەن) لەبەر ئەوە هەر بە تایبەتمەندییەکەی خۆی ئامادەیە و دەمێنێتەوە. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر مێژوو ئاگاداربێت لە جێگای زۆر وردتر و گرنگتر کە واز لە کۆششەکانی بەزانستبوونی خۆی بهێنێت١٠٦ چونکە مێژوو هەتا ئێستاش هەندێ لەو ڕێساو قانوونانەی نییە کە تایبەتن بە زانست١٠٧ لەبەرئەوە، جێگای لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا قبووڵ کراوە.

راستیشت دەوێت ئەم جێگا فەلسەفییەی کە مێژووی تێدا پۆلێنراوە لە دێرزەمانەوە دەستی پێکردووە. هەرچەندیشە لەبزی فەلسەفە لەگەڵ لەبزی مێژوودا پێکەوە نەوتراون لە سەردەمی ڕۆناکبیری دا نەبێت، کە ئەوەبوو ڤۆلتێر Voltaire (١٦٩٦- ١٧٧٨) یەکەم کەس بوو بەکاری هێنا١٠٨. مەبەستی ڤۆلتێریش ئەوەبوو ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی ڕەخنە یان بە شێوەیەکی زانستی پیشان بدات. یان ڕوونتر بڵێین مەبەستی ئەو بیرمەندە لە فەلسەفەی مێژوو ئەوەبوو، کە مێژوونووس بە جۆرە بیرکردنەوەیەکەوە پابەند بێت بە پێوەرە عەقڵی و مەنتیقییەکانەوە، نەك پشت بە قسەی کتێبەکان ببەستێت یان پشت بە مەسەلەی ڕێککەوت (الصدفە) ببەستێت، هەرچەندە مەسەلەی ڕێککەوت ڕۆڵێکی بەرچاو لە دروستکردنی ڕووداوەکاندا

---

١٠٦ _ فرانسوا دوس – میشال فوکو، فەیلەسووفی پابەند، گۆڤاری (المنار) (پاریس) – ژمارە (٢) فبرایر – شباط ١٩٨٥، ص١٥٦.

١٠٧ _ د. نوری جعفر– التاریخ، مجال و فلسفە التاریخ، چاپخانەی الزهراء – بغداد، ١٩٥٥، ص١٤٠– ١٤١.

١٠٨ _ کولنجوود– بیرۆکەی مێژوو – محمد بکیر خلیل کردوویە بە عەرەبی منشورات لجنە التالیف والترجمە: والنشر – القاهرە: ١٩٦٨، ص٣٠.

دەگێڕێت و هەندێکیش هەن ئینکاری ئەو ڕۆڵە دەکەن.مەبەستیشمان لە ڕێککەوت ئەو ڕووداوانەیە کە پێشبینی نەدەکران.

دەشپرسن ئەوانە ڕێککەوت بوون، یان لەبەر ئەوەبوون کە ئادەمیزاد (قانوونی) بزووتنەوەی مێژووی نەدەزانی و وەهای دەزانی کە ڕووداوەکە ڕووداوێك بێت بەبێ ئەوەی پێشبینی بکرێت بەسەر ئادەمیزاددا تێپەڕبووە، یان هەروا لەخۆیەوە تێپەڕبووە بەبێ ئەوەی ملکەچ بێت بۆ قانوونێکی ڕوون و ئاشکرا، ئەمەش دەرکەوتن و پەیدابوونی پیاوە گەورەکان (قارەمانەکان) دەگرێتەوە١٠٩ ئەوەبوو، لێرەدا فەیلەسووفەکانی مێژوو، لەناوخۆیاندا لەسەر مەسەلەی دروستکەری ڕووداو کەوتنە ناکۆکی، کە ئایا ئەو ڕووداوانە دەسکردی پیاوێکی (فەردێکی) بەرچاوە و چی وای لەو کەسەکرد، کە ئەو پێگەبەرز و بالآیە لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو بۆ خۆی داگیربکات١١٠.

جا، بۆ ئەوەی کێشەکە نەمێنێت و درز و کەلێنی نێوان هەردوو بۆچوونەکە پڕببێتەوە، هەندێکیان گەیشتنە چارەسەرێك دەڵێن: "مێژوو، هەندێ کەس دروستی دەکا و لە هەمانکاتیشدا (هەمووشیان) هەر دروستی دەکەن، ئەو هێندە کەسە لەو کاتە گونجاوە مێژووییەدا سەرۆك و فەرمانداران کاتێك کە توانییان ئەو کاتە گونجاوە بۆ بەرژەوەندی سەرۆکایەتییەکەی خۆیان بەکاربێنن، بەو جۆرە ناویان چووە مێژووەوە و

---

١٠٩ _ تشارلز فرنکل – سەرچاوەیەکی ، صص ٢١٧ـ ٢١٨.

١١٠ _ لەبارەی سەرهەڵدانی قارەمانەکان لە مێژوودا بڕوانە:

_توماس کارلیل : قارەمانەکان و پەرستیش قارەمانێتی – محمد السباعی کردوویە بە عەرەبی.

_بلیخانوف : پەرەسەندنی بیرۆکەی یەکایەتی دەربارەی مێژوو. محمد مصطفی مستجیر کردوویە بە عەرەبی ، چاپی قاهیرە ، ١٩٦٩.

_قسگنگین زریق ئێمە و مێژوو، بەشی نۆیەم ، دروستکرانی مێژوو، ص١٦٦.

کەلێنێکیان تێدا داگیرکرد. کە دەشڵێین (هەمووشیان) دروستی دەکەن ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دەرفەتی ئەو کاتە گونجاوەیان داوە، مێژوو بۆ سەرۆکایەتییەکەیان برەخسێنن۱۱۱.

وابزانم ئەم ڕوانینە بۆ ئەوە پێویست بوو، کە پێوەندییەك لە نێوان مێژوو و فەلسەفەی مێژوودا ببەسترێت و پاشان بۆ ئەوەش کە پیشانی بدەین، بزانین فەلسەفەی مێژوو دەتوانێت چی پێشکەش بە مێژوو بە فەلسەفەی مێژوو بکات دەڵێین:

۱- فەلسەفەی مێژوو دەیەوێت گرتنی کەلەبەر یان چارەسەری توێژینگاکانی مێژوو بکات، چونکە مێژوو بەزۆری باسی ڕووداوەکانی ڕابردوو دەکات بەبێ ئەوەی پێوەندیی بە حاڵی حازرەوە هەبێت یان سەیری دوارۆژ بکات. فەلسەفە لە کێشەیەکی ئێستاوە وەك بندیتۆ کرۆتسە —دەڵێت دەست پێدەکات و ئادەمیزاد بە حاڵی حازرەوە پابەند دەکات و بە جێی نایەڵێت بەڕابردووی خۆیدا هەند شۆڕبێتەوە بیکات بە غەریبی ئێستای و لە وەدیهێنانی ئاواتەکانی دوارۆژیشی دووری بخاتەوە. لەو حاڵەتەدا فەلسەفەی مێژوو ئەو ڕووداوانە وەك شاڵێکی یەکگرتووی بەردەوام لێ دەکات لە لێکدانەوە ڕەفتاری ئادەمیزاددا، بەدرێژایی ڕەوتی مێژوو بەبێ ئەوەی درێژەی بێ بەر و زڕ پیشان بدات، مانای خۆی هەیە.

۲- فەلسەفەی مێژوو، کەموکورتییەك لە فەلسەفەدا پڕدەکاتەوە، ئەو کەموکورتییەش لەو ناڕەحەتی و دوودڵییە بەردەوامەدا دەردەکەوێت کە تووشی فەیلەسووفەکان بووە. ئەم ناڕەحەتی و دوودڵییەش لەوەوە پەیدابووە، فەیلەسووفەکان حەزدەکەن بگەنە حەقیقەت. فەیلەسووف بە شێوەیەکی ئاسایی بەردەوام بۆ حەقیقەت دەگەڕێت، بەڵام لەوە دەترسێ ڕێگای فەلسەفە بزر بکات و کەوتووەتە ژێر خەیاڵی جیهانی ئەبستراکەوە (عالم المجردات)، چونکە حەقیقەت لە فەلسەفەدا پەتییەو

۱۱۱ _ ریاض نجیب الریس : بە تووڕەییەوە بۆتان دەنووسم ، کتێبی (ڕەخنەگر) ۱۹۹٦، ص۱٤۸.

رووته(ئەبستراك)، بە نموونە وەك: ماف، خراپە، چاکە، زیبایی و جوانی، بەختیاری و... شتی لەو جۆرو بابەتانە، کە بەردەوام لە دەست ئادەمیزاد دەچێ و تێدەپەڕن و ناتوانێت بیانگرێ، لەبەرئەوە فەیلەسووفی مێژوو داوای یارمەتی لە (واقعییەتی) مێژوو دەکات١١٢.

٣- پێوەندیی نێوان فەلسەفە و مێژوو، پێوەندییەکی کێشمەکێشمە، (شد و جذب)مێژوو، فەلسەفە ڕادەکێشێت تا فەلسەفە بۆ ئاسمان هەڵنەکشێ لەو جیهانەی کە ئێستا لە واقعیدا دەژین، فەلسەفەش، مێژوو بەرزدەکاتەوە تا زێتر بە قووڵایی ڕابردوودا نەچێت و نقوم نەبێت، هەروەها، مێژوو داوای عەقڵ و ماناو مەغزا لە فەلسەفە دەکات لە کاتێکدا دەبینین فەلسەفەی داوای واقیعییەت لە مێژوو دەکات. ئیدی بەو جۆرە دەبینین کە هەریەکە لە فەلسەفە و مێژوو، کەموکورتیی یەکدی پڕدەکەنەوە.

٤- فەلسەفەی مێژوو ئیحتیاجیی عەقڵیی ئادەمیزاد پڕدەکاتەوەو وەهای لێ دەکات، بە گوێری توانا، هەست بە دڵنیایی بکات، لە هەر کاتێکدا ئادەمیزاد ترسی چارەنووسی دوارۆژی لێ بنشێت، پەنا دەباتە بەر ڕابردوو و داوای لی دەکات عەزیمەتی بەهێز بکات. بەم پێیە دەتوانین ببینن کە چاخەکانی کارەسات و لێقەومان لە مێژووی ئادەمیزاددا، وا لە ئادەمیزاد دەکات بیر لە ڕابردوو و لە چارەنووس بکاتەوەو پاڵی پێوە دەنێت ودنەی دەدات، کە لە ڕێگەی لێکدانەوەو هۆکاری مێژووەوە بۆ چارەسەر بگەڕێت یان بیدۆزێتەوە.

دەشتوانی هەندێ نموونەبهێنینەوە :

---

١١٢ _ د. صبحی : م. ن ص، ص،١٣٠ د. رافت غنیمی الشیخ : فلسفه التاریخ، دار الثقافة والنشر والتوزیع، القاهره. ١٩٩١– ص٢٠.

ئۆگستینی قددیس(st.Augustine، ٣٥٤ -٤٣٠ز) هەوڵی دا، مێژوو لە کتێبەکەی خۆیدا، (شاری خودا) لێك بداتەوە کاتێك سەیری ڕووخانی جیهانی کۆنی دەکرد و وا ڕۆماش دەڕووخێت، ئەوەبوو بیرۆکەی — چاودێریی خوداوەندەی دانا. شارستانییەتیی ئیسلامیش گەیشتە قۆناغی هەرەس و ڕووخان و جیهانی ئیسلام کەوتە بەر غەزای سەلیبییەکان و مەغۆل، ئەوەش وای لە ئیبن خلدون کرد، کە یەکەم بیرۆکەی خۆی لە لێکدانەوەی مێژوودا لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا:" مقدمه" دابنێت.

کاتێکیش ناپلیۆن پۆنابەرتی ئیمپراتۆر، لەبەرچاوی فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمان — هیگڵ- پای نایە ناو خاکی ئەڵمانیا (پروسیا) وە، هیگڵ قسە بەناوبانگەکەی خۆی جارداو، وتی: ئەمڕۆ مێژوویەکی تازەی پروسیا دەست پێدەکات"چونکە کوندەکەی مینێرڤا (Minerva)لە تاریکەشەودا نەبێت نافرێت". بەو قسەیەش ئاماژە بە مینێرڤا دەدات کە شانیشانەی عەقڵە لەلای گریك. قسەکەشی مانای ئەوەیە کە: گەورەترین ئیش و عاقڵترین گوفتار لە تاریکترین کاتدا نەبێت ناگوترێت. داگیرکردنی پروسیاش لەلایەن هێزەکانی فەڕەنساوە لە ڕەشترین ڕۆژی مێژووی پروسیادا رووی دا.

هەریەکە لە ئۆزواڵد شپینگلەر (Oswald Spengler ١٨٨٠ -١٩٣٦ز) لە کتێبەکەی خۆیدا:" هەرەسهێنانی شارستانییەتی ڕۆژئاوا" و، ئارنۆڵد تویینیی (Arnold Toynbee ١٨٨٩ -١٩٧٥ز) لە کتێبەکەی خۆیدا:"لێکۆڵینەوەك لە بارەی مێژوودا" ترسی خۆیان لەبارەی چارەنووسی شارستانییەتیی ڕۆژئاوا پاش جەنگی یەکەمی جیهان پیشان دا، کە ئەوەبوو، هەریەکەیان بیرۆکەی بەناوبانگی خۆی لەبارەی فەلسەفەی مێژووەوە دانا.

دەبا. بزانین لێکۆڵەری مێژوو و زانای کۆمەڵایەتی و سیاسەتمەدار، بە کورتی و بەشێوەی جۆربەجۆر چ سوودگەلێك لە لێکدانەوەی مێژوو دەبینن:

١- بیرکردنەوە لە هۆکاری نەهامەتی و تێکشکان:

ئەحمەد ئیبن تەیمیەی بیرمەندی ئیسلام دەیگوت: ئەگەر موسوڵمانان دەستیان بە ئایینی پاکی خۆیانەوە گرتبا، میللەتی ئیسلام، ئەو هەرەسەی کە بەسەریدا هات، بەسەریدا نەدەهات. لێقەومان و حاڵەتی هەرەس و ڕووخان، دوودڵی و ڕاڕایی لەبارەی دواڕۆژ و چارەنووس دەورووژێنێت.

- هەرچەندیشە هزر و بیرکردنەوەی ئیسلام ئەو کاتە، هێشتا نەیگەیاندبوونە چارەسەرێك، تا ئێستاش، هەر بەچارەسەر نەگەیشتوون، چونکە:

" أن الله لايغير مابقوم، حتى يغيروا ما بانفسهم " واتا "خوا باری میللەتێك ناگۆڕێت، تا بەدەستی خۆیان نەیگۆڕن" ١١٣.

٢- ناڕەحەتی و بیرکردنەوە لە کێشەگەلی دواڕۆژ:

ڕووداوێك کە ئادەمیزاد تووشی ناڕەحەتیی ئێستاو دوارۆژیش بکات، ناچاری دەکات بیر لە ڕابوردووی ڕووداوەکە بکاتەوە، چونکە مێژوو نەك فەلسەفەی مێژوو-پەلەی لە دوارۆژەکە نییە و بەدووری دەگرێت و زۆر گوێی پێ نادات، چونکە تایبەتە بەرابردووش لە یەکەم هەناسەی ئێستای (حازر) دا کۆتایی دێت، بەلاّم (دوارۆژ) لەفەلسەفەی مێژوودا لە ڕێگەی (حازر) ەوە، بە شێوەیەکی ئۆرگانی بەڕابردووەوە دەبەسترێتەوە. مێژوو ناتوانێت بگاتە پلەی ئاگاداری و هەستی فەلسەفی بەبێ ئەوەی ئاگای لە دوارۆژ ببێت، ئەمەش، ترس لە چارەنووس و دوارۆژ پەیدا دەکات تەنیا لە فەلسەفەی مێژوودا ڕوودەدات. ئەم ناڕەحەتییەش لە خەم و پەژارەی (حازر)ی ئادەمیزادەوە پەیدابووە، لەبەر ئەوە، بیر لە ڕابردوو خۆی دەکاتەوە، نەخاسمە لە لاپەڕە پڕشنگدارەکانی بۆ ئەوەی وچانێك بداو کەمێك بحەوێتەوەو نەختێ لە دوارۆژی خۆی دڵنیا بێت.

---

١١٣_ سورة الرعد، ١٣/ ١١.

بە نموونە هەندێ کەس قسەی وەها دەکەن، کە دیارە لە دوارۆژی منداڵ و خۆراك نشینەو خزمەت و خوێند و چارەسەر و شتی لەو جۆرە بابەتانە نارەحەت و دوودڵن. دەپرسن و دەڵێن: ئەگەر باری گوزەرانی ئەمرۆ ئاوەها نالەبار بێت ئەی منداڵەکانمان، لەدوارۆژدا چۆن چۆنی ڕووبەڕووی دەبنەوە ئەگەر ئاڵۆزترو خراپتربوو؟

بێگومان ئەم جۆرە نارەحەتییە پاڵ بەبیرمەند و فەیلەسووفەکانی مێژووەوە دەنێت کە بیر لە چەند ڕێگە و ئامرازێك بکەنەوە بۆ نەهێشتنی ئەم نارەحەتییە و زامنکردنی ژیان و گوزەرانێکی ئاسانتر لەم ژیانەی ئێستا. ئا لەم بارودۆخەوە بیرۆکەی فەلسەفی و زانستی سەرهەڵدەدەن و پەیدادەبن. لەوانەشە بیرکردنەوەو نارەحەتی ببێتە هۆی سەرهەڵدانی شتی تازە و داهێنان و تەکنۆلۆجیای نوێ، چونکە ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە زیندووەکان. ئەو کێشە و گرفتەی ژیانیان لێ تاڵ دەکات، بە تەحەددی دادەنێن و، پێویستە ئەگەر بیانەوێت، ببنە ڕۆڵەی چاکی کۆمەڵگە و زەمانەکەیان ڕووبەڕووی ببنەوە.

٣- پێکهێنانی بۆچوونێکی گشگیر لە مێژووی ئادەمیزاددا:

فەیلەسووفەکانی مێژوو، ڕایان وەیە، ئەگەر ڕووداوەکانی مێژوو بە شێوەیەکی پچڕپچڕ چارەسەر بکرێن، واتا ئەگەر بەتەنیا مێژووی هەر وڵاتێك و هەر شارستانییەك بزانین وەك ئەو حاڵەتەی لە لێکۆڵینەوە ئاسایی و باوەکانی مێژوودا هەیە، ئەوە ڕێگا بۆ بیرمەندان خۆش ناکات، کە بۆچوون و دیدێکی گشتگیر پێکبهێنن و گەلاڵەی بکەن، لەبەرئەوە پێویستە مێژووی ئادەمیزاد بکرێت بە مێژوویەکی ئەوتۆ خەسڵەتی گشتگیریی تێدابێت، وێڕای ئەوەش کە جۆربەجۆرە . ئەو خەسڵەتی گشتگیرییەش بەفەلسەفەی مێژوو نەبێت نایەتەدی و سەرناگرێت، چونکە فەلسەفەی مێژوو یەك ڕێسا و یەك تان و پۆپە و مێژووی جیهانیش هەتا زیاتر گشتگیربێت، زیاتر لە ئەمرۆمان تێدەگەین و بە شێوەیەکی ڕوونتر لە ئێستامان حاڵی دەبین. فەلسەفەی مێژوو لە زەمەن و چاخێکی دیارکراودا ناوەستێت و بەکۆمەڵگەیەکی دیاریکراو قنیات ناکات، بەڵکو هەموو جیهان لەیەك چوارچێوەدا، هەر لە ڕابردووی زۆر کۆنەوە

دەگێڕێتەوە تا ئەم کاتەی ئێستا بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو ڕەهەندەی لە (زەمەن و مەکان) مێژووی شارستانییەکاندا هەیە. ئەوجا، مرۆڤ هەست دەکات کە ڕووداوەکانی پچڕپچڕ و محەللیی بەجێ هێشتووە و گەیشتووەتە مێژووی جیهان ( universal history ) ئەوەتا بابەتی فەیلەسووف. ئەوەش ڕێگا بۆ دانانی بیرۆکەیەك لە بارەی فەلسەفەی مێژووەوە تەخت دەکات و لێکدانەوەی ڕووداوی ڕابردوو ئاسان دەکات.

٤-فەلسەفەی مێژوو (وەك سەرچاوەیەك) بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو:

دوای ئەوەی ماددەکانی مێژوو بووبوون بە ژێدەری لێکۆڵینەوەی مێژوو، پاشانیش بوونە ژێدەرێك بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی مێژوو بەپێی هەندێ بیرۆکەی نوێ- توانیی یاریدەی مێژوو بدات بۆ دۆزینەوەی چەند لایەنێکی سروشتی ئەو قۆناغانانەی کە توخمی ئادەمیزاد پێیدا تێپەڕیووە، لەو قۆناغانەش زانیارییەکی کەم نەبێت هیچی دیکەیان لێ نازانین. فەلسەفەی مێژوو وای لێهات بۆ دووبارە پێکهێنانەوەی مێژووی، چاخە نەزانراوەکانی مێژوو تێدەکۆشا — هەروەك شپینگلەر و بە گوێرەی ئاماژەکانی کارل مارکس کە لە کتێبی ململانیی چینایەتیدا باسیان کردووە.

ئەگەر بێت و بەم تەرزە بڕۆین، ئەوجا، فەلسەفەی مێژوو توانای ئەوەی دەبێت، کە ڕێگا نیشانی مێژووبدات و سروشتی ئەو قۆناغانەی ڕابردوو بدۆزینەوە، کە ڕۆیشتوون و هیچ زانیارییەکمان لەسەریان نییە، چونکە نە ئاسەوار و نەبەڵگەشمان بەدەستەوە هەیە. شپینگلەر ئەو بەرنامەیەی ناوناوە، بەرنامەی (هاوچاخبوونی فەلسەفی).عەبدولرەحمان بەدەوی یش ڕایگەیاند، کە ئەگەر ئیمان بەبەرنامەی (هاوچاخبوونی فەلسەفی) بهێنین، ئەوا فەلسەفەی مێژوو، لە لێکۆڵینەوەکانی مێژوودا گرنگییەکی گەورەی دەبێت، چونکە بەهۆی ئەوەوە دەتوانین ئەو مەودا بەرفراوانە ببینین کە لە تەتبیقکردنی ئەوەوە بۆمان یەکالادەبێتەوە، هەروەها ئەگەر ڕێکی بخەین

و ڕێسا و شەرت و شرووتی بۆ دابنێین ئەنجامگەلێکی قووڵ و کاریگەر بەدەست دێنین١١٤.

دوای ئەوانە هەمووی، ئینجا ئێمەی کورد بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان بناسین پێویستمان بە کاری لێکدانەوەی گشتگیر هەیە، کە بەوە دانەکەوین باسی خۆمان بگێڕینەوەو تۆماری بکەین و بە شان وباڵی خۆماندا هەڵبڵێین، یان بەوە دابکەوین کە هۆکاری دیارکراوی مێژوو بهێنینەوە، بەڵکو پێویستە لەسەرمان زیاتر گرنگی بە بۆچوونی فەلسەفی بدەین، کە ئادەمیزاد خۆی بناسێت و هەست بە خۆی بکات و ڕۆڵی خۆی لە ژیان و، کارلێکی لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا بزانێت. لەم بارەیەشەوە لە بزاڤی ڕۆشنبیریی جیهانیدا، توێژەرگای فەلسەفەی مێژوو پەیدابووە ١١٥ بۆ ئەو مێژوونووسانەی کەم و زۆر مەعریفەی فەلسەفییان هەیە، یان بۆ ئەو فەیلەسووفانەی کەم و زۆر مەعریفەی مێژوویان هەیە.

لەم کتێبەماندا باسی (سروشتی ئەم قۆناغە) پێشنیاری چوار کەس لە گەورە لێکدەرەوەکانی مێژوو دەکەین، ئەمانەن: ئیبن خەلدون، ڤیکۆ، شپینگلەر و تۆینبی. سیانی یەکەمیان، یەك لە دوای یەك، هزر کۆیان دەکاتەوە، ئەو هزرەش ئەوەیە کە هەرسێکیان بڕوایان وایە کە دەوڵەتان و شارستانییەتەکان چەند قۆناغێك یان ئاوەدانکردەوەیان هەیە. کەواتە مەسەلەکە دەسپێك و کۆتایی بۆ هەریەکەیان هەیە. لەبەر ئەوە بیرۆکەکانیان بە هەموو جیاوازییەکانیشیانەوە ناونراون. بیرۆکەی بەدوایەکدا هاتنی خولاوخول، وەلێ بیرمەند و مێژوونووسی گەورە ئەرنۆلد تۆینبی بیرۆکەکانی ئەوانی پێکەیاند و لە چوارپێوەی

١١٤ _ د. بدوی اشپینجلر، منشورات مکتبه النهضة المصریه ، مطبعة الرساله، ط٢، القاهره، ١٩٥٦، ص٧٨.

١١٥ _د. عفت: م. ن ص٢٤,.

پێشنیازی تازە دایانی ڕشتەوە و ناوی نا (بیرۆکەی بێمنەتی و گوێڕایەڵی) و ڕووبەرێکی گەورەتری دا بە ویست و ئارەزوو و ئازادیی ئادەمیزاد لە دروستکردنی یان لە دروستنەکردنی شارستانییەتی خۆیدا، واتا ئادەمیزاد بووە خاوەنی خۆی لە کۆتی پێداویستی دەربازی بوو یان" لە دیلی سروشت رزگاری بوو".

بەراوردێکیشمان لە نێوان هزر و پێشنیازی هەردوو بیرمەندی یەکەم — ئیبن خەلدون، ڤیکۆدا، بە گوێرەی توانا کرد ئومێدەوارم لەم کۆششەدا سەرکەوتوو بووبین و هزری بەسوودمان تێدا دۆزیبێتەوە.

لەگەڵ بیرمەندی گەورە قوستەنتینیش بەیەك دەنگ هەر ئەوە دەڵێینەوە، کە وتی: دانەری کتێب تەنیا خۆی بەرپرسە لە کەموکورتی کتێبەکەی (لە هەڵەکانیشی) ئەگەر هەبێت، وەهایشی لە قەڵەم داوە، کە دانەر ماندووبووەو بیری کردووەتەوە. ئیدی خۆی و خوای خۆی، کۆششەکەی ڕەخنەی لێدەگیرێت و کەموکورییەکانی چاك دەکرێن و هەڵەکانیشی ڕاست دەکرێنەوە و مەسەلە وروژێنراوەکانیش ڕوون دەکرێنەوە و ڕێگاش بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان خۆش دەکرێت[١١٦]. ئومێدەوارین، دانەر لە زانینی تەحەددیی ڕابردوودا بەشداریی کردبێ، لەبەر ڕۆشنایی پێداویستەکانی ئێستا و ئومێدەکانی دوارۆژ و لە دروستیی ڕەتکردنەوەی ئەم بێ منەتییەشدا.

---

١١٦ _ پێشەکیی کتێبی (ئێمە و مێژوو).

# بەشی سێیەم

# بیرۆکەی بەدواداهاتنی خولاوخول

# لای ئیبن خەلدون و ڤیکۆ

# دەستپێك

بیرۆکەکانی فەلسەفەی مێژوو، هەموویان وەلاّمی یەك پرسیار دەدەنەوە، پرسیارەکەش ئەوەیە کە: چی ڕەوتی مێژوو دیاردەکات و نیشانی دەدات؟ بەلاّم مێژووی ئادمیزاد هەندە ئالۆزە، ناچار هەر فەیلەسووفەکان لە چەمکێکی دوورەوە، یان هەر یەکەیان لە ئاستی خۆیەوە وەلاّمی پرسیارەکە دەخوێنێتەوە.

وەلێ، ئێمە لەم کتێبەدا، بەرچاوترینی ئەو فەلسەفانەمان هەلّبژاردووە کە کاریان لە هزری فەلسەفیی مێژوو کردووە. واتا ئەوانەی کە بەپێی توانست وەلاّمی پرسیارگەلێکیان داوەتەوە، کە هەتا ئەمڕۆش بیر و هۆشی ئادەمیزادی بەرنەداوە. پرسیارەکان لە دەیەها سالّی ئەم دواییەدا بە تەواوەتی پێیان لیّ دادەگرن و زێتر بە دوای وەلاّم دا دەگەڕان.

ئەو پرسیارانە لە دوای هۆی شارستانێتی و هۆی بەرەو چاترو گۆڕان و چارەنووس و دەوروبەری تاریکی دوارۆژی ئادەمیزاد دەگەڕێن. کاتێکیش وەلاّمێکی ئەوتۆی دەست نەکەوت کە دلّی ئاوبخواتەوە و هزری بحەوێتەوە، ئەوجا، ناچار خودی خۆی، کەوتە دانانی بیرۆکە و گریمان و ئەمە خوایە، بەهۆی ئەقلّ و هزری خۆیەوە، بتوانێت ئەودیوی ئەو دیوارو بەربەستانە ببینێت، کە ڕێگای دووری هات و نەهاتی شارستانێتییان داپۆشیوەو، ملەمایان لیّ بریوە.؟؟؟

ئادەمیزادی مۆدێرن، دەمێکە دەپرسێت: ئایا ئێمە شارستانین؟ دەی باشە، ئەگەر ئێمە شارستانین، ئەی پێوەری شارستانێتی کامەیە؟

ئایا، باو و باپیرمان کە بە ژیانێکی ساکار و خاکەڕایی لە ئەشکەوت و دەوار و کونج و کوختەکاندا گوزەرانیان دەکرد و جاروبار ڕاویان دەکرد و دەهاتن و دەچوون و خۆراکی خۆیان لە دارو لەسەر زەوی خڕدەکردەوە. شوانییان دەکرد و ئاژەلّیان

رادەگرت، ئایا ئەوان ژیانیان لە ئێمە بەختیارتر بوو؟ ئایا ئەو جۆرە ژیانەی ئەوان هیچ ڕاڕایی و داماوی و گەڕان و پشکنین و خەم و خەفەتی تێدا نەبوو؟

دەی باشە، هۆی گیرۆدەیی و ڕاڕایی و شپرزەیی ژیانی ئەم چاخە مودێرنە لەبەر چییە؟ ئایا ئەم شارستانییانەی ئەمڕۆمان کەلێیان بەرخورداری و سوود لە بەروبوومیان دەبینین و تام لە دەستکەوتەکانیان دەکەین و بە نرخێکی زۆر گران لەسەرمان دەوەستێ ،کە لە زێدی ڕوحی و شارستانێتی و هەڵگوشینی دەروونی و پرووکاندنی دەمار و هزرمان دەیدەین١١٧ ئایا ئەم شارستانییەت و پێشکەوتنەی ئێستامان هیچ سوود و دڵنیایی و ئارامیی بە هەست و روحمان بەخشیوە؟

بەڵێ: ئەو پرسیارانە، بەرچاوترین و گەورەترین پرسیارن کە (فەلسەفەی مێژوو ) هەوڵی داوە، لەم بیرۆکانەی خوارەوەدا وەلآمیان بۆ بدۆزێتەوە:

### بیرۆکەی بەدواداهاتنی خولاوخول، لەلای ئیبن خەلدون و ڤیکۆ:

فەلسەفەی مێژوو، بەلای ئەو کەسانەوە کە خۆیان بە لایەنگیری "خولاوخول" دادەنێن، لەسەر ئەو ڕاوبۆچوونە بەندە، دەڵێت: لێکۆڵینەوەی وردی مێژوو، لەوانەیە لێکدانەوەی ژیانی ئەمڕۆ و ئایندەش لەباربێت و یاریدەدەربێت،شارستانییەتەکان (الحضارات) چارەنووسیان قۆناغ بە قۆناغن، دەتوانرێت بناسرێنەوە و بزانرێن، بگرە تەمەنی دیارکراویشیان هەیە، تۆ بنۆڕە کورپەیت پاشان منداڵیت دوایی پیریت، ئینجا هیچ چارێك نییە دەمریت، شارستانییەکانیش وەك تۆ وەهان لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە، شارستانییەکانیان بە بوونەوەری زیندوو شوبهاندووە. ئەمەش مانای وایە ئەگەر بێت و مێژوونووسێك حاڵەتی قۆناغێکی مێژوویی بزانێت، ئەوە دەتوانێت هەست بە تەمەنی ئەو قۆناغە (ئەو شارستانییەتە ) بکات، ئەمەش لە هیچەوە نایەتەدی، بەڵکو لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی ئامێرەکانی شارستاییەتەکە و هێما هزرییەکانییەوە دێتە دەست، ئەو ئامێر و هێمایانەش بریتین لە (زمان و وێژە و، هونەر

---

١١٧ - بڕوانە: پێشەکی لێکۆڵینەوەی دکتۆر (عبدالعزیز الدوری) بەناونیشانی (فلسفه التاریخ) لە گۆڤاری (عالم الفکر) ی کویتی جلدی ٢، ژمارە ٢، ص٦٥.

و دامودەزگاکان و... هتد) شارستانییەتییەکان بە گشتی و هەریەکە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و جیاواز لە ئیرادە و ئارەزووی تاکەتاکەی کۆمەڵگەکە، کە ئەو شارستانییەتیەیان دروست کردووە. ئەو ئامێرانە دێنێتە ئاراوە. ئەو ئامێرانەش لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی دی، بەپێی ناچۆنییەکی چاخەکان وەك یەك نابن و جیاوازدەبن.

دانەرانی فەلسەفەی خولاوخولی بەدواداهاتن، هەوڵیان دا قانونوگەلی گشتی لەو ڕووداوانەی مێژووەوە دەربێنن، کە ئادەمیزاد پێیدا تێپەڕ دەبێت.

ئەم قانوونانەش یاریدەی ڕەسمکردنی ئەو ئەڵقە لێکەبەستراوانە دەدەن، کە لە زانین و ناسینەوەی حەقیقەتی ناسنامەی ئەو شارستانییەتە و زانینی ماوەکەیدا ڕۆڵ دەگێڕن.

لە قۆناغەکانی مێژوودا، نەخاسمە لە مێژووی هزری تازەی ئەوروپادا، بانگدێرێکی زۆر بۆ ئەم ڕاوبۆچوونە، یان ئەم بیرۆکەیە پەیدابوون، هەریەکە و بەپێی ڕۆشنبیری و بەپێی سروشتی قۆناغەکەی خۆی هەم لە شایستەییدا جیاوازبوون. هەمیش دەربڕین و قسەیان وێك نەدەچوو.

لە مێژووی هزری فەلسەفی ئیسلامیشدا، زانای بەناوبانگ ئیبن خەلدون۱۱۸ بەشێوەی کۆمەڵایەتی مانای مێژووی لێکدایەوەو ڕایگەیاند کە ئامانجی بنەڕەتی مێژوو ئەوەیە تێمان بگەیێنێ کاتێ کە ئادەمیزاد خڕبوونەوە حاڵیان چۆن بووە؟ هۆی ئەوەشی وتووە کە لووتبەرزیی (استعلاو) هەندێ لە میللەتان بەسەر ئەوانی دیکەدا لەبەر چییە و بۆچی؟ حاڵەتی دروستبوونی دەوڵەتانیشی، هەر لە دروستبوونیانەوە و بەو قۆناغانەشدا کە پێیدا تێدەپەڕن و تا لە ئەنجامدا ناچار دەڕووخێن، هەمووی شی کردووەتەوە. ئیبن خەلدون کاتێ ئەوەی بۆ دەرکەوت کە لە ماددەی دەخوێند. لەو

---

۱۱۸ - ئیبن خەلدون،عەبدورحمان کوری محەمەد (۷۳۲- ۸۰۸ك) (۱۳۳۲- ۱٤۰٦ز) لە تونس هاتۆتە دنیاوە لەوێ خوێندویەتی، لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە بە کتێبی پێشەکی (المقدمە) کتێبەکەی (العبرو دیوان المبتدا والخبر) بەناوبانگە، یەکێکە لە پێشڕەوانی فەلسەفەی مێژوو و کۆمەڵناسی تاقیکردنەوەی بە بناغەی زانیاری داناوە. ڕەخنەی لە هەڵە و وخەیاڵبازیی مێژوونووسان گرتووە و داوای کردووە مێژوو لە سەر بناغەی بەستنەوەی هۆ بە ئەنجامەوە، بخوێندرێ.

خوێندنەدا، کەوتە بیرکردنەوە و لێکدانەوەی حاڵەتی (خولا و خول) کە تووشی کۆمەڵگە دەبێت بەبێ ئەوەی ئادەمیزاد یەکسەر هیچ پلانێکی بۆ دانابێت، واتا گەڕانەوەی ئەو خولانە، لە خۆیانەوە ڕوودەدەن و ئادەمیزاد ئاگای لێ نییە، ڕاستەوخۆ پلانی بۆ دانەناوە. لێرەدا ئیبن خەلدون بەپێویستی زانی کە خودی خۆی هۆکاری ئەو خولاوخولە، ڕێکەوپێکەدیاربکات و تێی بگات، لەم بیرکردنەوەیەدا بۆی دەرکەوت کە حاڵەتێکی بەرزبوونەوەی خۆنەویست (الارتفا الجبری)

لەو کۆمەڵگەیانەدا هەیە، ڕێك وەکو ئەوە وایە کە بیرمەندی ئیتالیی (ڤیکۆ)١١٩ دوای ئیبن خەلدون بە چەندسەدەیەك دەیگوت. ئیبن خەلدون دەڵێت، دەسەلآت لە کۆمەڵگەدا لەسەر هێز نەبێت نایێتەکایەوەو دانامەزرێت واتا کۆمەڵێ خەڵك لەناو خۆیاندا، بوون بەیەك و هەوای تازەکردنەوەو پێشکەوتن و سەرکەوتن داویە لە کەللەیان و جڵەوی حوکم دەگرنە دەست. ئەم خەسڵەتانەش کە لە نەتەوەگەلی سارانشین (بەداوەت)دا دێنە ئاراوە، بەسەو بەشی ئەو دەستەبژێرانەیان دەکات، کە بەسەر خۆیاندا سەربکەون و بڕیاری بەرەو چاکتر گۆڕینی واقیعی خۆیان بدەن.

ئەوجا دوای یەکگرتنیان دەوڵەتێکیان لێ پەیدادەبێت و جیهان داگیردەکەن، بەلآم زۆر ناخایەنێت، هەر زوو بە زوو حوکمبەدەستەکانی سارددەبنەوەو لە بەروبوومی خەباتی خۆیان تێر دەخۆن و قۆناغێکی تازەتر دێتە بەرەوەو دەوڵەتەکە دەکەوێتە دەست کەسانێکی ئیشکەرترو چالاکتر و بەپشووتر، پاشان دەوڵەتەکە دەکەوێتە قۆناغی سێیەم کە حوکمبەدەستان لەم قۆناغەدا خەسڵەتی حوکمیان زاڵە و سستی و گەندەڵی و بێ خێریش باڵیان بەسەردا دەکێشێت.

---

١١٩ - جیوڤانی باتیستاڤیکۆ (Giovanni Battista vico_ ١٧٧٤_١٦٦٨) یشەرعزان و فەیلەسووف و مێژوونووسی ئیتالی لە شاری ناپۆلی هاتووەتە دونیاوە و لە زانکۆی هەمان شار خوێندویەتی. (زانستی نوێ، قانونی جیهانی) لە پێوەندی نێوان مێژووی قانوون و ژیری کۆڵیوەتەوە. لای وایە کە مێژووی مرۆڤایەتی لە زنجیرە کردارێکی (پێشکەوتن) دا خۆی دەنوێنی کە بەپلە پلەی لە دوایەك و بەردەوامدا دەڕوات.

ئیبن خەلدون، هێنای لە نووسینی (مقدمە) کەیدا، لە دیاردەی کۆمەڵبوونی ئادەمیزادی ، واتا لە شارستانییەتی ئادەمیزادی کۆڵییەوە و، شیی کردەوە. هەوڵی ئەوەشی دا، کە فەلسەفەیەکی گشتگیر (شامل) بۆ مێژوو دابنێت و لە ڕووداوەکانی ئەو مێژووە ئەو قانوون و ڕێسا گشتییانە دەربهێنێت، کە ئادەمیزاد بەسەریاندا بەرەو گۆرانی چاکتر مل دەنێت. ئیبن خەلدون- وەکو خۆی باسی دەکات هەندێ لە درێژەی باسەکانی پشت بە لێکۆڵینەوەگەلی پێشتر دەبەستێت، وەلێ، خۆی لەناو فەلسەفەچییەکانی مێژوودا وەك کێلە بەردی سەر ڕێگا وەستاوە و دیارە و لە هەموویان زیاتر بەرزتر و قووڵتر و دەڕوانێت و هیچ بیرمەندێکی ئیسلام و فەیلەسووفێکی مێژووی کۆمەڵایەتی پێشی نەکەوتووە، کە هزری عەرەبیی — ئیسلامی ئەو کاتە لە قۆناغی لاوازی ڕۆچووندا بووە ١٢٠.

ئیبن خەلدون ئەو مێژوونووسە نەبووە کە — لە بنەڕەتەوە — گرنگیی بە ماددەی مێژوو دابێت، بەڵکو بەلای ئەوەوە گرنگ ئەوەبوو بە پلەی یەکەم ئەو ماددەیە بۆ ئامانجێکی گەورەتر و بەرزتر و بخاتەکار. گرنگ لای ئەو ئەوە بووە هۆی ڕووداوەکە لێك بداتەوە، نەك خودی ڕووداوەکە، لەبەرئەوە ئیبن خەلدون بەرلەوەی بە مێژوونووس لە قەڵەم بدرێت بیرمەندبووە، پۆستی سیاسی زۆریشی وەرگرتووە و تێیاندا ناوی دەرکردووە و بەرپرسیارێتیی حوکمیشی تاقی کردووەتەوە، بە ترش و تاڵ و شیرینەکانیشییەوە ئەو ئیشانەشی لە هەلومەرجێکی زۆر ئاڵۆز و نالەباری سەردەمی هەشتەی کۆچی (چواردەی زایینی) دا کردووە، کە بارودۆخی ئەو ناوچەیەی لێی دەژیا (باکووری ئەفریقیا و پاشان ئەندەلوس و دوایی میسر، کە لێی گیرسایەوەو گیانی تێدا سپارد) زۆر گرژ و ناخۆش بوو بوو.

ڕاستییشت دەوێت، دروستبوونی هزری ئیبن خەلدون بەرەو فەلسەفە لە فراژووبوون و زیادبووندا بوو، پاشان بەرەو زانستی ئایین و حەدیس بای دایەوە، پاشان هاتەوە سەر فێربوونی زانستی کۆمەڵایەتی و مێژوو، چونکە پێشتر لە ڕێگەی هات و نەهاتی سیاسی و فڕوفێڵی ژیانەوە، بە شێوەیەکی چالاك و کارا لەگەڵ چاخی پڕ لە کارەساتی گەورە گەورە و گۆڕانکاریی دۆخی ژیاندا تێکەڵ ببوو، ئەزموونی هەبوو.

---

١٢٠ - د. صالح احمد العلي: تفسير التاريخ، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٦١، ص١٩.

ئیبن خەلدون، دوای ئەوەی، بەڕوح و تەکانێکی لاوانە و گەنجانە، خۆی هاویشتە گەرمەی بزاڤی سیاسی، ئەوجا لە خۆی وردبوودەوە و دیتی کە تەمەنی لە چل ساڵ تێپەربووە، ئەوسا تێگەیشت و کەوتە پرسیار و وەلاّمدانەوەی ئەو کارەساتە ئاڵۆز و زەحمەتانە، ئەوەبوو کە ئیدی تا ماوەی چوار ساڵی رەبەق، خۆی لە قەلاّی سەلامەدا (لە ویلایەتی وەهران لە جەزائیر) تەریك راگرت، ئەم تەریکی و تەنیاییەش پێویستی و پێداویستییەکی دەروونیی بە پەلە بوو بۆ ئەو ویستی لە ژاوەژاو دووربکەوێتەوە و بچێتە ناو خەڵوەتی سەرنجدانی ڕووداوەکانەوە و لێیان بکۆڵێتەوە و بزانێت پێوەندییان بە زەمان و ژینگەکەوە چییە؟

بۆ ئەوەی لە قاڵبی مێژوویی خۆیاندا دایان بنێت. مێژوو لەلای ئیبن خەلدون، بوو بەزانستی دۆزینەوەی هۆی ڕووداوەکان کە حەقیقەتەکانیان دەربخات و هۆ و یاسای ڕووداوەکان پیشان بدات و نهێنییەکانیان بخاتەڕوو. ئەو حاڵەتەش هێندە بەتوندی گیرابوو، هێندە کەشف و کەراماتی بەسەرداهاتبوو، بە تەواوەتی لە حاڵەتی غەیبی و ئیلهام دەچوو۱۲۱. ئیبن خەلدون بە یەکێك لەو کەسانە لە قەڵەم دەدرێت بۆ یەکەمجار مەسەلەی قانوونیبوونی بەرەو چاکتر گۆڕانی مێژووی کۆمەڵگەی لەسەر زەمانێکدا پەیڕۆکردووە، کە بیرکردنەوەی هزری و مەنتیق لەژێر فشار و دەم ئاخنیندا دەینالاند. باسی (دەوڵەت)یش کە نزیکەی سێیەکی (مقدمە) بەناوبانگەکەی گرتووەتەوە، بریتییە تەنیا لە بەڵگەی ئەو ئەرکەی ئەم بیرمەندە لە نەبەردی مێژووی هزری کۆمەلاّیەتیدا لە ئەستۆی گرتبوو۱۲۲.

وەلێ ئەوەی پێویستە سەرنجی لێ بدەین ئەوەیە کە ئیبن خەلدون زۆرتر مەبەستی لە "حوکمی بنەماڵەیە" یان حوکمی "کۆمەڵە" کەسێکە یان مەبەستی لە "سیستەمی حوکمەکەیە" مەبەستی لە (شارستانییەت) یەکە نییە، لەبەرئەوە ئیبن خەلدون کاتێك کە وتەی (پەیدابوون و بەرەو چاکتر گۆڕان و لاوازبوون و ڕووخانی دەوڵەت) دەکاتە بیرۆکە مەبەستی لە (پەیدابوون و رووخانی) شارستانییەت نییە، سووربوونی ئیبن خەلدون لەسەر

---

۱۲۱ - د. محمد الطالبي: منهجية ابن خلدون التاريخية، دار الحداثة، بيروت، ۱۹۸۱،ص۱۱۱.

۱۲۲ - عبدالرزاق مسلم: نظرية ابن خقلدون في الدولة، مجلة الطبعة القاهرة، العدد ۱۳، ۱۹٦٦، ص۸

مەسەلەی "پەیدابوون و رووخان" بەڵگەی ئەوەیە کە بە چاوێکی مێژووناسانە سەیریان دەکات، ئەو وەهایان بۆ دەچێت، کە ئەمانە دیاردەی کۆمەلایەتین و وەکو هەموو دیاردەکانی تر دەکەونە ژێر کاریگەریی گەردوون و کۆمەڵگەوە، چونکە ئەوەی لە ماوەی چوار نەوەدا دەشێت بڕووخێت، واتا لە ماوەی ئەو سێ قۆناغەدا لە بەشی ژێر ناونیشانی "دەوڵەتیش وەکو هەر کەسێك تەمەنی دیاریکراوی سروشتی خۆی هەیە ١٢٣". ئەوە مەبەستی لە دەوڵەتە مەبەستی لە (شارستانییەت) نییە، چونکە دەوڵەتیش بڕووخێت شارستانییەت ناڕووخێت و دەمێنێت . جاری وەها دەبێت، پێچەوانەی ئەم قسەیەش هەر بە ڕاست دەردەچێت. وەلێ "ڤیکۆ" مەبەستی لە "دەوڵەتی شارستانییەتە" مەبەستی لە حوکمی بنەماڵە نییە، کە لە مەودوا باسی دەکەین.

ئیبن خەلدون دەڵێت: تەمەنی دەوڵەت گەلێ جار، لە کۆی تەمەنی سێ نەوە زیاتر نییە نەوەش بریتییە لە تەمەنی مامناوەندی کەسێك کە دەکاتە چل ساڵ بە پەیدابوونی و گەشەکردن و ڕۆژی مردنیشیەوە١٢٤، لێرەدا ئاماژەبە و ئایەتە پیرۆزە دەدات، کە دەڵێت: "حتى اذا اشدة وبلغ اربعين سنة١٢٥". ئینجا دەڵێت: مەبەست لە چڵ ساڵەکە ئەوەیە کە ئەو نەوە زیندووە بەسەردەچن و دەمرن و نەوەیەکی دی دێتە ئاراوە، لەگەڵ ملکەچیدا ڕانەهاتوون و هەر ناشیناسن، واتە چل ساڵەکەی تەمەنی ئەو نەوەیە بە تەمەلی یەك کەس لە قەڵەم دەدات، کە لە چل تێنەپەڕێت. ئینجا بەڕای خۆی شرۆڤەی ئەو قۆناغانە (ئەو خولانە) دەکات، کە دەوڵەت پێیدا تێدەپەڕێت و دەڵێت: ئێمە گوتمان تەمەنی دەوڵەت زۆرتر لە سێ نەوە زێتر نابێت، نەوەی یەکەم هێشتا لە خەسڵەتی سارانشیندایە، رەق و وشك و بەزو کێوین، ژیانی کولەمەرگییان وەها دەخوازێت، ئازانەو دڕن، لە دوای ناوبانگ دەگەڕێن، هێشتا هەوای دەمارگیرییان

---

١٢٣ - ابن خلدون: المقدمة، طبعة دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٧٩، ص٣٠٠.

١٢٤ - م. ن ص٣٠٠.

١٢٥ - سوره الاحناف، الايه:. ١٥.

١٢٦ تێدا ماوە، تیژن وەك چەقۆ، خەڵك لێیان دەترسێ و ملیان بۆ کەچ دەکات١٢٧.
لە کاتێکدا ئیبن خەلدون تەمەنی دەوڵەت بەم رشتە نەگۆڕە دیاردەکات. دەبینین(ڤیکۆ) ئەوە ناکات و دیاری ناکات و بۆ هەلومەرجی بەجێ دەهێڵێت. بەلای ئیبن خەلدونەوە" سارانشینی — البداوە" ئەسڵی دەوڵەتە و پێویستە هەموو دەوڵەتەکان بەو خولەدا گوزەر بکەن و نیشانەکانی ئەو خولەش بریتییە لە تەقەشوف (التقشف) و برسێتی و بێدەرامەتی. لەبەر ئەوە، لەم رووەوە دەڵێت: لەبەر ئەوەی فێری سەختیی ژیان و فەقیریی حاڵ و نالەباریی خاك و ژینگە بوونە و بەناچاری ئەو جۆرە ژیانەیان بەنسیب بووە و ژیانیان لەسەر حوشترداری بەندە، ئەمەش ناچاریان دەکات لە بیابانەکاندا بەتەریکی و تەنیایی بمێننەوە، حوشتر بەدرك و داڵ و حوشترخۆرك بەخێو بکەن. سارا جێگەی نەداری و برسێتی و ماندووبوونە١٢٨.

مادامێکی ئەم قۆناغە لەسەر سارانشینی (البداوە) وەستاوە، ئەوا هیچ چار نییە کە دەمارگیری (هەستی خێڵەکی) دەبێتە کرۆکی کۆبوونەوەی دەسەلات، ئەمەش لە سەرەتاوە، پرەنسیپی باوکسالاریی لێ پەیدابوو. باوکسالاریش بوو بە بناغەی پێوەندیی نێوان فەرد و سەرۆکی کۆمەڵەکە (واتا شێخی خێڵەکە) و کۆمەلانی دیکەش. لەبەر ئەوە غەزو (تالان و بڕ) دەبێتە ناونیشانی زۆربەی پێوەندییەکانی ناویان. خێڵی بەهێزیش ئەو خێڵەیە کە بتوانێت (دەمارگیرییەکەی) خۆی لە دەست نەدا، چونکە بەهۆی ئەو دەمارگیرییەوە دەژیێت و دەمێنێت و دەتوانێت دڕ بەوانی تر بدات و پەلاماریان بدات، بەو جۆرە خێڵ (القبیلە) دەتوانێت بمێنێت و هێزی گەنجایەتی و لاوێتی خۆی بهێڵێت و لە دەستی نەدا.

ئیبن خەلدون و ڤیکۆ هەردووکیان کە لەمەودوا دەبینین — لەوەدا رێکن کە ژیان لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی شارستانیدا ئامێرگەلێکی دەربڕینی تایبەت بەخۆی

---

١٢٦ - م. ن ص ٣٠١.

١٢٧ - م. ن ص ٣٠١.

١٢٨ - ص ٢٢٧.

دێنێته ئاراوه، مەبەست لەو ئامێرانەش دروستکردنی وشەی زمانەوانی و پێوەری ئەدەبی و مانای ئەخلاق و بەهای کۆمەڵایەتییە، واتا ژیان لە هەر قۆناغێکی شارستانییەتدا، وشەگەلی تایبەت و پێوەری تایبەتی ئەدەبی و دروشم و ئەخلاق و بەهای کۆمەڵایەتیی تایبەت بە خۆی دروست دەکات. لەبەرئەوە خەسڵەتی چاوتێری (الکرم) و غیرەت و پیاوەتی و ڕاستگۆیی و بەجەرگی و ئازایەتی و ملکەچی بۆ خێڵ و بەهاناچوونی خزم و تۆڵەسەندنەوە، خەسڵەتی دیکەش ئەمانە هەمووی — بەلای ئیبن خەلدون — ەوە لەو بەها بەنرخ و بەرزانەن، کە ئەم قۆناغە واتا کە قۆناغی سارانشینی (البداوە) پەیدای دەکات، بەلاّم بەلای ڤیکۆوە چاخی بتەکانە (عصر الاهنة).

بەلاّم لە قۆناغی دووەمدا، حاڵەتی ئەو تاقمە دەگۆڕێت بۆ حاڵەتی موڵکداری و رابواردن. لە شارانشینییەوە دەگۆڕێت بۆ ژیانی شارستانی (الحضارة)و لە برسێتی و کەم دەرامەتییەوە دەگۆڕێت بۆ بەختیاری و بەپێزی و فراژووبوون (النماو)و لە بەشداربوونی فەخر و مەجدەوە دەگۆڕێت بۆ تەریکی و تەنیایی١٢٩. واتا کۆمەڵەکە لە خولی دەمارگیریی خێڵەکییەوە کە لە رووی سیاسییەوە بەهێزبوون. دەگۆڕێت تا ڕۆڵێکی جیاواز و لاواز دەبێت و بە رابواردنی دنیاو ژیانەوە خەریك دەبێت، واتا بناغەی سیاسەتیان دەگۆڕێت، لە پێشان بەجەرگانە و ئازایانە پەلاماریان دەداو بە کوشتار و تالاّن و بڕۆوە خەریك بوون، بەلاّم ئێستا بە ژیانی خۆشی و رابواردن و هێوری و موڵك و ماڵەوە خەریکن و ڕەوشتی ئازایەتییان لەبیرچووەتەوە و پشت بە خەڵکیتر دەبەستن ،کە چاودێرییان بکات و بیانپارێزێت١٣٠. لە خولی دەمارگیریی خێڵەکیدا (العصبیة القبلیة) ئیش و بەرپرسیارێتییە جۆربەجۆرەکانی بەسەر کۆمە کۆمەڵی پێوەندیدارو پسپۆڕەکاندا دابەش دەبن. بە نموونە لە بواری سەربازیدا خودی خێڵەکە — بە هەموو ئەندامەکانی خێڵەکە — خۆیان بەرپرسیارێتی داکۆکی و پاراستنی پڕی (حیاض) خێڵەکەیان دەگرتە ئەستۆ و هێرشیان دەکردە سەر ئێڵەکانی

---

١٢٩ - ص ٣٠٢

١٣٠ - ص ٢٩٩.

دی، بەلاّم ئەم بەرپرسیاریّتییە سەربازییە. لە قۆناغی دووەمدا بوو بە ئەرکی تاقمیّك سەرباز و سەرکردەی سەربازی کە خوویان بەو جۆرە ژیانەوە گرتبوو، واتا کردبوویان بەپیشە، چونکە ئەوانی دی "پشتیان لە هیّرش و تالاّویر ساردبۆوەو، هیّزو توانایان نەماو بە ژیانی سەرشۆڕی و ملکەچی ڕاهاتن و خوویان پیّوەگرت۱۳۱". ئەمەش بوو بەهۆی کزبوونی هیممەت و نەمانی هەیبەت و وەرینی دڕك و دالّەکانیان کە خەلّکیان پیّ دەترساند، ئۆبالّی ئەم دۆخە تازەیەش دەکەویّتە ئەستۆی دەولّەت کە لە بەرگی کزی و پیریدا سەرتاپا نقوم بوو بوو۱۳۲" چونکە لە هیّزی دەستدریّژییەوە، بایاندایەوە سەر ژیانی ملکەچی و سەرشۆڕی. لە کاتی وەهاشدا، هەوای دەمارگیری و زۆر و کەم تیّکدەشکیّ و نیشانەی چاو لە خواریّ و سەرشۆڕییان تیّدا دەردەکەویّت۱۳۳".

بەو جۆرە کۆلّەکەی ئابووریی خیّلّەکە دەگۆڕیّت، چونکە لە حالّەتی کەساسی و برسیّتییەوە دەگۆڕیّن بۆ حالّەتی ڕابواردن و بەختیاری و ڕیّگای ڕابواردن لە بوارە جۆربەجۆرەکانی خۆراکی چاك و پۆشاکی بەڕیّز و راخەر و دالّدەو خانووبەرە و ژیانی و ناو شارەکان دەگرنە بەر و پیّی ڕادیّن و ژیانی ناو دەوار و خیّوەتیان لە بیرنامیّنیّت. ئەم ژیانە تازەیە دنەیان دەدات بۆ خۆشگوزەرانی و رابواردنی زیّتر و تا ناقرە تیّیدا نقوم دەبن، لەو ژیانەشەوە خووی هیّوری و بیّوەیی خۆڕازاندنەوە و ئاسەواری دیکەش پەیدادەبن.

مەبەستی خودی ئاوەدانکردنەوە بۆ ڕابواردن بوو، هەر بۆ ئەو مەبەستەش میللەتانی دراوسیّیان دەتۆقاند، بەلاّم لەم ژیانە تازەیەدا خیّلّەکان و سارانشینەکانی هان دەدا خۆیان پەلاماری بدەن و لەناوی بەرن۱۳٤. بەو جۆرە ئازایەتی و بە جەرگیی سارانشین دەکەویّتە لاوازی و "ڕەوشتی تەنیایی و ساراگەری دەگۆڕیت و سوودی سارانشینی و ساراگەری لەبیردەکەن و نامیّنیّت".

---

۱۳۱ -ص ۲۹۷.

۱۳۲ - م. ن ص۲۹۷

۱۳۳ - ص- ۳۰۲

۱۳٤ - د. احمد محمود صبحی: في فلسفة التاريخ، الاسكندرية، مصر، ۱۹۷۵، ص ۱٤۱.

ئەم قۆناغە خەلدونییە، لەلای ڤیکۆ، دەکاتە سەردەمی قۆناغەکانی پاشەوەی سەردەمی قارەمانێتی، واتا ئەو کاتە کە حوکم بەدەستی دەستبژێرەکان و چینی ئوروستقراتییەکانەوە دەبێت.

دوای ئەم خولە، قۆناغی سێیەم دەست پێدەکات کە لە ناوچوونی دەوڵەت و کۆتایی تەمەنی دەوڵەتی لێ پەیدا دەبێت و ئیدی دەوڵەت نامێنێت. ئەمەش قۆناغی پاشاگەردانی و نەمانی قانوونە "التدهور" کە ئیبن خەلدون ناوی دەنێت (نەوەی سێیەم) لەم قۆناغەدا "رۆژانی سارانشینی و ژیانی هێز لەبیردەچن و هەروەك نەشیان دیبێت، وەهای لێ دێت لەبەر خۆشگوزەرانی دەسترۆیی، تامی شیرینی هێز و دەمارگیرییان نامێنێت و ڕابواردنیان دەگاتە ئەوپەڕی ئامانج، چونکە هۆگری ژیانی باش بوونە و لەگەڵ خۆشیی ژیان و گوزەراندا ڕاهاتوونەو دەبنە مشەخۆر (طفيلي) لەسەر دەوڵەت[١٣٥]، دیارە بنەمای ئابووری، لە گۆڕانکاریی ئەم قۆناغە جۆربەجۆرانەدا کاریگەریی لەسەر ئەم قسەیەی ئیبن خەلدون هەبووە و لەسەر خەسڵەتەکانی هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەش هەر هەبووە، چونکە ڕابواردنی زۆر و زیادبوونی ڕێژەی ئەرك و مەسرەف لە دەرامەتی دەوڵەت ئاسەوارێکی خراپی گەورەیی لێ دەکەوێتەوە. دەمارگیری هۆکاری سەرەکیی گۆڕانی شارستانی بوو لە کۆمەڵگەدا، بەڵام ئەم دەمارگیرییە بەرەبەرە بەتێپەڕبوونی رۆژگار کز و لاواز دەبێت ئەمە لەلایەك لە لایەکی تریشەوە قۆناغی ئاوەدانی و موڵك و ماڵی زیادە و تەمبەڵی و بێوەیی پێداویستی زۆرتری بێ سوود و بە سوود، ئەمانە دەبنە هۆی تێکچوونی بوجەی ئابووریی کۆمەڵگە[١٣٦].

---

١٣٥ - ابن خلدون: م. ن نفس الصفحة.

١٣٦ - د. عبدالجبار ناجي: بحثه "تتبع تاريخي لمحاولة. مجلة المؤرخ العربي، بغداد، العدد ٢٢-١٩٨٢، ص١٤٥.

ئیبن خەلدون لەم بارەیەوە لە بەشێك لە نووسینەکانیدا کە ناونیشانێکی بۆداناوە لە قسەی نەستەق دەچێت و مەرگی دەوڵەتی ڕابواردن و هێمنی و بێوەیی رادەگەیەنێ و دەپرسێت و دەڵێت:" ئەگەر غەریزەی موڵك و ماڵداری فەخر و مەجد تەنیا بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە و ڕابواردن و بێوەیی و سەرکزیش پەیدابن، ئەوا دەوڵەتیش پیر دەبێت". مانای ئەوەش ئەوەیە کە "قازانجیان زۆر دەبێت و ئەرك و مەسرەفیان لەبەخششیان زیاتر دەبێت و دەسهاتیان بەشی خەرج و مەسرەفیان ناکات و هەژاریان پەکی دەکەوێت و دەمرێت و دەوڵەمەندیان هەموو بەخششێکی بە ڕابواردن دەدات. ئەو نەریتانەش لە وەچەکانی پاش خۆیاندا پەرەدەستێنێت تا بە تەواوەتی بەخشش کەم دەبێتەوە و ڕابواردن و قازانج و دەسکەوتیش کورت دەهێنێ و ئەوسا هەست بە ئیحتیاجی دەکەن و مەلیکەکانیشیان داوایان لێ دەکەن، کە لە تالآن و برۆی جەنگدا دەست بە خەرج و مەسرەفەوە بگرن.

ئەوانیش هیچ دەرفەتێکیان بە دەستەوە نامێنێت، لەبەرئەوە مەلیکەکانیان سزایان دەدەن و سامان لە زۆربەیان دەستێنن و بۆ خۆیانی دەبەن و بەشی منداڵ و لایەنگر و کۆیلەکانی خۆیانی لێ دەدەن. بەو جۆرە وەهایان لێ دەکەن، کە نەتوانن حاڵی خۆیان بەڕێوەببەن، بەو جۆرە ئەوانە کەم هێز دەبن، بێگومان خاوەنی دەوڵەتەکەشی وەك ئەوان پەکی دەکەوێت١٣٧".

کەواتە چار نییە، پێویستە هەر هیچ نەبێ هەردوو تای تەرازووەکە هاوسەنگ رابگیرێت "واتا دەسهات و خەرج" بەقەدەر یەك بن، تاکو ئەوەی دەوڵەت بتوانێت ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بگەیەنێت و وەزیفەی خۆی بەرێ بخات. بە نموونە وەك پاراستنی نیشتیمان. ئینجا دەڵێت: کۆکردنەوەی باج لە خەڵك "واتا دەسهاتی دەوڵەت" بڕێکی دیاریکراو و کەمە. نەزیاد دەکات و نەکەم دەکات. ئەگەر مزەیەکیس (مکس) تازە پەیدابێت و وەربگیرێت، ئەوە کەمە و بڕەکەشی دیاریکراوە.

---

١٣٧ - ص ٢٩٧- ٢٩٨.

خۆ ئەگەر زیادەی ئەو باجانە کە بەهۆی ڕابواردن و ئەرك و مەسرەفی زۆرەوە بەر هەریەکەیان دەکەویت بەسەر بەخششەکاندا دابەش بکرێت، ئەوجا ژمارەی حامییەکە لە ژمارەی پێش زیادبوونی بەخششەکانیان کەمتر دەبێت و حیمایەکە لاواز دەبێت١٣٨.

پاشان ئیبن خەلدون هەواڵەمان دەکات کە سەیری مێژووی دەوڵەتان بکەین، بزانین قسەکانی ڕاستن یان نا ، دەڵێت:

"هەر وابزانە لەو دەوڵەتانەدا ڕوودەدات، کە دەنگوباسیان لە ڕۆژنامەکەی بەردەستتدا نووسراوە. دەبینیت کە بێگومان هەموو ئەوەی کە پێم گوتی ڕاستە"، بەلاّم جاری وەها دەبێت شتی وەها ڕوودەدات ڕووخانی دەوڵەت پاش دەخات. کاتێ کە خاوەنموڵك (مەلیك) جۆرە کارێك دەکات، هێز و توانا دەگەڕێنێتەوە بۆ دەوڵەت و دووبارە خوێن بە دەمارەکانیدا دەگەڕێت هەرچەندیشە تا ماوەیەك بەردەوام دەبێت ،ئەوجا دەڵێت:

"ئەگەر دەوڵەتێك لە سایەی ڕابواردن و ئاسوودەیدا تووشی پیری ببێت، ئەوە لەو بارەدا ڕەنگە خاوەن دەوڵەتەکە دۆست و لایەنگرانی بیانی هەڵبژێرێت لەوانەی، کە بە توندی و وشکی ڕاهاتوون و بیانکات بەسەربازی خۆی، چونکە ئەوانە لە شەڕدا زێتر خۆیان ڕادەگرن و کۆڵ نادەن و لە برسی و کەم دەرامەت باشتر و زێتر بەرگەی لێقەوماوی دەگرن. ئەوە دەبێتە دەرمانی پیریی دەوڵەتەکە تا ئەو کاتەی کە خوا چارەنووسی دیاردەکات١٣٩.

پاشان ئیبن خەلدون دەگەڕێتەوە سەر کیفایەتی نەوەکان و دەڵێت: " بەسەرچوون و نەمانی پارەداری و دەوڵەمەندی لە نەوەی چوارەمدا ڕووی دا، وەلێ خانەدانی و دەوڵەمەندی لە چوار پشتدا دەبێت، بەڵگەی سروشتی و تەواوو ئاشکرامان دایە دەستت فەرموو سەرنجی لێ بدە ،

---

١٣٨ - ص ٢٩٨.

١٣٩ - ص ٣٠٠

ئەگەر هەق و هەقیانەت بزانیت، بە هەق لانادەیت١٤٠." ئەمە باوەڕی ئیبن خەلدون بە بیرۆکەی خولا و خول بوونی مێژوو دەچەسپێنێت، زۆر بە وردی باسی کردووە.

ئاواتی ئیبن خەلدون ئەوە بووکە مێژوو بکات بە چیرۆکی پەیدابوون و بەرزبوونەوە و بیکات بە دەفرێکی گەورە جێگای هەموو ڕووداوەکانی شارستانییەتی تێدا ببێتەوە، بەپێی سروشتی ئەو ڕێوڕەسمەی کە بەڕێوەی دەبات و دەیویست بیدۆزێتەوە و ئاشکرای بکات. ئەمڕۆش نووسینی مۆدێرنی مێژوو هەر لە سەر ئەو شێوازە، یان لەسەر چۆنیەکی ئەو شێوازە دەڕوات، نەخاسمە لە دەسپێکی نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەوە١٤١. لە قسەکانی و جێگەیەك زێتری کتێبەکەشیدا سارانشینی (البداوە) بە بناغەی دەوڵەت — بە بناغەی — هەموو دەوڵەتێك دادەنێت.

ڕەنگە، ئەو بۆچوونەی ئیبن خەلدون لەوەوە هاتبێت کە خودی خۆی، هەر تەنیا خۆی کەوتبێتە ژێر کاریگەریی لێکدانەوەی یەکلایەنەی خودی خۆیەوە. کە پشتی بە لێکۆڵینەوەی چەند جوونێکی دیاریکراوی شارستانییەتی تایبەت بە چەند کۆمەڵێکی کەمی فرەلایەنەی ئینتولۆژیی و سروشتیی لێك نزیکی وەك عەرەب و بەربەر و ڕەنگە وەك تەتاریش بەستبێ، کە ئەوانە کۆمەڵگای سارانشینن١٤٢.

وەکو باسیشمان کرد، لەناو بیرمەند و خاوەن بیرۆکەی فەلسەفیدا کەسانی وەها پەیدابوون، مێژوویان لەسەر ڕووناکیی بیرۆکەی — خولاوخول لێك دەدایەوە، چ ئەوانەی وایان دەزانی، کە مێژوو بە پێی ژیانی خولاوخولی یەك لە دوای یەك دەڕوات و خولاوخول، بەهەر شێوەیەك بێت. خۆی تازە دەکاتەوە چ ئەوانەش کە باوەڕیان بە بیرۆکەی سەرکەوتن یان بە پێچەوانەی سەرکەوتن هەیە — پێدەچێ ڤیکۆ ناودارترین و دیارترینی ئەو کەسانە بێت، کە بڕوای بە بیرۆکەی خولا و خول هێناوە، ڤیکۆ هەم فەیلەسووفی مێژوو و کۆمەڵایەتی بووە، هەمیش وەستای زمان و قانوون بووە.

---

١٤٠ -ص ٣٠٣

١٤١ - محمد الطالبی ، ل٣٦ ، مەبەست لەسەدەی بیستەمە.

١٤٢ - د. عبدالرحمن بدوی: ابن خلدون وارسطو. ضمن مهرجان ابن خلدون، ١٦١ص- ١٦٢.

باسکردنی ئەم فەیلەسووفە گرنگیی لە باسکردنی ئیبن خەلدون کەمتر نییە، ئەویش وەکو ئەم هزرێکی قووڵ و بیرۆکەی ورد و گشتگیر و هەڵهێنجانی فراوانی هەبووە و لێتوێژینەوەی لەگەڵیّ بواری بزاڤی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایینی و هزریدا کردووە١٤٣.

ڤیکۆ لە شاری ناپۆلی لە ئیتاڵیا ژیاوە. لەو بڕوایەشدا بوو کە مێژووی ئادەمیزاد لەوانەیە بکەوێتە ژێر باری لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی زانستییەوە ( Exact scince) بەو پێیە ڤیکۆ هزر و بیری خۆی لەبارەی فەلسەفەی ئاوەدانی لە کتێبەکەی خۆیدا:" زانستی تازە (The New science) خستەڕوو. لەو کتێبەدا ویستی ئەوە روون بکاتەوە، کە بۆچی "گۆڕانی شارستانییەت" دێتە ڕێگای کۆمەڵگەکانی ئادەمیزاد؟ ئەنجام هاتە سەر ئەوەی بڵێت: کە ئەو کۆمەڵگەیانە بە چەند قۆناغێکی دیاریکراودا تێپەڕ دەبن وگەشە دەکەن، ئینجا بەرەو چاکتر دەڕۆن و پاشان لەناودەچن، چونکە سروشتی ئەو دیاردە و ڕووداوانە لە ژێر سایەی گومان و تێکەڵ و پێکەڵیدا بە شێوازێکی دیاریکراو روودەدەن، جا ئەو تێکەڵ و پێکەڵییە و ئەو هەلومەرجە لە هەر جێگایەکدا بن، دیاردەکانیش روودەدەن١٤٤.

ڤیکۆ کە بیروبۆچوونی خۆی دەخاتەڕوو، پشت بە مێژوو دەبەستیّ، لەوەدا دەیەوێت بەرپەرچی دیکارت بداتەوە، چونکە دیکارت پشت بە ماتماتیك (ریاضیات) دەبەستێت نەك بە مێژوو، دیکارت لەناو هەموو مەعریفەکاندا تەنیا هەر (ریاضیات) بە مەعریفە دادەنێت و هەر لەسەر ئەم بڕوایەش داکۆکی لە مەعریفەی ماتماتیکی دەکات و ئەو حەقیقەتەش هەر دەڵێت و دەڵێتەوە، کە: (لەوە زێتر کە خودی خۆمان کردوومانە، هیچی تر بە تەواوی نازانین) ئەو قسەیەش ئەو بنەما فەلسەفییە هاوبەشەیە کە لە سەردەمی (فرەنسیس بیکون) و (هۆبز) و (دیکارت) و (کانت) و (فیختە) وە دەست پێ دەکات تا دەگاتە سەردەمی (لایبنتز). ڤیکۆ، ئەم پڕۆژە تایبەتەی خۆی بەناوی (زانستی نویّ) وە ڕادەگەیەنێت.

---

١٤٣ - د. صالح احمد العلي، م.س، ص ١٩.

١٤٤ - عفت الشرقاوی: ادب التاريخ عند العرب، بيروت، دار العودة، ١٩٨١، ص٣٧.

مەبەستیشی لەوە (زانستی مێژوو) ە، دەڵێت: ئەم زانستە، هەر وەکو زانستی ئەندازە خودی خۆی هەموو جۆرە پێوەرەکان دەگۆڕێت (تخلق) و بەپێی ڕەگەزە تایبەتەکانی خۆیان دایان دەنێت، بەلاّم بە واقیعییەتێکی یەکسان، بەو قانوونانەی پێوەندییان بە مەسەلەکانی مرۆڤەوە هەیە و لە واقیعییەتی (خاڵ و، خەت، هێڵ و، ڕووبەر و شێوە) زیاتر دەگرێتەوە ١٤٥.

جا هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بە ئاسەواری بیرۆکەی مەعریفەی مێژووکردی ڤیکۆ، هەڵوێستمان بەرامبەر بە بنەمای بیرۆکەکەی یان بە درێژەی باسی بنەماکانی بیرۆکەکەی هەر چۆنێك بێ هیچی تەئییدکردنی ئەو ڕایەی کەمتر نەبووە، کە دەڵێت: لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان و سەیرکردنی بەڵگەنامەکانیان نابێتە تەنیا شێوازی ڈروستی ساغکردنەوەی زانست ڤیکۆ خۆی ئەوە روون دەکاتەوە، کە زانینی هزرەکان و کەسەکان و ڕووداوە گۆڕاوەکانی مێژوو، دڵنیاییەکی زێتر فەراهەم دەکات لە قسەی ئەوانەی ،کە گۆیا هیچ بەهایەك بەهیچ بیرۆکەیەك نادەن، تەنها بایەخ بە ماتماتیك (الریاضیات) و زانستەکانی سروشت نەبێت١٤٦.

ڤیکۆ، ڕای وایە ئەگەر دەربڕین و گوزارشتەکان ڕوون بن، ئەوە بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر ڕاستیی قسەکانی ئەو، وەلێ هیچ بەڵگەیەك ناهێنێتەوە بۆ پەسەندکردنی ئەو ڕاوبۆچوونەی خۆی، لە کاتێکدا کە بیرۆکەکە، لە حەقیقەتدا بریتییە لە خورافات و هیچ بناغە و بنچینەیەکی نییە و وەکو ئەوانەیە کە ڕێگەی — سەلماندنی سەفسەتائییەوە — ساغمان کردەوە. ئینجا دەڵێت: مەسەلەکە پێویستی بە دانانی ڕێسایەك (قاعدە) هەیە، بتوانین بەپێی ئەو ڕێسایە بزانین: چی یارای زانینە و چی یارای زانین نییە، لێکیان جیابکەینەوە.

---

١٤٥ - هورکهایر، ماکس، بدایات فلسفة التاریخ البورجوازیة، ترجمة: محمد علي الیوسفي، بیروت، دار التنویر، ١٩٨١، ص٨٠.

١٤٦ - البان.ج. ویدجری: المذاهب الکبری في التاریخ، ترجمة: ذوقان قرقوط، بیروت — دار القلم، ط٢، ١٩٧٩، ص ١٩٢، کولنجوود، ص١٣٠

ڤیکۆ ئەم بنەمایەی (واتا ئەم پرەنسیپەی) لە بیرۆکەیەکدا بەرچاو کەوت، بیرۆکەکە دەڵێت: مەرجی توانای زانینی هەر شتێك ئەوە نییە، کە تەنیا هەستی پێ بکەی، بەڵکو مەرجی توانای زانینی ئەو شتە ئەوەیە، کە ئەو کەسە خۆی لە ئەسڵەوە دروستی کردبێت. بەپێی ئەم بنەماو پرەنسیپەی ڤیکۆ، کەواتە هەر تەنیا خودا دەتوانێت لە سروشت (لە گەردوون) بگات و بیزانێت. وەلێ ئادەمیزادیش لە زانستی ماتماتیك (ریاضیات) دەگات، چونکە بابەتەکانی بیرکردنەوەی ماتماتیکی (ریاضیات) بریتین لەو گریمانە (افتراضات) زانستیانەی کە بیرمەندە هزرکارییەکان دایانهێناوە. پاشان ئەگەر خۆ ئادەمیزاد زانی ئەوە مانای ئەوە نییە، کە تۆ ئەو شتانەت گوراندووە (خولْقاندووە).بەپێچەوانەی ئەوەش شتێك ناتوانرێت بزانرێت، مەگەر گوراندنەکەی پێش زانینەکە کەوتبێت١٤٧.

ئەم بنەما و پرەنسیپە مانای چییە؟ پێوەندیی ئەم زانینە بە لێکدانەوەی مێژووەوە چییە؟

مانای ئەم بنەما و پرەنسیپە کە ڕاستی و دروستی زانینە — دەکات بە مەرج ئەوەیە، کە بە کردار جێبەجێ بکرێت و بەرەفتار بکرێت.

مێژوو، خۆی بەرووبوومی ئەقڵی ئادەمیزادە، بەرنامەکەی خۆشە و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە و وەهای لێ کردووە ببێتە بابەتی زانین و زانست بۆ ئادەمیزاد. لێرەدا ڤیکۆ کرداری مێژوو وەها لێکدەداتەوە، کە کردارێکە توانست دەبەخشێت بە ئادەمیزاد تا بتوانێت بیرۆکەی تایبەت بە زمان و نەریت و یاسا و حکومەت دابهێنێت. واتا بەو چاوە لە مێژوو دەڕوانێت کە بریتی بێت لە مێژووی پەیدابوون و گۆڕان و ڕژێمەکانی کۆمەڵانی ئادەمیزاد، ئا لێرەدا ئەوە یەکەم جارە کە بیرۆکەی "بابەتی" مێژوو، لەناو سنووری داڕێژراوی ڕاستی خۆیدا لەم چاخە مۆدێرنەدا، دادەنێت١٤٨.

---

١٤٧ - کولنجوود: ص١٣١.

١٤٨ - م. ن ص ١٣٢.

لێرەوە نیشانەکانی (ئاسەواری ) ژینگەی ئەقڵی یان ئەوە کاریگەرییانە روون دەبنەوە کە هزرە مێژووییینەکانی فەیلەسووفی ئیتالی ڤیکۆیان پێك هێناوە، بەلاَم بیرۆکەکەی لەسەر قۆناغەکان (زەمەنەکان) کە شارستانی (الحضارة) پێیاندا گوزەرە دەکات، ئەوە ئەو بیرۆکەیە لەسەر بنچینە (اساس) ی سێ چاخی بەدوایەك (المتعاقبە) دەوەستێت، کە گەلێ جار بەو قۆناغانە یان بەو نەوانە بەراورد دەکرێن، کە ئیبن خەلدون باسیان دەکات. ئەو چاخانەش ئەمانەن:

١- چاخی یان (زەمەنی) بتەکان (ئالیهەکان): لەو چاخەدا ئادەمیزاد پێشکەوتنی شارستانییەتیان دەبردەوە سەر بەخششی یان تەگبیری یەکەو ڕاستی خوداوەند (ئیلاهە)، چونکە تەنیا ئەو فەرمانی بە هەموو شتێك دەدا، کەواتە ئایین دەبێتە دەستپێکی پەیدابوونی دەوڵەت و ئاوەدانی، چونکە خەڵك لەژێر ئالاَی بڕواکانیدا خڕدەکاتەوە و لەبن دەستی خوداوەند و پێغەمبەرەکانیدا دایان دەنێت. ئەم چاخە وردە وردە تەواو دەبێت و چاخێکی پێشکەوتووتر دادێ، پێی دەڵێن:

٢- چاخی قارەمانان (پاڵەوانان).

لەم چاخەدا چەند سەردارێکی گەورەی خاوەن تموح وەك قانووندانەر و هونەرمەند و فەیلەسووف دەبنە مایەی پێشکەوتن، بە نموونە رۆمۆلۆس و ئەشیل (ئەخیلۆس) و ئەفلاتوون و شەشەرون کە لەم چاخەدا پەیدابوون و هاتنە گۆڕێ. ئینجا پاش ئەوەی کە دەوڵەت (شارستانییەت) ڕۆڵی دیارکراوی خۆی دەگێڕێت. ئیدی — بەرە بەرە — دەچیێتە چاخی سێیەمی ( دواچاخییەوە) کە ئەویش چاخی مرۆڤە:

٣- چاخی ئادەمیزاد:

لەم چاخەدا دان بەو حەقیقەتەدا دەنرێت، کە هەموو ئادەمیزادەکان لە مافەکانیاندا یەکسانن، مادامێکی هەموویان ئەرك و فەرمانی سەرشانیان جێبەجێ دەکەن. لە ئەنجامی ئەوەشدا، لەم چاخەدا دەزگا و حکومەتگەلێکیان دامەزراند

مۆرکی ئەوەیان پێوەبوو، پێداویستی گشت ئادەمیزادەکان پڕدەکەنەوە١٤٩، چونکە لەو پێداویسیتانەوە هەڵقوڵاون. لەم چاخەدا حکومەت دەبێتە حوکمی دەزگاکان و ئامانجەکانی هەموو جەماوەر لەبەرچاو دەگرێ.

لە دووی ئەو ریزبەستنەش جۆرەها حوکمی لێکجیاواز بەپێی ئەو چاخانە پەیدادەبن و دێنە ئاراوە ،ئەمانەن:

١- حکومەتی سۆکراتی: واتا حوکمی کاهین و پیاوانی ئایین، ئەم حکومەتە لەسەر بیرۆکەی ئایینی (بت پەرست، یان ئاسمانی) دەوەستێت.

٢- حکومەتی ئەرستۆکراتی: یان حوکمی دەستبژێرە داهێنەرەکان.

٣- حکومەتی دیموکراتی: (کۆمار، یان مەلەکیی کۆتکراو) لەم جۆرە حکومەتەدا، گەل لە رێگەی دەربڕین و دەزگاکانەوە حوکمی خۆی دەکات. جا بەپێی ڕاوبۆچوونی ڤیکۆ هەموو شارستانییەتەکان (الحضارات) لە هەموو میللەتەکاندا. بەو چاخانەدا گوزەریان کردووە (واتا تێپەڕیون)، پاشان بوونەتە بەربەری (وەحشیگەر) لەو کاتەشەوە ئەم کردارە دووبارە دەبێـەوە. ئەم هەڵکشان و داکشانەو، ئەم خەسڵەتی خولاوخولەی مێژووەش، لە سروشتی خودی رەفتاری ئادەمیزادەوە پەیدادەبێ. خۆ ئەگەر ڤیکۆ دان بەوەدا دەنێت، کە گەلان بەهۆی هاتوچۆ و سەر و سەختی نێوانیانەوە، لەهەندێ ڕووەوە گەلێك لە گەلێك دەچێت، بەلاّم ئەو وەهاشی بۆ دەچوو کە شێوەی ئەو لێکچوونە شێوەیەکی گشتییە و بە شێوەیەکی تەریك و سەربەخۆش، هەر پەیدادەبێت. جا لەبەر ئەوەش کە سروشتی ئادەمیزاد چەندین خەسڵەتی هاوبەشیان تێدا هەیە (کە دواتر لە باسی شپینگلەردا ڕوونی دەکەینەوە). وەلێ رێسای هەڵکشان و داکشان (المدو الجزر) هەلاّوێری زۆری تێدا هەیە و بە ئاودامانی یارای گۆڕینە.

---

١٤٩ - ایمری نف: المؤرخون و روح الشعر، ترجمة: توفیق اسکندر، مکتبة الانجلو، المصریة، القاهرة، ١٩٦١، ص:١١٠-١١١ ویدجری، م. ن . ص ١٩٤.

لە قۆناغی یەکەمیشدا (قۆناغی خوداوەندەکاندا) میللەت بەرەبەرە لە حاڵەتی سەرەتایی ڕابوردووی خۆیەوە دەردەچێت و دەگاتە چاخی خوداوەندەکان. لەم چاخە نوێیەدا بیروباوەڕی هیچ و پووچ و ترس لە دیاردەکانی سروشت، چاك یان خراپ، تووڕەبوون یان ڕازیبوون بە ویست و ئیرادەی خوداوەند دادەنرێ.

هەروەهاش فریشتە (ڕوح)ی چاك و فریشتەی شەڕەنگێز جڵەوی چارەنووسی ئادەمیزاد دەگرنە دەست. ئەم چاخە چاخی داستانی بتپەرستییە و دەسەلاتەکانی کە هەنۆت دەیگرنە دەست خۆیان و ڕایدەگەیێنن ،کە مافی خۆیانە هەر قانوونێکیان بە دڵ بێت، جێبەجێی دەکەن، چونکە ئیرادەی خوداوەندی بالایە.

لەم چاخەدا، بۆ سەپاندنی قانوون لەم قۆناغەی ژیانی کۆمەڵگەکاندا، تورەیی (غەڕینی) سروشت بە تورەی (غەزینی) خوداوەند دادەنێن و خەڵکی پێ دەترسێنن و دەیکەنە داردەستی (الوسیلە) خۆیان بۆ ترساندن جڵەوکردنی هەڵپەی (جماح) فەرد.

لەمەوە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە ڤیکۆ لە مەسەلەی پەیدابوونی دەوڵەتدا کەوتبووە ژێر کاریگەریی هزری ئایینییەوە، چونکە ڤیکۆ ئایین بە بناغەی دروستبوونی دەوڵەت دادەنێت کە پەیدابوونی شارستانییەتی لەسەری دەوەستێت. ئالێرەدا هزرەکەی لە هزری ئیبن خەلدون دەچێت و زۆر لێی نزیکە، چونکە ئیبن خەلدون ساراگەریی بە ئەسڵی دەوڵەت لە قەڵەم داوە، بەلام ئەم ساراگەرییە بەبێ تیکەڵبوونی ئایین ناچێتــە سەر و دەوڵەت دروست ناکات. ئەوەتا دەڵێت: دەوڵەتی داگیرکاریی گشتی و خاوەن بزرگیی موڵك ئەسڵەکەی ئایینە، یان لە پێغەمبەرەوە، یان لە بانگەوازی هەقەوە. چونکە موڵك بە بەزاندن و سەرکەوتن دێتە دەست، بەزاندن و سەرکەوتنیش لە دەمارگیری و یەکبوونی ئارەزووی داواکارییەکانەوە پەیدادەبن، کۆکردنەوە و یەکبوونی ئارەزووەکانیش بەیارمەتیی خوا پەیدا دەبن، کە دەیەوێت ئایینەکەی دامەزرێنێت ئەوەتا ئیبن خەلدون بۆ بەهێزکردنی ڕاوبۆچوونی خۆی ئەم ئایەتە دێنێتەوە کە دەڵێت: "لو انفقت ما في الارض جميعا ماإلفت بين قلوبهم١٥٠"

---

١٥٠ - المقدمة:ص٢٧٧.

واتا " ئەگەر هەموو ماڵی دنیاشیان بۆ سەرف بکەی ناتوانیت دڵیان بکەیت بە یەك" هەروەها دەڵێت:" چونکە بانگەوازی ئایینی هێزی ئەسڵیی دەمارگیریی دەوڵەت زیاتر دەکات١٥١".

جا بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار کۆمەڵگە دەگاتە چاخێکی نوێ، یان قۆناغی دووەم (قۆناغی قارەمانەکان) لەم قۆناغەدا کۆمەڵگەی خوداوەند دەست دەکات بەیەکگرتن و کۆمەڵی گەورەتری لێ پەیدا دەبێت بۆ ئەوەی ڕووبەرووی مەترسیی دەرەکی بوەستێت یان بۆ ئەوەی ڕێگا لە داتەپانی (تدهور) ناوخۆی بگرێت. لەم قۆناغەدا، ئارەزووی قارەمانێتی و نازی هێز بەسەر سروشتی ئادەمیزاددا زاڵ دەبێت و ئایین و زمان و ئەدەب و فەلسەفەش مۆرکێکی تایبەتی داستانئاسا بەخۆوە دەگرن، بەلاّم دەسەلاّت لە دەستی کاهین و سەرانی ئایینەوە دەکەوێتە دەست زەلامی جەنگ و جەنگاوەر و سوارچاکان. لەم حالّەتەدا هێز دەبێت بە کوڕی مەیدان بە قانوونی بەرکار و مافیش تەنیا هێزی چەکدار بڕیاری لەسەر دەدات، لەوەشەوە سیستەمێکی ئوروستۆکراتی (دەولّەمەند) حوکم دەکات، کە لەسەر دابڕکردن و جیاکردنەوەیەکی تەواوی نێوان — مافی گەورەکان — و مافی گەل (مافی ڕەشۆکییەکان) دروست دەبێت. جا ئەم قۆناغە — واتا ئەم قۆناغی قارەمانانە — کە لەلای ڤیکو هەیە لەلای ئیبن خەلدون پێی دەڵێن (طور الاستبداد) واتا قۆناغی حوکمی تاکەکەسی یان قۆناغی (حوکمی هەوەس) واتا سەپاندنی ڕای یەك کەس بەسەر خەلّك و کۆمەلّگەداو داگیرکردنی حوکم و مولّك تەنیا لەلایەن ئەو کەسەوە دەبێت سەرکوتکردنی باقیمەنی خەلّکەکە کە نەتوانن لە حوکمدا هاوبەشی بکەن و بەشداربن١٥٢.

وەلێ کۆمەلّگە درێژە بە ڕەوتی خۆی دەدات و دەگاتە قۆناغێکی نوێ لەسەردەمێکدا کە جەماوەری گەل دەست دەکات بە داواکردنی مافەکانی

---

١٥١ - م. ن ص٢٧٧

١٥٢ - م. ن ص ٣١١.

هاووڵاتیبوونی خۆی، لێرەدا قۆناغی سێیەم (چاخی ئادەمیزاد) دادێت، ئەم قۆناغە سیمای دیموکراتی پێوە دیارە و دان بە یەکسانبوونی ئادەمیزاددا دەنرێت و سیستەمی تاکەکەسی و ڕای یەك کەس دەرووخێت و نامێنێت، چونکە ئەم چاخە چاخی ئەقڵە و بڕوای بە توانست و قودرەتی ئادەمیزاد هەیە و هەوڵ دەدات و دەست بەسەر سروشتدا بگرێت و ئەوەش لە وشەکانی زمان و جۆری ئەو قانونانەوە دەردەکەوێت، کە لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵەکەدا پێکەوە بەستراون.

بەڕای ڤیکۆ ئەم چاخە تۆی ڕووخان و لەناوچوونی شارستانیی لەناوخۆیدا هەیە، چونکە دیموکراتییەت و ڕاگەیاندنی یەکسانی لە ناو خەڵکی کۆمەڵگەدا زۆری پێ ناچێ جەماوەری ڕەشۆکی دەمشێرین دەکەن، کە زیاتر داوای مافەکانی خۆیان بکەن و ململانێ لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگەدا گەرمتر دەبن، لەوەشەوە پێوەندیی ئاسایی لە نێوان ئەم چینانەدا کز و لاواز دەبێت و، خەڵك لە هەندێ بەهای میراتی کۆن و نەریتی ڕەزامەندی دەکەونە گومان و ئەوجا هەڵوەشان و داتەپان و گەندەڵی دێنە مەیدان، ئەوانەش نیشانەی کۆتایی خولی شارستانییەتیان پێوەیە. خۆ ئەگەر کۆمەڵگە بگاتە ئەم حاڵەتە و گلۆڵەی بەرەو لێژی بچێت، ئەوا لە ناوەوە ڕاست ناکرێتەوە و چاری ناکرێت، ئەوجا یان دەبێ بێگانە داگیری بکات یان بەیەکجاری لە ناوەوە تووشی هەڵوەشان و ڕووخان دەبێت. ئەوجا ئەو کۆمەڵگەیە دوای ئەوە دووبارە دەگەڕێتەوە وەحشیگەرییەکی ڕەشۆکی (گشتی) و خولێکی تازەی ئاوەدانی دەست پێدەکات، خۆی لە خۆیدا لە خولەکەی پێش خۆی باڵاتر و چاکتر دەبێت. ئەو خولەی کە باسمان کرد، بە هەمان شێواز ڕۆیشتووە و پلە بە پلە - بە ئاسایی - لە چاخی خوداوەندەوە (بتەوە) گەیشتووەتە چاخی قارەمانەکان، پاشان گەیشتووەتە چاخی ئادەمیزاد پاشان داخزاوەتە خوارەوە و کەوتووەتە ناو ژیانێکی وەحشیگەریی تازەوە ئیدی بەو جۆرە ژیانی ئادەمیزاد لە خولی بەردەوامدا سروشتی ئەقڵی شەڕەنگێزی ئادەمیزاد لوولی دەدات و پێش خۆی دەدات[١٥٣].

---

١٥٣ - عفت الشرقاوی: م. س ص ٧٨.

ئەوەمان دیت، کە کۆتایی دەوڵەت لەلای ئیبن خەلدون وەك کۆتایی دەوڵەتەکەی ڤیکۆ وایە. بەلاّم دەوڵەت — بەڕای ئیبن خەلدون لە بناغەدا هەمیشە دەوڵەتی سارانشینە (بدویە) و لەم جۆرە دەوڵەتەدادیموکراتیی جێگەی نابێتەوە.

بەپێچەوانەی ڤیکۆ ئیبن خەلدون لەژێر ناونیشانی "چۆن چۆنی دەوڵەت کرمێ دەبێت" دا دەنووسێت دەڵێت: ئەوە هۆی ئەوەیە کە دەوڵەتەکە شان و شەوکەت و دەمارگیرییەکەی لاوازبووە (واتا هێز و سەربازیی) بێ بەهابووە ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە "ئەو پارە و مەسرەفە نەماوە، کە سەربازەکان گوزەرانی پێ بکەن" ئەوجا خاوەن حوکم هیچی بۆ نامێنێتەوە١٥٤. دەست دەکات بە لێدان و کوشتن و سووکایەتیپێکردن و بێبەشکردنی مسکێنەکانی و ئەو خۆشی و ڕابواردنەشیان لێ دەسێنێت کە زۆربەیان لەسەری راهاتبوون. ئیدی وەهایا لێ دەکات تا دەمرن یان کەم دەبنەوە. دەمارگیریی خاوەن دەوڵەتەکەشی گەندەڵ و بێ خێر دەبێت و "مسکێنەکان لە روویدا دەوەستنەوە" و لە رووی داروودەستەکەشدا بە شێوەیەکی ئاسایی دەوەستنەوە١٥٥.

لەبەرئەوەش کە خاوەن دەوڵەت و ئەڵقە لە گوێکانی ناتوانن پێداویستیەکانی دەوڵەت پڕبکەنەوەو لەبەر ئەوەش کە "مەسرەفی ڕابواردن هەند زیاد دەبێت بە مزە (مکوس) پڕنابێتەوەو، دەوڵەت ناچار مسکێنەکانی خۆی دەچەوسێنێتەوە و دەستدرێژی دەکاتە سەریان و بەبیانووی مزە و بازرگانی و بەپارەی نەختینەش، پارەیان لێ دەستێنێ و خڕی دەکاتەوە١٥٦". نەك هەر هەندە، بەڵکو خاوەن دەوڵەتەکە ئەو قانوونانەش کە سەرباز و ماڵ و موڵك و ویلایەتەکان سیاسەتی دەوڵەتیان پێ بەڕێوەدەبرد، هەمووی دەگۆڕێت بۆ ئەوەی هەمووی بێتە سەر یەك ئاراستەی ئەوتۆ کە

---

١٥٤ - المقدمة:ل٥٢٢.

١٥٥ - م. ن ص٥٢٢.

١٥٦ - م. ن ص ٥٢٦.

دەسهات و خەرج و حیمایەت و رزقی کرێکار (العمالات) و دابەشکردنی دەستکەوت بەسەر رزقەکاندا هەمووی هاوتا بووەستن١٥٧.

دوای دانانی ئەم بیرۆکەیە، واتا (بیرۆکەی خولی بانەوبانییەکی شارستانی) کاریگەرییەکی ئاشکراو و بەرچاوی کردە سەر هزری زۆرێك لە فەیلەسووفەکانی مێژوو بە نموونە وەك "هردر، هیگڵ، مارکس و پاشان شپینگلەر و تۆینبی" و فەیلەسووفی دیکەش. هەریەکە و بەپێی شێوازی تایبەتی خۆی، بەڵام ڤیکۆ ڕاوبۆچوونی خۆی لەبارەی (دوا بە دوای یەك هاتنی خولاوخول) واتا لەبارەی (بانو بان یەك هاتنی خولاوخول) لەسەر بناغەی پێوەندیی ناوخۆیی نێوان جۆرە ڕۆشنبیرییە جۆربەجۆرەکانی باوی ناو کۆمەڵ"ە دادەڕێژێت ، واتا خولەکانی ئاوەدانبوونەوەکەی وەها لێ دەکات، کە یەك بگرنەوە و ئەمیان ببێتە هۆی پەیدابوونی ئەویان و بە شێوەیەکی بەردەوامیش خولەکان دووبارە ببنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گەڕانەوەو دووبارەبوونەوەیە ئەو مەرجە ناگەێنێت کە — زەرووڕەتە- مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە، چونکە ڕەوتی مێژوو وەك پێچکە (عجلە) بە دەوری خۆیدا ناسووڕێتەوە، تا فەیلەسووفی مێژوو بزانێت لە ئایندەدا چی ڕوودەدات و چی ڕوونادات تەنیا ئەوەندەیە کە بەڕای ئەو مێژوو بە بزووتنەوەیەکی مارپێچ ئاسا (لولبیە) ی بەرەو ژوور سەردەکەوێت و هەمیشە تازەش دەبێتەوە، کتومت لەسەرکەوتنی کەسێك دەچێت، کە بەرەو هەوراز تادەگاتە لوتکەی چیا، وەك مارپێچ بە دەوری چیاکەدا بەرەو ژوور (بەرەو هەوراز) دەسووڕێتەوە، واتا خول لە دوای خول بەرزتر دەبێتەوە، مەبەستیشی ئەوەیە کە خولەکانی مێژوو تا سەرکەون بەرزتر دەبنەوە، بەوەش ئاسۆی لێکدانەوە فراوانترو زێتر دەبێت. ئەوەتا دەبینین وەك ئەو دەڵێت: وەحشیگەریی مەسیحییەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا جیاوازترە لەوەحشیگەریی بتپەرستانی سەدەی هۆمیرۆس، چونکە وەحشیگەریی مەسیحییەتی ئەو کاتە مۆرك و داخی جیاوازی خۆی هەبوو، دەیسەلماند کە بەبێ

---

١٥٧ - م. ن ص ٥٢٩.

زیادو کەم بریتییە لە دەربڕینی ئەقڵی مەسیحییەت ١٥٨. ڕەنگە ئەم تازەبوونەوەی بەردەوامی بزووتنەوەی مێژووەش، ئەو نیشانەیە بێت، کە بیرۆکەکەی ڤیکۆ لە بیرۆکەکانی پێش ڤیکۆ جیادەکاتەوە، کە باوەڕیان بە خولەکانی ئاوەدانی هەیە و لەبەرنامەی گەڕانەوەکانی مێژوو لانادەن بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ئاسانە بڵێین پێشبینی دەکات و زەحمەتە بڵێین باوەڕیان بە پێشکەوتن هەیە. وەك ڕاوبۆچوونی ئەفلاتوون — لە کۆنەکان — و ڕاوبۆچوونی ئیبن خەلدون لەلای عەرەب و میکاڤیلی کە لە هزرمەندەکانی سەدەی ڕێنیس.

لە هەر ئەڵقەیەك لەم ئەڵقانەی شارستانی ڕۆشنبیری جۆرەکانی ئایینی و سیاسەت و هونەر و ئەدەب و قانوون و فەلسەفەی باو بە شێوەیەکی ئۆرگانی لە ناوەوە بەیەکەوە دەبەسترێن بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هەر ئەڵقەیەکی مێژوویی مۆرکی تایبەتی خۆی دەبێت، ئەو مۆرکە بە بوارە جۆربەجۆرەکانی ڕۆشنبیریی ئەو ئەڵقەیەدا گوزەر دەکات.

بەڵام ئامێرەکانی دەربڕین و بڕوا و ڕێکخستن.. هتد، کە چاخە هاوجێیەکانی (المتناظرە) مێژوو پەیدایان دەکەن چۆن چۆنی لێك دەچن؟ لەو کاتانەدا لێك دەچن و هاوشێوە دەبن، کە شارستانی بەشێوەیەك یەك لە دوای یەك بەو چاخانەدا تێدەپەڕێت. ڤیکۆ وەهای بۆ دەچێت، هەر چاخێك لە چاخەکانی قارەمانێتی دوا کلاسیکێکی پێڕۆکردووە هزری لە خەیاڵی بەهێزتربووە و، داڕشتنی پەخشان (النثر) لە شیعر بالاتر بووە و پێوەری ڕەوشتی هێمنی و ئاشتی لە تیۆری شەڕ و جەنگ بەبرەوتر بووە. لە چاخی بەربەریشدا واتا لە چاخی وەحشیگەریشدا. وەك ئەو ناوی دەنێت — ڕامان (التامل) پەیدادەبێت یان بیرکردنەوەی بەربەری پەیدادەبێت، تا ئێرە هەر هزر دەستبالآیە — وەك ئەو

---

١٥٨ - کولنجوود: م. س.ص ١٣٦- ١٣٧. د. عبدالعزیز الدوری: م.س.ص٦٨ ، د. احمد محمود صبحی م. س.ص ١٦٠.

دەڵێت — بەڵام چ جۆرە ڕامانێك و بیرکردنەوەیەك ؟ مەبەستی بەو جۆرە ڕامان و بیرکردنەوەیە کە وزەی دروستکاری و داهێنانی لە دەست داوەو نەماوە و تەنیا تانوپۆیەکی ڕووالەتی بۆش و بەتاڵە و مۆرکی خۆماندووکردنێکی کاڵ و کرچی پێوە دیارە و هیچی دی١٥٩.

دواقۆناغی خولەکان ئەو قۆناغەیە کە ئەو گەلەی حوکمی خۆی دەکات دەکەوێتە ناو چلکاوی خۆیەتی (الفردیە) و خۆپەرستییەوە و کەسیان یاریدەی کەسیان نادەن و بەرژەوەندی گشتی لەلای ئەوان هیچ نییە. بەو جۆرە وڵاتەکەش بەتەنیا دەمێنێت و دەکەوێتە بەرچنگی غەزاچییەکان، غەزاچییەکانیش تاقمێکن لە قۆناغی خوداوەند (بت) دا دەژین و لافی قارەمانان لێ دەدەن، خۆ ئەگەر ئەم غەزاچییانەیان تووش نەبوون، "واتا ئەگەر هێزی دەرەکی" دەست نەکەوت، ئەوا خۆیان بە ئاژاوەگێڕی (الفوضی) خۆیان لەناو دەبەن، جا ئەم قسەیە لە قسەکانی ئیبن خەلدون دەچێت ئەوەتا، دەڵێت:"پاراستن و پارێزەرانی دەوڵەت کز و لاواز دەبن و دەوڵەتە دراوسێکانی پەلاماری دەدەن، یانیش خێڵ و چەتەکانی ژێر دەستی خۆی پێی دەوێرن و لێی هەڵدەگەڕێنەوە١٦٠". خۆ ئەگەر دەوڵەتێکیش لە تەمەنی خۆی زیاتر ژیا، ئەوە لەبەر ئەوە نییە کە هێشتا هێزی تێدا ماوە یان کەسێك هەیە بیپارێزێت، نەخێر بەڵکو لەبەر ئەوە ماوە، کە هێشتا داواکاریی جێگەکەی و هێزە تازەکە، کە بۆ کەلاکی دەوڵەتە پیرەکان دەگەڕێن نەهاتوون و دواکەوتوون "واتا دەوڵەتەکە پیربووەو پەکی کەوتووە، بەڵام هێشتا قەسابەکە (جەللادەکەی) پێیڕا نەگەیشتووە، خۆ ئەگەر جەللادەکەی ئامادەش ببێت، ئەوا بەردەمی چۆڵە و کەس نابینێت پارێزگاریی لێ بکات١٦١. یان وەك ڤیکۆ دەڵێت:- لە حاڵەتی تەنگانەو ئاژاوەدا، خودا بە مەرحەمەتی خۆی پێیدا ڕادەگات و قارەمانێك دەرەخسێنێت، ئەگەر ئەوەش نەبوو،

١٥٩ - کولنجوود: ص:١٣٦.

١٦٠ - المقدمة: ص٢٩٨.

١٦١ - م. ن ص ٣٣.

ئەوا گەلێکی بالاتر غەزوی دەکات، ئەگەر ئەویش نەبوو، ئەوا دوا دەرمانی لە مردن زیاتر نییە١٦٢.

ئەو ئاژاوەیەی کە ڤیکۆ باسی کرد و تووشی دەوڵەتان دەبێت پێش ئەوەی بکەونە ژێر چنگی بەریەرە تازەکانەوە و بەرلەوەی بڕووخێن، ئەو بە زەرووڕەتێکی قۆناغەکەی دادەنێت بۆ تازەکردنەوەی لاوێتیی هێزی ئاوەدانی و ماوەیەکی بە دوا دێت، هەموو کەسێك تەنیا ئاتاجی زەرووڕەتی ژیان دەبێت، بۆ ئەم زەرووڕەتەش هەندێ خەڵك ناچاردەبن یەك بگرن بۆ بەرهەمهێنانی (الانتاج) کالاّی ماددی. جا ئەگەر کەسێك دەستکەوتیان لەو کارە ببینێت چاویان لێ دەکات و دەگەڕێتەوە سەر شتە باشە ساکار و ئاساییەکان کە خەڵك یەکەم جار پێڕۆیان دەکرد. واتا دەگەڕێتەوە سەر بەهای دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و ئایین، ئادەمیزاد هەتا هەتایە ئاوەدانی دەپارێزێت١٦٣.

ئیمری نف- دەڵێت: ڤیکۆ وەها وەسفی ئەو ئاژاوانە دەکات، هەر دەڵێی کوڕی سەدەی حەڤدەم و هەژدەمە و پێشبینی دەکات. قسەکانی ڤیکۆ لەسەر ئەورووپای نێوان هەردوو جەنگە جیهانییەکەی سەدەی بیستەمدا دەچەسپێ، ئەوەتا دەڵێت: ئەگەر بارودۆخی گەلان، بەم نەخۆشییەی کە دووچاری ویژدانی هاوولاّتیان دەبێت پیس ببێت، ئەوا ڕەحمەتی خوا، لە گەرمەی نەخۆشییەکەدا ئەم دەرمانەیەکلاکەرەوەی (الحاسم) بۆ دەدۆزێتەوە، ئەویش ئەوەیە، مادامێکی ئەم گەلانە هەروەکو ئاژەڵ تەنیا هەر بیر لە بەرژەوەندی خودی خۆیان بکەنەوە و هیچی تر و مادامێکی هەست و ڕوحیان لە خەڵك جیابۆتەوە و تەریك و تەنیا ماون و ئاواتیان بە جۆرێکی ئەوتۆ تەریك ماوە، کە تەنیا دووکەس لەسەری ڕێك ناکەون. مادامێکی مەسەلەکە ئاوەها بێت کەواتە دەبنە تاقم تاقم و شەڕی بێ ئەنجامی ناوخۆیش ڕوودەدات و شارەکانیش دەبن بە جەنگەڵ و جەنگەڵەکانیش دەبن بە کونە مشك و خەڵك خۆیانی تێدا

---

١٦٢ - احمد محمود صبحی: م.ن،ص١٥٣.

١٦٣ - ایمری نف: م. س، ص١١٢.

حەشاردەدەن و عەقڵی ژێر پەردەش بیروڕای نەگبەتی وەهای لیّ پەیدا دەبێت، کە زۆر لە بیروڕای دڕندەکان خراپترە، چونکە تەنیا بیرکردنەوەکەی لە بیرکردنەوەی وەحشیگەریی سەرەتایی خراپترە، جا مەسەلەکە، ئاوەها بێت، کەواتە ئەم گەلانە بەدەستی خۆیان ماڵی خۆیان کاول دەکەن و کاری خۆیان دەخەن١٦٤.

دەفەرموو، گویّ بگرە لە ئیبن خەلدون کە خەبەری مەرگی دەوڵەتی پیردێنێت و نەقومیّ دەرمانی ئارامی (التسكين) و نەهیچ دەرمانێکی چالاکی دادی نادات، ئەوەتا لە باسی " ئەگەر پیری تووشی دەوڵەت هات ئیدی لە کۆڵی نابێتەوە" قسەکەی خۆی بەم ڕستانەی خوارەوە کۆتایی پیّ دێنێت:" لەوانەیە لە دوا دوای ژیانی دەوڵەتدا جۆرە هێزێك بە بەر دەوڵەتەکەدا بێتەوە، وەها بزانێت کە پیرییەکەی نەماوە، ئەوە دوا شەوقی کوژانەوەی پلیتەکەیە، هەر وەکو پلیتەیەکی بەکڵپە وەهایە کاتێك لە کوژانەوە نزیك دەبێتەوە، شەوقێکی گەورەی لیّ هەڵدەستیّ خەڵك لای وایە ئەوە گڕەو هەر دەسووتێت، نەخێر ئەوە دواشەوقی پلیتەکەیەو ئیدی دەکوژێتەوە ئیدی ئەو کەسەی کەسە حەرفێکی بەسە یان وەك مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە وەهایە ( ولكل اجل كتاب) کە دەڵێت: "هەر ئەجەلێك فەرز و حوکمی خۆی هەیە ١٦٥".

لە کۆتاییدا دەڵێین بیروڕای ڤیکۆ کاریگەریی ئایینی بەسەرەوە دیارە، نەخاسمە کاریگەریی (سەردەمی کۆن) ئەمەش وای لە بیروڕای ڤیکۆ کردووە، کە لە واقیعی مێژووکرد دووربکەوێتەوە، لە کاتێکدا دەبینین کە بیروڕای ئیبن خەلدون سیمای واقعییەتی ڕاستەقینەی پێوە دیارەو هۆ و هۆکار بەیەکەوە گریّ دەدات. بەجۆرێکی ئەوتۆ کە بوون و واقیع دەچنەوە سەریەك، تا ئەو ناونیشانانەی بۆ دەیەها بابەتی ناو کتێبەکەی خۆی دایانی ناوە، هەمووی مۆرکی مەسەلە هەمووەکییەکانی لەخۆی گرتووە و لەسەر لێکدانەوە وەستاون.

---

١٦٤ م. ن ص ١١١.

١٦٥ - المقدمة: ص٥٢١.

# بەشی چوارەم

## فەلسەفەی سروشتییەت بۆ تەفسیرکردنی مێژوو

## (خەسڵەتی بایۆلۆژیی شارستانییەتەکان) لای شپینگلەر

## دەستپێك:

کەس نەماوە هەوای لێکدانەوەی مێژوو لەسەردابێ و شپینگلەر١٦٦ جێپەنجەی بیری خۆی بەسەر جۆری لێکدانەوەی ئەوەوە دانەنابێت، نەخاسمە بەسەر بیروبۆچوونی مێژوونووسی گەورەی ئەو سەدەی بیستەم" ئارنۆلد تۆینبی و فەیلەسووفی بەناوبانگی ئینگلیز کۆلن ویلسۆن دانەری کتێبی سەربەخۆ (اللامنتمی) و، فەیلەسووفی ئەڵمان هربرت مارکوزەو کەسانی زۆری تریش" کە لە مەودوا باسیان دەکەین . خودی شپینگلەریش کەوتبووە ژێر کاریگەریی بیروبۆچوونی گەورە شاعیری ئەڵمان (گۆتە- Goethe ١٧٤٩- ١٨٣٢) و، نیچەی فەیلەسووفەوە.

شپینگلەر، لەبارەی دروستبوونی شارستانییەت و نەمان و بەسەرچوونی شارستانییەت مەزەندەی خۆی و لێکدانەوەی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەو مەزندەی وایە کە بزووتنەوەی مێژوو بزووتنەوەیەکی بایۆلۆژییەو لەزۆر لایەنەوە لە بیرۆکەکەی (یەك لە دوای یەکی خولاو خول)ی ئیبن خەلدون و بیرۆکەکەی ڤیکۆ کە پاش ئیبن خەلدونیش بە چەندین سەدە دایناوە،

---

١٦٦ _ ئۆزوالد شپنگلەر (Oswald Spengler ١٨٨٠-١٩٣٦): فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە لە شاری (بلا کنبورگ) هاتوەتە دنیاوە و لە قوتابخانەی (هال) خوێندوویەتی، پاشان چووەتە زانکۆی بەرلین و زانستەکانی سروشتی خوێندووە. دوایی چووە زانکۆی (میونیخ) و جارێکی دی گەڕایەوە بەرلین، پاشان بەیەکجاری لە میونخ دانیشت و ژیانی خوێ بە لێکۆڵینەوە و ڕامان بەسەربرد، تا گۆشەگیر و سەر بەستانە ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوای کرد.

شپنگلەر لەخوێندندا ماتماتیك و مێژووی سروشتی و هونەر و فەلسەفەو مێژووی کۆکردوەتەوە. کۆمەڵێك کتێبی داناوە بەتایبەت دەربارەی مێژووی ئەڵمانیا. ساڵی ١٩٠٤ پلەی دکتۆراوەرگرت، نامەی دکتۆراکەی دەربارەی (هیرکلیتس) ی فەیلەسووفی یۆنانی بوو، بەناوبانگترین کتێبەکانی کتێبێکە بەناوی"ئاوابوونی رۆژئاوا Der Untergang des Abendlandes (احمد الشیبانی) ئەم کتێبەی بەناوی (تدهور الحضارة الغربیه)وە بە دووبەش بە زمانی عەرەبی لە بەیروت بلاّوکردۆتەوە.

جیاوازە. شپینگلەر بیرو بۆچوونی خۆی لە فەلسەفە و لێکدانەوەی مێژوودا، لە کتێبە سەرەکییەکەیدا لە ژێر ناونیشانی The decline of The west دا داناوە کە لە ژێر ناونیشانی "تدهور الحضارة الغربیە" دا کراوە بە عەرەبی و بە کوردیش دەبێتە "رۆچوونی بەردەوامی شارستانییەتی رۆژئاوا". شپینگلەر، هەموو فەلسەفەکەی خۆی لەو کتێبەدا لەبارەی مێژوو داناوەو دیاردەی پەیدابوون و دروستبوونی شارستانییەتیی بە شێوازێکی بەراوردی ئەوتۆ لێکداوەتەوە، زۆرتر لە تەمومژی شیعر و خوتبەدان دەچێت. زۆرتر پشت بە هەست و نەستی خودی خۆی و بۆچوونی ڕوحیی تایبەتی بیرۆکەی مێژوو دەبەستێت زێتر لەوەی کە لە سەر بەرنامەیەکی ڕێکوپێك و لێکدانەوەیەکی پلە بە پلەی عەقڵی بڕوات، واتا بە پێچەوانەی لێکدانەوەی زۆربەی فەیلەسووفەکانی مێژوو دەڕوات بەخودی (تۆینبی) یشەوە١٦٧.

شپینگلەر لەو بڕوایەدایە کە مێژوو بریتییە لە زنجیرەیەك ڕووداوی دوابەدوای یەکی تاکە کەسیی (سەربەخۆی) تەواوکەری یەکتری، کە بە ڕۆشنبیرییەکان ناویان دەبات و هەر ڕۆشنبیرییەکیش مۆرکی جیاوازی خۆی هەیە١٦٨، وەلێ چوارچێوەی بیرۆکەکەی بە ئەسڵ لەبارەی فەلسەفەی سروشتی وەستاوە، نەك لەسەر پرەنسیپە مێژووییەنەکەی بەرامبەر بە فەلسەفە سروشتییەکەی ئەو ١٦٩، شپینگلەر لەبارەی ئەم فەلسەفە سروشتییەی خۆی تا ڕادەیەکی ئەوتۆ ڕۆیشتووە، کە بیرمەندەکانی سەدەی نۆزدەمیش کە بەرنامەی دانراویان پێڕۆ دەکرد و بە هەموو کۆششێکی خۆیانەوە هەڵیان دەدا مێژوو بگۆڕن و بیکەن بە زانستێك وەك زانستەکانی دیکە، نەیانتوانی پێڕا بگەن. لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەوەی ئەو لە مێژووی کردووە

---

١٦٧ _د. عفت محمد الشرقاوی: ادب التاریخ عند العرب، دارالنهضة العربیة بیروت ١٩٧٣،ص٨٠.

١٦٨_ ر.ج. کولنجوود: فکرة التاریخ. ترجمة. محمد بکیر خلیل، ط٢، لجنة التالیف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٦٨، ص ٣٢٠.

١٦٩ _ م. ن ص ٣٢٣.

مەگەر نیوتن لە ماتماتیکی کردبێت، چونکە ئەو هەموو دیاردەکانی لە کەیانێکی تێکسمڕاوی مەعریفەدا کێشاوە، کە جاران لە یەکتری پچڕابوون و جیاوازبوون ١٧٠.

جا بۆ روونکردنەوەی قسەکانی شپینگلەر کە لە لایەنەکانی فەلسەفەی مێژووەوە دەیکات، بیرۆکەکانی دەکەین بەم تەوەرانەی خوارەوە:-

## تەوەری یەکەم: هەڵوێستی شپینگلەر(لەبارەی ڕای کۆمەڵێك لە مێژوونووس و فەیلەسووفی مێژوویی، خەڵکی ئەورووپا و ترازاندنی _راستکردنەوەی_ڕای ئەوان و وەڵامدانەوەیان)

یەکەم: بانگهێشت بۆ شۆڕشی کۆپەرنیکی

شپینگلەر لە لێکۆڵینەوەی مێژووی شارستانییەتدا، دەست دەکات بە بانگهێشتی شۆڕشێکی کۆپەرنیکی ١٧١ بۆ راستکردنەوەی خەیاڵێك کە هەتا ئێستاش لە هزری ئەوروپاییەکاندا هەر ماوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەوان شارستانییەتی رۆژئاوا بە جەمسەری نەگۆڕی هەموو شارستانیەتەکان دادەنێن، کە پێویستە هەموو شارستانییەتەکانی دی لەسەر ئەو حەقیقەتە بپێورێن. خەڵکی بەر لە کۆەرنیکۆس لەو قەناعەتەدابوون، کە هەسارەی زەمین جێگیرەو نابزوێت و تەوەرەیەکە هەموو هەسارەکانی دی بەدەوریدا دەخولێنەوە بەڵام پاش ئەوەی حەقیقەتی گەردوون و

---

١٧٠ _ كولن ويلسون، سقوط الحضارة، ترجمة: انيس زكي حسن، طبعة دار الاداب، بيروت ١٩٧١، ط٢، ص١٢٩.

١٧١ _ دەستنیشانکردنی کۆپەرنیکوس (Copernicus) زانای گەردووناسی گەورەی پۆلۆنییە ١٤٧٢- ١٥٤٣ کە بیردۆزەی بەتلیموسی پووچ کردەوە، ئەوەی دەیگوت زەوی ناوەندی گەردوونە. ئیتر ئەو بیردۆزەیەی زۆر ڕای بەڵگەنەویستی لە مێشکی خەڵك و زاناکان چەسپاوی گۆڕی، ناوی ئەم زانایەش بوو بە نیشانەی تەقەڵلای چاوگێڕانەوە بە بیر و تێگەیشتنی باوداو گومان کردن لە راستییان.

خولکەگان ئاشکرابوون و بووە شۆڕشێکی گەورە و هەموو لایەکی گرتەوە، ئەو خەڵکەش وازیان لەو قەناعەتە هێنا. کەواتە ئێستا پێویستە لەسەر ئەورووپاییەکان- وەك شپینگلەر دەڵێت بە دوای ئەو شۆڕشە زانستییە بکەون و بەسەر شارستانییەتەکەی خۆیاندا بیسەپێنن و واز لەو خەیاڵانەی خۆیان بهێنن. تێگەیشتن لە مێژوو، بەهۆی ئەم شۆڕشەوە وەهامان لێدەکات، بتوانین لەهەر شارستانییەتێك بکۆڵینەوەو بەدیاردەیەکی سەربەخۆ وێنەی بوونەوەرێکی ئۆرگانیی سەربەخۆ لە قەڵەمی بدەین، چونکە هەر شارستانییەتیەك لە شارستانییەتیەکان کەیانێکی سەربەخۆیە و لە کەیانە شارستانییەتیەکانی دی تەریك و جیاوازە هیچ شارستانییەتیك لە شارستانییەتەکانی دی ناگات مادامێکی هەر شارستانییەتیەك خەسڵەتی بوونەوەرێکی ئۆرگانیی هەیە و حەقیقەتی بوونی خۆی هەیە و بووەتە یەکەیەکی تەریك، بەسەربەخۆیدا داخراوە. ئەم وێکچوونەش کە لە بابەتەکەدا یان لە شێوازی دەربڕینی نێوان شارستانییەتێك لە شارستانییەتەکانی تردا دەیبینین ئەوە — بەڕای شپینگلەر — تەنیا خەیاڵە و هیچی تر نییە. تەنیا وێکچوونێکە لە رووالەتدایە کرۆکەکەی ناگرێتەوە، چونکە هەر شارستانییەتەکان روحێك دەردەبڕێت و روحیش لە شارستانییەتەکەوە بۆ شارستانییەتێکی دی زۆر جیاوازە١٧٢.

مێژوونووسی ئەورووپا بیرۆکەکەی بەتلیمۆس بنیاد دەنێت، کە بەسەر مێژوودا تاقیکرایەوەو بەهەڵە دەرچوو، چونکە مێژوونووسی ئەورووپا، ئەورووپای ڕۆژئاوا بە جەمسەری نەگۆڕی هەموو شارستانییەتەکان لە قەڵەم دەدات "بەبێ هیچ هۆیەکی بەجێ، تەنیا ئەوەنەبێت کە خۆی لە ئەورووپا دەژی و هیچی تر"١٧٣.

---

١٧٢ _ د. الشرقاوی: ص٨٠ لەم کتێبەوە:
The Eneyclopedia of philosophy.N.Y.١٩٦٧, V.١١,P٥٢٨.

١٧٣ _ کتێبی "تدهور الحضاره الغربیه" الفصل الاول، ص٦٠.

ئەوەی کە دەگۆڕێت لە مێژوودا ئەوە شۆڕشەکەی کۆپەرنیکییە کەوا مەزندە دەکات هەموو شاریتانییەتەکانی دی لە چوارچێوەی هزری ئەوروپای ڕۆژئاوادا دەسووڕێنەوە و ئەوروپای ڕۆژئاوا بە چەقی (مەرکەزی) ڕووداوەکانی جیهان دادەنێت. شپینگلەر ئەم بیرۆکەیە دەگۆڕێت و دەیکات بە بیرۆکەی لێکۆڵینەوەی هەر شارستانییەتییەك بە تەنیا و بەجیا، دەڵێت مەسەلەی شارستانیەتێکی ئەوروپا لە هیچ شارستانییەتییەکی دی باشتر و سەرکەوتووتر نییە، چونکە دوور نییە، شارستانییەتی دی هەبێت و باڵی بەسەر چەند گەلێکی ئەم جیهانەدا کشابێت و لە رووی روحییەتیشەوە هەند گەورە بێت لە شارستانییەتی ڕۆژئاوا  بالاتر و گەورەتربێت. ئینجا دەڵێت:١٧٤ " کەواتە هیچمان بۆ نەماوەتەوە، لەوە زێتر کە دووبارە بگەڕێینەوە سەر بیرۆکەکەی کۆپەرنیکوس کاتێك کە بەناوی — جێگای بێ پایان — ەوە ڕای ئەوروپای گۆڕی. راستیشت دەوێت، روحییەتی ڕۆژئاوا زۆر دەمێك بوو ڕای خۆی لەبارەی سروشت گۆڕیبوو، لەو ڕۆژەوە گۆڕیبووی کە سیستەمی گەردوونی، لە مەزندەی بەتلیمۆسەوە گۆڕی بۆ ئەم سیستەمی گەردوونەی کە ئەمڕۆ بەراستی لە قەڵەم دەدەین" ١٧٥ واتا وەکو مەزندەکەی بەتلیمۆس و کەسانی دیکە، ئەم زەمینەیان بە مەرکەزی هەموو ئەم گەردوونە گەورەیە دانەناوە، بەڵکو بەشتێك لەم گەردوونەیان داناوە، واتا ئەم هەسارەی زمینەیان تەنیا بە هەسارەیەك لە هەسارەکانی داناوە، ئەمەش مانای وایە کە هەندێ لە ئەوروپاییەکان بە پێویستی دەزانن، کە زەمین بە مەرکەزی شارستانییەتەکانی لە قەڵەم نەدرێت، بەڵکو ئەم شارستانییەتەی سەرزەمین هەرچەندیشە دەستکەوتی زانستیی گەورەی هێناوەتەئارا، بەلام خۆی

---

١٧٤ _ د. احمد محمد صبحی: في فلسفة التاريخ، مؤسسة الثقافية الجامعية الاسكندرية، ١٩٧٥، ص٢٤٦.

١٧٥ _ د. عبدالرحمن بدوي:اشپنجلر ، منشورات مكتبة النهضة المصرية، مطبعة الرسالة، ط٢، قاهرة، ١٩٤٥، ص٣٧.

بەشێکە یان یەکێکە لە شارستانییەتەکانی ئادەمیزاد، واتاشارستانییەتێك لە شارستانییەتەکان.

دووەم: بوغزاندنی رۆژژمێژی ئەوروپایی:

خەیاڵی مەرکەزییەتی شارستانییەتی ئەوروپایی، خەیاڵێکی تریشی لەگەڵدایە تایبەتە بە رۆژژمێری ئەوروپایی، کە ئەوروپا دەیەوێت بیکات بە بناغەی لێکۆڵینەوەی مێژوو یان دەیەوێت بیکات بە پێوەری سەردەمی شارستانییەتەکانی دیکە، ئەوروپییەکان، مێژویان دابەش کردووەو کردوویانەتە (مێژووی کۆن و مێژووی ناوەندو مێژووی نوێ). شپینگلەر وتەنی – کردوویەتی بە "بەرنامەیەکی بێ نرخی سەقەتی بێ مانا".

بەجۆرێکی ئەوتۆ کە عەقڵ نایبڕێ، بەلاّم بەهەرحاڵ بەرنامەیە و هەیە و بەتەواویش هزری مێژووسازیی ئێمەی داگیرکردووە١٧٦"ئەوروپایی مێژووی گەورە گەورەی بەردەوامی تەمەن هەزاران خولی ساڵ و شارەستانییەتی گەورە و زەبەنی زۆر کۆن، وەها لێدەکات کە زۆر بە ئاسانی بە خاکەرایی بە دەوری ئەم جەمسەرەدا بسووڕێنەوە، ئەم جەمسەرەش بریتییە لە بەرنامەیەکی نامۆ و سەیری خۆر و هەسارەکان!"١٧٧.

بەڕای شپینگلەر- بەم رۆژژمێرە ئەوروپاییە هەڵەیە، مێژووی شارستانییەتە کۆنەکانی هەزاران ساڵەی، وەك مێژووی چین و میسر، دەچنەوەیەك و کەم دەبنەوە، وەهایان لێ دێت نەبەهاو نەکاریگەرییان نامێنێت " کەچی دەبینین دەیەها گەورە دەکرێن، دەڵێی تیشکی شکاوەی شەبەنگن١٧٨". بە نموونە_ ئەگەر مێژووی نوێ وەها دابنێین کەلە سەدەی ڕاپەڕینەوە یان لە شۆڕشی فەڕەنساوە دەست پێدەکات، ئەوە

---

١٧٦ _ شبنجلر: تدهور الحضارة الغربية، الفصل الاول، ص٦٠.

١٧٧ _ م. ن ص ٦١.

١٧٨ _ م. ن ص٦١.

دانانێکی هەڵەیە، چونکە بەو بۆچوونە مێژووی چەندین کۆمەڵگە پشتگوێ دەخەین، کە دەکەونە دەرەوەی خاکی ئەوروپا. جا ئەگەر ئەو کارە چەوتە بشێت و بکرێت، کەواتە مێژوونووسی چینی مافی خۆیەتی مێژوویێك بۆ جیهان دابنێت بەبێ دەنگی بە سەدەی سەلیبییەکان بڕوات و بە سەردەمی ڕاپەڕین و فریدرێکی گەورەدا باز بدات و بە بێ بەهایان دابنێت و ئەوە نەهێنێت کە مێشکی خۆی پێوە ماندوو بکات179.

سێیەم: بیرۆکەی پێشکەوتن

هەر لە بناغەوە بیری پێشکەوتن، وەك جمك لەگەڵ زانست و پێشکەوتنی زانستدا پێکەوە بەستراوە و دۆزینەوە و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی لێکەوتووەتەوە. لە ئەنجامی بیری پێشکەوتندا سەدەی رۆشنگەری یان سەدەی رووناککردنەوە یان سەدەی رووناکی پەخش پەیدابوو "Englihtement" ۱۸۰

شانبەشانی ئەم بیرۆکەیە هەستی خۆشبینی و دڵنیایی لە ئایندە و ئارەزووی کۆنترۆڵکردنی سروشت و بێزکردنەوە لە رابردوو، تەماعی کۆنترۆڵکردنی سەنعەتی پێشکەوتن پەیدابوون۱۸۱. بیرۆکەی پێشکەوتن نووسینی گەلێك لە بیرمەندانی

---

۱۷۹ _ م. ن ص۶۱.

۱۸۰ _ لەبارەی بیر و فەلسەفەی ئەم چەرخە بڕوانە: جورج پولیتزر، فلسفه الانوار، ترجمه: جورج طرابیشی چاپی دار الطليعة، بیروت ۱۹۷٤.

د. مطصفی ابو حنیف احمد: منهج البحث التاريخي بين الماضي والحاضر، چاپی دار البيضاء، المغرب — ۱۹۸۷، ل:۱۰۳، کولنجوود. فکرة التاريخ، ص ۱٤۸- ۱٥٦.

گۆڤاری (عالم الفکر) کویت. مجلد(٥)، ژماره (۱) ل: ۷٤– ۷٥، ۱۳۰، گۆڤاری (المنار) پاریس. ژماره (۲٤– ۲٥) ۱۹۸۷، ۱٤۷–۳٤۱، هەروەها بەم چەرخەش دەڵێن چەرخی ژیری ( Age of Reason).

۱۸۱ _ لە بابەت بیری (پێشکەوتن)ەوە سەرچاوە زۆرە لەوانە:

د. حسين مؤنس : الحضارة.ص ۲۷٥

د. الشرقاوی :ادب التاريخ. ص ۱۷٥.

ڕۆژئاوا کەوتە بەرچاو، نەخاسمە لە سەدەی هەژدەم و نۆزدەمدا. هەرچەندیشە ئەم بیرۆکەیە پشتگیرییەکی زۆربەربلاوی بۆ رەخسا، وەلیّ چەند بیرمەندیّك گەڕانەوە سەر بیرۆکەی "پەشیمانی" یان شیّوەی هەموارکراوی بیرۆکەی (یەك لە دوای یەکی خولا و خول) یان بیرۆکەی "بەبیّ پیّشکەوتن".

خودی شپینگلەر یەکەم کەس بوو بانگهێشتی بۆ بیرۆکەی (بەبیّ پیّشکەوتن) کرد. پاشان شپینگلەر میّژووی بە قورسایی کۆڵ دادەنا یان بە کاریّکی بیّ ئامانج لە قەڵەم دەدا و بە پیّشکەوتنی دەگوت: بەبیّ پیّشکەوتن چۆن چۆنی هەر نەوەیەکی ئادەمیزاد، لەنەوەکەی پیّش خۆی جیاوازیی نییە، شارستانییەتیش هەر وەهایە. بە ئامانجیشی دەوت: ژیانی ئادەمیزادی بەبیّ ئامانج و بەکرداریّکی بایۆلۆژی دادەنا١٨٢.

شپینگلەر رایگەیاند کە بیرۆکەی پیّشکەوتن لە تیّگەیشتنی ڕەوشی میّژوودا بەهەڵەچووە بە ڕەوشیّکی بەردەوامی عەقڵیی ئادەمیزاد حسابی کردووە، کە لە کۆتایی نایەت، لە کاتیّکدا کە میّژوو وەك شانۆی چەندین شارستانی وەهایە، ئەوەی بەسەر ئادەمیزاددا پەیڕەودەکریّت بەسەر بوونەوەری ئۆرگانیشدا پەیرەودەکریّت. دەڕویّت، گەورە دەبیّت، پیّدەگات پاشان وشك دەبیّت و دەفەوتیّت و نامیّنیّت، میّژووی شارستانی وەکو میّژووی هەر بوونەوەریّکی زیندوو وەهایە، جا ئەو بوونەوەرە زیندووە ئادەمیزاد بیّت. یان زیندەوەر بیّت یان ڕووەك بیّت هیچ جیاوازییان نییە.

---

د. عبدالجليل الطاهر : مسيرة المجتمع ص ١٣٧- ١٦٨.

البرت شفاتيزر "شفيتسر" — فلسفة الحضارة، ترجمة: د. عبدالرحمن بدوي بەندەکانی " ٧، ١٢، ١٣، ١٤

جورج بليخانوف، محاضرات في فلسفة التاريخ: ترجمة: جورج طرابيشي، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧٣، المحاضرة الاولى.

عبدالحميد صديقي تفسير التاريخ، ص ٧٦.

١٨٢ ــ كولن ويلسن: سقوط الحضارة، ص١٢٩٠.

مەزندەدان لە مێژوو کە وەکو بەرەو بێ پایان پێش بکەوێت، وەك لە مەزندەدانی کرمۆکەیەك وەهایە کە هەتا هەتایە لەناو قۆزاغەکەیدا خواردن بخوات. وەك بوونەوەری زیندوو خولی ژیانی خۆی هەیە، هەروەکو ئەو شارستانییەتیش خولی داخراوی ژیانی خۆی هەیە ١٨٣.

بێگومان، سروشتی شەڕی یەکەمی جیهان و ئەو ئێش و ئازار و کلۆڵییەی لێیکەوتەوە و ویژدانی ئادەمیزادی پڕ لە ژان کرد و وەهای لە هەندێ نووسەری وەك (خاوەن هزر و بیرمەند و فەیلەسووف و ئەدیب و هونەرمەند)کرد، کە لە ڕووی بیرۆکەی پێشکەوتنندا بووەستنەوە،دژایەتیی بکەن، خودی شپینگلەریش لەگەڵ نارازاییەکاندا بووەو ئەو بیرۆکەیەی ڕەتکردەوە١٨٤. ئەو بزووتنەوەیە گەلێ بیرمەندی ئەوروپایشی لە خۆگرت، لەوانەش (جۆرج سوریل) و (ئەدورە کارپنەر) لە کتێبەکەی خۆیدا کە لە ژێر ناونیشانی (شارستانیبوون، هۆیەکانی، چارەسەرکردنی) باسی کردووە، هەروەها نووسەری بەناوبانگی ئێرلەندی (جۆرج برنادۆشۆ)١٨٥ و ئەلبەرت شڤایزەر — خاوەنی کتێبی — فەلسەفەی شارستانی) و شاعیری ئەلمان گۆتە (Geothe) و بیرمەندی تریش. پێشتر گوتمان بیروڕای شپینگلەر لەڕووی بەرپەرچ دانەوەوە ؟!

چوارەم: خەیاڵی کارتێکردن و کارلێکراو:

شپینگلەر ڕەخنە لە بەرنامەی لێکۆڵینەوەی مێژوو و فەلسەفەی باوی مێژوو، لەمەڕ مێژوونووسانی ئەوروپا و غەیری ئەوروپاییش گرتووە و، لای وایە کە لێڕوانینی دانراوی مێژوو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی شاۆستانییەتەکان هەیە، خۆی سەرگەرمی

---

١٨٣ _ د. بدوي:اشپنجلر ، ص٧١.

١٨٤ _ د. عفت الشرقاوی: في فلسفة الحضارة الاسلامية. دار النهضة العربية، بيروت، ط٣، ١٩٨١، ص١٩٦

١٨٥ _ م. ن ص ١٧٩– ١٨٤.

ئیش بکات و کارتێکەر و ژێدەرە دەرەکییەکانی پەیدابوون پەرەسەندنیاندا بەبێ هوودە لێتوێژینەوە بکات. لە دەرەوەی لێکدانەوەی ئەم شارستانییەتەی کە ئێستا هەیە، هیچ لێکدانەوەیەکی دی نییە. شپینگلەر لەو باوەڕەدایە ئەو مێژوونووسانەی کە دەڵێن پێوەندی لە نێوان شارستانیەتەکان هەن، هەڵەیەکی گەورە دەکەن، ئەوانە گوێ بە بیرۆکەی کارتێکردن و کارلێکراو دەدەن و ئەو وێکچوونەی لە نێوان هەندێ شێوە و دۆخی شارستانیەتێك و شارستانییەکی دیکەدا دەبینن تەنیا وێکچوونی ڕووکەشی دەرەوەیە و هیچی تر. دووریش نییە ئەو وێکچوونە جۆرە پێکهاتنێکی شارستانییەتی درۆبێت ١٨٦ ئەویش لە کاتێکدا ڕوودەدات، کە شارستانییەتێکی کۆن لەسەر خاکێك شارستانییەتێکی تازەی لەسەر لە دایك بووبێت، بلاّو ببێتەوە، بلاّوبوونەوەیەکی بەهێزی و ئەوتۆ کە نەیەڵێت ئەم شارستانیەتییە تازە لە دایك بووە (پەیدابووە) لەگەڵ هەناسە و گەشەسەندنی سروشتیدا یەك بگرنەوە، ئەمیان ناتوانێت شێوەی ڕاستەقینەی

---

١٨٦ _ زاراوەی "شێوەوەرگرتنی درۆزنانە"، واتا "التشكل الكاذب" لە زانستی کاتەکانەوە خواستراوەتەوە، جاری وایە هەیە بلووری کاتێك لە چینێکی بەرددا دەبێ، پاشان وا دەبێ ئەم چینەی بەردە درز و کەڵێنی تێدا پەیدادەبێت و ئاوی تێ دەچێت، ئا وەك بلوورەکان هەڵ دەکۆڵێ تا هیچی وایان لێ نامێنتەوە تەنیا دیمەنێکی کلۆرنەبێت. پاشان ئەگەر چەند دیاردەیەکی بورکانی پەیدابوو قەوارەی چیاکە بگۆڕن تۆپەڵی شل بووەوە دێن لە چینەکانی بەردەکە دەچنە ژوور، پاشان لەناویان دادەمەیین و ڕەق دەبن، بەڵام ئەم تۆپەڵە شل بووانە بە گوێرەی شێوەی سروشتی بلوورەکانیان ڕەق نابن و نابن بە بلوور، بەڵکو ناچار دەبن شێوە کلۆر و بەتاڵەکانی ناوبەردەکە — ئەوەی بلوورە کۆنەکان بەهۆی کاری ئاوەکەوە دروستیان کردووە— پڕ بکەنەوە ئەوسا شێوەی درۆزنانە پەیدا دەبن، کە ئەو بلوورە تازانەن کە پێکهاتنی ناوەوەیان لەگەڵ پەیکەری دەرەوەیان دا ناکۆکە.

د. بدوی: اشپنجلر، ص١٠٣.

بۆ زیادە زانیاری بڕوانە: کتێبەکەی شپنگلەر، تدهور الحضارة، بەندی (١٨) بەشی دووەم، ص٢٦٩.

دەربڕینی خۆی گەشەپێبدات، بگرە خودی خۆیشی لە پێگەیشتنی هەستبەخۆکردنیشیدا لێك دادەبڕدرێن و هەندە نابەن هەموو ئەوەی لە قوولآیی روحی ناسکی خۆیەوە هەڵدەقوولێت دەڕژێتە ناو ئەو قاپوورە بۆشانەوە کە ئەم ژیانە نامۆیە جێیهێشتووە " هەندەی پێ ناچێت هەموو جۆرە هەستێکی گەنجی خەملیوو، لەناو ئاسەواری پیری و مەرگدا دەبن بەبەرد"١٨٧.

خۆ ئەگەر هەموو شارستانیەتیکی، خولێکی داخراوی ژیان دەربڕێت، ئەوا هیچ ڕێگایەك نییە لەوە زیاتر کە بڵێین رەگ و ریشەی دیاردەی شارستانیەتەکە بیانییە (اجنبیە). ئەوەش خەیاڵێکە لە کۆشش. ئینکارکردنی تایبەتمەندێتی شارستانیەتەکە نەتەوایەتییەوە سەری هەڵداوە، کە "جیهانیبوونی ئاوەدانی" یش پێ دەوترێت، کە ئەوەی پاشتر لەوەی پێشتر دادەتاشێت. مێژوونووسانی ڕۆژئاوا مەزندە دەکەن، کە شارستانییەتی ئیسلامی لە یۆنانی وەرگرتووە و پاشان داویەتەوە بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا ئەمەش بوختانێکە شپینگلەر پێی قایل نابێت و بە تێڕوانینێکی ڕووکەشی ڕەوتی مێژووی لە قەڵەم دەدات.

بائەوەشمان لەبیرنەچێت. بیرمەند و فەیلەسووفێکی زۆر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بلڤکار شپینگلەرەوە، بەڵام شپینگلەر ئینکاری دەکات ئەمەش خودا دەیزانێت کە فەرق و فروقێکی سەیرە، ئایا دوای ئەمە ئێمە دەتوانین بڵێین کە خودی خۆیشی نەکەوتووەنە ژێر کاریگەریی ئەوانی پێش خۆیەوە ؟

## تەوەری دووەم: بیرۆکەی شپینگلەر

### یەکەم: بەرپابوونی شارستانییەتەکان

شپینگلەر ڕای وایە شارستانییەتی لەو کاتەدا پەیدادەبێت، کە روحێکی گەورە ڕادەپەڕێت و وریادەبێتەوەو لە حاڵەتی روحیی سەرەتایی تەمەنی سەرمەدیی

---

١٨٧ _ د. الشرقاوی: ص١٩٥- ١٩٦.

ئادەمیزاد جیادەبێتەوە. ئەم جیابوونەوەیەش وەکو ئەوە وایە، کە وێنەیەك لەبێ وێنەیەك جیاببێتەوە، یان وەکو کەم و مەرگ لە زۆر و نەمری هەڵبقوولێت وەهایە. ئەم شارستانییەتییە لە خاکی ژینگەکەی خۆیدا دەخەملێت بە تەواوەتی دەتوانین دیاری بکەین و سنوورەکانی دەستنیشان بکەین و هەروەکو ڕووەکێك کە چۆن چۆنی لە خاکەکەی خۆیدا دەخەملێت، شارستانیەتەکەش بەو جۆرە بە ژینگەکەی خۆیەوە پابەند دەبێت١٨٨.

کاتێکیش ئەم شارستانییەتییە تازەیە لە دایك دەبێت (سەرهەڵدەدات ) ئاژاوەی ڕەها کە لە ناو کۆمەڵگەکەدا باوبوو، دەگۆڕێت و دەبێت بە ملکەچی لەژێر ئارەزووی داهێنەری سیستەمدا، کە لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیریدا دنەی داهێنان دەدات ، چالاکیی داهێنان لە شارستانییەتدا بەردەوام دەڕوات١٨٩، پاشان لە سنوورێکی دیاریکراودا دەوەستێت، ئەوجا پاش روونبوونەوەی هێڵی شکانەوەی تەمەنی شارستانییەتەکە ژماردنی بەرەبەرەو کەمبوونەوەش بەرەو خوار(بەرەو ژێر) دەستپێدەکات.

ئەمەش مانای وایە، کە شارستانییەتی بەلای شپینگلەرەوە، هەڵقوولانێکی ڕوحیی کۆمەڵێك خەڵکە، واتا هەڵقوولانی ڕوحیی میللەتێکە، لای هەموویان لەبارەی مانای بوون (الوجود) کەم و زۆر وەك یەکە، لەبەرئەوە لەناوخۆیاندا بەیەکتری پابەندن، ئەوەش لە بزاڤە جۆربەجۆرەکاندا ڕەنگ دەداتەوە: واتا ئایین و فەلسەفە و ئەدەب و هونەر و ئابووری و سیاسەت و جەنگیش دەگرێتەوە. بەو جۆرە مانای تایبەت و جیاوازی ئەم کۆمەڵە خەڵکە کە لەسەر ئەو خاکەی لەسەری دەژین و چالاکیی خۆیانی لەسەر دەنوێنن، هەیانە، ئەوە لە بواری دەربڕینی ئەو هەڵقوولانە ڕوحیەدایە١٩٠.

---

١٨٨ ــ تدهور الحضارة: بەشی ١، ص٢١٧٠.

١٨٩ ــ د. الشرقاوي: في فلسفة الحضارة، ص٢٠١.

١٩٠ ــ م. ن ص ١٩٨.

ئەو شتەش کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە وەها لێ دەکات دەست بکەن بە دروستکردنی مێژوو و شارستانییەتی خۆیان، ئەوە ئەنجامەکەیە (المصير) کە لە جیاتی، یان کە لە جێگای شەرەفمەندەکان (العلیه) دایناوە، چونکە ئەمە مێژوو دەکات بە پاشکۆی زانستە سروشتییەکان و وتەی (ئەنجام)یش بۆ تێگەیشتن لە ڕەوتی مێژوو وشەیەکی زێتر لەبارە ١٩١ ئەو وەهای بۆ دەچێ کە ئادەمیزاد ئارەزوو و ئیرادەی ئازادی خۆی نییە و هیچی بە دەست نییە لەبەر ئەوە دەبێت مل بۆ ئەنجامی خۆی کەچ بکات و لەگەڵ ئەنجامەکەیدا بگونجێت و ڕابێت، چونکە ئادەمیزاد خۆی شارستانییەت دروست ناکات، (بەڵکو شارستانییەت بەو دروست دەکرێت)، واتا خودی ڕووداوەکان ئادەمیزادی خۆیان دیاردەکەن و مێژوو دروست دەکەن.

شپینگلەر، ناپلیۆن بە نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: ناپلیۆن ئەو عەرەبانەیە بوو کە ڕووداوەکانی شۆڕشەکەی فەرەنسا سواری پشتی بوون، وەك کورد گوتەنی ناپلیۆن دەکات بە هێسترەکەو ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنساش دەکات بەباری هێسترەکە ،شپینگلەر ئینجا دەڵێت: خۆ ئەو ڕووداوانە دەیانتوانی لە جیاتی ناپلیۆن، سەد ناپلیۆنی وەکو ئەو بدۆزنەوە١٩٢، لێرەدا شپینگلەر هەڵوێستی خۆی لەبارەی کێشەی پەیدابوونی قارەمانەکانی سەر شانۆی ڕووداوەکان دەخاتەڕوو. بیروبوچوونی شپینگلەر، لە بیروبۆچوونی تۆماس کارلیل جیاوازە، کە لە کتێبی قارەمانەکان (الابطال) دا باسیان دەکات، مەبەستی شپینگلەر لە (ئەنجام) ئەو مەبەستە نییە کە شانۆگەرییە تراژیدییەکانی(Tragedy) گریك بەهاوشان و پاشکۆی جەبری تێدەگەن یان بە قەزاو قەدەری دەزانن، نەخێر مەبەستی شپینگلەر: هەست بە خۆکردنی ئادەمیزادە لەبەرامبەر هێزێکی ئادەمیزادیی تردا، کە لە ڕوویدا دەوەستێ (حداه) بوونی وەبەر مەترسی دەنێت. ئەمەش هەمان ئەو کاریگەرییەیە کە کرایە سەر توینبی و بیرۆکەی

١٩١ _ د. صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٤٤.

١٩٢ _ تدهور الحضارة: ج١. ص٢٨.

لەروودا وەستانەوەو بەگوێکردن (التحدی والاستجابە)ی خستەڕوو. ئەوجا وزەی شاردراوی ئادەمیزاد سەردەکا بۆ چەسپاندنی بوونی خۆی بیرۆکەی (ئەنجام) دوو مەرجی هەیە، ئەمانەن:

(١) خودی (ذات) ی سەربەخۆ، کە مۆرکی ناسراوی سەربەخۆی خۆی هەبێت.

(٢) ڕووداوی دەرەکی هەبێت، لە نێوان ئەو ڕووداوانە و ئەو خودەدا (ذات). پێوەندیی لە روودا وەستانەوەش هەبێت.

لە ئەنجامی سەر و سەخت و لێك کەوتن و لێکداندا، جۆرە کارلێك (التفاعل)ێك پەیدا دەبێت، رەوشتی خود لە قۆناعەکانی پاشتردا دیار دەکات، بەلاّم پێویستە ئەو ڕووداوە دەرەکییانە بچنە ناو مەرکەزیی ناوەوەی خودەکە، بۆ ئەوەی جەوهەری خود پێك بێت١٩٣.

لەسەر ڕۆشنایی وتەی — ئەنجام — پێویستە هۆکارێکی دەرەکیی هورووژاویش هەبێت، دنەی توانستی شاردراوەی کۆمەڵە خەڵکێك بدات و ڕایچڵەکێنێت.

ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو هۆکارە دەرەکییە خۆی شارستانییەت دروست دەکات، بەڵکو مانای ئەوەیە کە دەرەوە ڕۆڵی دنەدەر دەگێڕێت و ورە و هیمەتی بەبەردا دەکاتەوە و توانستەکانی چالاکتر دەکات و بەرەو کاری خولقێنەر و بنیادنەر دنەی دەدات و پاڵی دەنێ، واتا دنەی ئەو کۆمەڵگەیە دەدات کە یارای بەشداربوونی لە بنیادی قەلاّی شارستانییەتدا هەیە و بەرەو ئەو بنیادنانە رایدەپەڕێنێت، جا ئەم بنیاتە یان ئەم قەلاّیە، یان ئەم پەیدابوونی شارستانییەتە، بەیەك لەم سێ حاڵەتەی خوارەوە دەڕوات:

١- توانستی ئەو کۆمەڵگەیە دەورووژێنێت، کە بە حاڵەتی کوژانەوەو کپبووندا دەڕوات و هەموو دەوروبەری پڕبێت لە ئاژاوە و بێ سەروبەری، دێنێت، شانەچالاك و

---

١٩٣ ــ د. صبحی: ص٢٤٤.

زیندووەکانی دەرووژێنێت و بەرەو کاری بنیادنان بە خەبەریان دێنێت و لەپڕێکدا هەڵدەقوڵێتەوەو ڕوحێکی تازەی پڕ لە توانست و پڕ لەپیت و بەرەکەت، کە تێدا بەخەبەر دێت و شارستانییەتێکی وەهای لێ پەیدا دەکات، کە بەروبوومەکانی بە تیشکی جوان جوان بەهەموو بوارەکاندا بلاّودەبێتەوە و ئیرادە و ئارەزووی خۆی بەسەر ئەو ئاژاوەیەدا دەسەپێنێت و بەو هێزە بێ جەمسەرە شاردراوەیەی خۆی هەرچی لەبەر ڕێگەیدا بوەستێت رایدەماڵێت و لەتوپەتی دەکات. ئەم حاڵەتە لە دەزوویەك دەچێت کە بێنی کۆمەڵێ موورووی ڕەنگاوڕەنگی پرش و بلاّوو بێ سەروبەری پێوەکەیت، ئەوجا مووروەکان بە دەزووەکەوە ڕێك دەوەستن و جێگای خۆیان دەگرن. واتا هێزی داهێنان و دروستکردنیش لەو کۆمەڵگەیەدا لە هەموو بوارەکانی ئایین و زمان و زانست و هزر و هونەر و شەرعاندن و فەلسەفەو شتی تردا دەردەکەوێت. ئیدی لەو کاتەدا مۆرکی خۆی لەو قۆناغە دیاریکراوەدا بەناوچەوانی ئادەمیزادەوە (مرۆڤایەتییەوە) دەنێت. ئیدی ئەم ڕوحە بەردەوام توانستی خۆی لەو بوارانەدا کە باسمان کرد ئازاد دەکات مادامێکی پڕ بێت لە وزەی بنیادنەری شاردراوەی خۆی. چونکە شارستانییەت ڕوحێکە، هێزی شارستانییەتێکی پڕپێزی ئامادەی دەرکەوتن تێیدا شاردراوەتەوەو دیارنییە١٩٤.

٢- لە حاڵەتێکی دیکەدا، شارستانییەتێکی نوێ لە کاتێکدا سەرهەڵدەدات، کە دوو شارستانییەت یان دوو کۆمەڵە خەڵك یەك بگرنەوە، یەك لەو دوانە لەوی دیکە بەهێزتر دەبێت، بەلاّم ئەوی دی ڕەسەن و داهێنانی گەورەتر دەبێت، یەکگرتنەوەی ئەم دوانەش هەروەك یەکگرتنەوەی (شمشێر) لەگەڵ (قەڵەم) دا وەهایە، سەرەنجام بەکشانەوەی قەڵەم و سەرکەوتنی شمشێر (وەك بۆ چاودێریی مێژوو و چاودێریی ڕووداوەکان دەردەکەوێت) کۆتایی دێت. ئەو لایەنەی کە شکاوەو ڕای کردووە ناچار دەبێت، بەڕواڵەت خۆی لەگەڵ لایەنە سەرکەوتووەکەدا بگونجێنێت مادامێکی ناتوانێت

---

١٩٤ ــ م. ن ص ٢٥٤.

بخەملێت و سروشتی ئەسڵیی خۆی دەربڕێت، بەو جۆرە دیاردەکانی شارستانییەت لەناو ئەو قاپووڕە بۆش و بەتاڵەیدا کە شارستانییەتیی بیانی سەپاندوویەتی بەسەریدا پێك دێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ، ئەوەی سەیری ڕووکەشی واقیعەکەی بکات، وەها دەزانێت کە شارستانییەتە شکاو و هەڵاتووەکە بزربووە و نەماوە، کەچی بزرنەبووە و بەزیندوویی و بەشاردراوەیی لەژێر توێکلەکەی دەرەوەیدا، کە بەسەریدا سەپاوە، هەرماوە، نموونە:

شپینگلەر نموونەیەك بۆ ئەوە دەهێنێتەوەو دەڵێت: لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستدا زۆر شارستانییەتی کۆن و ڕەسەن پەیدابوون کاریگەرییەکی گەورەیان لە مێژووی کۆن کرد. وەلێ هێزێکی دەرەوە وەکو هێزەکەی ئەسکەندەری گەورە (لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا) ناوچەکەی داگیرکرد و شارستانییەتی هیلینیی بەسەر میسر و شام و عیراقدا تا دەگاتە سنوورەکانی هیندستان سەپاند، لەبەرئەوە بزاڤی هزری و ڕۆشنبیری لەم ناوچەیەدا بەرگی هیلینی لەبەرخۆ کرد و خۆی داپۆشی و ناونیشانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵات لە ژێرەوە، تا نزیکەی هەزار ساڵ بە داپۆشراوی مایەوە، بەلاّم ئەو شارستانییەتە هیلینییە بریتی بوو تەنیا لە توێکلێکی دەرەوەی چەواشە، کە حەقیقەتە ڕاستەقینەکەی دادەپۆشی.

بەلاّم پەرچەکردارێکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتدا لە دژی ئەو باداناوە هیلینییە لە هەموو بوارەکانی جەنگ و سیاسەت و ڕۆشنبیریی ڕوحیدا، لە قاڵب و شێوازی مەسیحییەتدا وەك ئایینێکی نوێ، لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبنشینی فەلەستیندا پەیدابوو، کە ئینکاری بتپەرستیی هیلینیی دەکرد و پاشانیش ئینکاری ڕۆمانی دەکرد. پاشان مەسیحیەت گەیشتە ڕۆژئاواو لەو ڕۆژەوە بووە ئایینی فەرمیی دەوڵەتی ڕۆم، کە ئیمپراتۆر ئۆغستین لە سەدەی چوارەمی زاینییدا باوەری پێهێنا. کاتێکیش ڕۆم گەڕایەوە سەر ڕۆژهەلاّت و داگیری کرد و پاشان بیروباوەڕ و تێگەیشتنی تایبەتی ئایینی مەسیحیەتیی خۆی بەسەر ڕۆژهەلاّتدا سەپاند، خەڵکی ڕۆژهەلاّت لایان دا، بەتایبەتیش خەڵکی میسر و شام و جەزیرە و پاشانیش ئەرمەنستان کە بە ناچاری

داگیرکاریی ڕۆمانیان قبووڵ کرد، وەلێ دژایەتیی مەزەبی کەنیسەیی فەرمیی ڕۆمانیان دەکرد. بەو جۆرە لە وڵاتی ڕۆژهەڵاتدا دوو مەزەبی یەعقوبی و نەستووری بڵاوبوونەوە، کە لە مەزەبی دەوڵەتەکە جیاوازبوون، بەتایبەتیش لەبارەی سروشتی خودی مەسیح١٩٥.

بەڵام ئەم ناوچەی ڕۆژهەڵاتە، کە هەندەی نەمابوو ناونیشانی ئاوەدانی و شارستانییەتی ڕەسەنی خۆی لە دەست بدات، بۆ دەرفەتێك دەگەڕا حەقیقەتی خۆی دەرببڕێت، حەقیقەتی ئەو دەربڕینەش بەپەیدابوونی ئایینی موسوڵمانەتی دەنگی خۆی ئاشکرا کرد، کاتێك کە نێردراوی خوا پێغەمبەر (د.خ) دەستی کرد بە ڕاگەیاندنی مژدەی ئایینی تازە و وەك بروسکە، تیژ و خێرا بەهەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبۆوە و رووکەشی و دیاردەی شارستانییەتی بیانیی لەبەرخۆ داماڵی، چونکە ئەو رووکەش دیاردانەی کە شارستانییەتی ڕاستەقینەی ڕۆژهەڵاتیان بنیاد نەدەنا، چونکە نەچووبووە ناو قووڵایی ڕۆژهەڵاتەوە، لەبەرئەوە شپینگلەر بەم پێکهاتەیە دەڵێت: "تێکەڵەی درۆکاری شارستانییەت" بەو جۆرە قەڵەمەکە، واتا قەڵەمی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی ئیسلامی گەڕایەوە، بۆ ئەوەی حەقیقەتی خۆی دەرببڕێت و شارستانییەتێکی تازە بابەت دابمەزرێنێت، ئەوەبوو هەموو وڵاتی ڕۆژهەڵاتی تا سنوورەکانی چین و ڕۆژئاواشی تا سنووری فەڕەنسا گرتەوە، کە پێشتر شمشێری هیلینی و پاشانیش ڕۆمانی داگیری کردبوون.

٣- حاڵەتی سێیەمی پەیدابوونی شارستانییەت، ئەوە لەو بارەدا ڕوودەدات کە شارستانییەتێکی زۆر بەهێزتری ڕەسەنتر و بەپیتتر و گەورەتر و فراوانتر و بنیادنانتر و

---

١٩٥ _ لە بابەت چەوساندنەوەی مەسیحییەکان لە لایەن ڕۆمە بێزەنتییەکانەوە و دەربارەی ئەم دوو ڕێبازە مەسیحییە بڕوانە: د. ادمون رباط: المسيحيون في الشرق قبل الاسلام، بيروت ١٩٨١، و فكتور سحاب: من يحمي المسيحيين العرب؟ دار الوحدة للطباعة والنشر، بيروت ١٩٨١،ص١١-١٨، ٨٠- ١٠٤.

داهێنەرتر، بە شارستانییەتێکی ئەوتۆ دەگات، کە تازە بە تازە لە سەرەتای پێکهاتنندا بێت. لەبەرئەوە لاوازەکە دەکەوێـە ژێر پێی ڕەسەنە بەهێزەکە و دەخنکێت و بزردەبێت و نامێنێت، هەر وەکو شارستانییەتەکەی مەکسیك ١٩٦ (شارستانییەتەکەی ئەزتیك – The Aztic civilitzation) و شارستانییەتەکەی هیندییە سوورەکانی هەردوو ئەمریکا "شارستانییەتی مایا وشارستانییەتی ئینکا Inca ". شارستانییەتی تازەی ڕۆژئاوا، ئەو دوو شارستانییەتەی خنکاند و نەمان.

## دووەم: ڕووخانی شارستانییەتەکان

شارستانییەت، مادامێکی لەسەر برەوپێدانی خەباتی زەحمەتی خۆی بەردەوام دەبێت و لەمەودای ئەم خەباتەدا کۆمەڵێ وێنە و دروشم و دۆخی دەنگ و ڕووی بە مۆرکی تایبەت بە خۆی ڕەنگ کردبێ، کەواتە خۆیشی دەبێت و بەردەوامیش دەبێت، بەڵام هەرکە هێزی خوڵقێنەر و بنیادنەری لە دەست داو بزری کرد، سا بەهۆی ئەوەی کە لە ژێر قورسایی ڕوحێکی بەهێزتر و بە پیتتردا خنکابێت. یان لەبەرئەوەی گەیشتبێتە ئامانجی خۆی و شێوەی کۆتایی خۆی بەدەست هێنابێ ئیدی نەتوانێت لەو سنوورە بەرزتر ببێتەوە، کە نەتوانێت لێی بترازێت و لەدیوی دەرەوەش هەموو توانستی خۆی وەدی هێنابێت، ئیدی نۆرەی ئەوەی دێت، کە خوێنەکەی وشك بکات و هێزی لەبەردەبڕێت و بوون و کیانی دەبێت بەبەرد، ئەوسا لە (شارستانییەت) دەکەوێت

---

١٩٦ _ کاتێك کە شارستانییەتی ئەورووپای تازەی گرت، شارستانییەتی مەکسیکی لە لانك دا نەبوو، بەڵکو لەو شارستانەتییانە دەژمێردرا، کە لە چەند سەدەیەکەوە کۆتاییان هاتووە، لەوانەیە ئەوەندە زانینە کەمەی ئەورووپاییەکان لە بابەت شارستانییەتی مەکسیکەوە هەیان بووە ئەو سەردەمە وای لە شپینگلەر کردووە وا بزانێت شارستانەتییەکە ئەو ڕۆژانە لەسەردەمی سەرهەڵدانیدا بووە (دانەر).

و دەبێت بە "مەدەنی" ١٩٧هێزی داهێنەری تەواو دەبێت و ئەو ڕووناکییەی کە پێشتر بلێسەی دەدا، بەرە بەرە کزدەبێت و دەکوژێتەوەو تەنیا تیشکێکی کەم و کز دەبەخشێت کە حەقیقەتەکەی، لە ڕواڵەتەکەی بێ هێزترە ١٩٨. ئەوە وەك ئەو دارە وەهایە کە شلە و ئاوی تێدا نەمابێت و چاوگەی ژیانی وشکی کردبێت، ئەم حاڵەتەش مانای ئەوە نییە کە لەپڕ دەمرێت و وشك دەبێت، نەخێر مانای ئەوەیە کە بە پایزی تەمەنیدا دەڕوات و زوو بە زوو زستانی بەدوا دێت، شارستانییەت وەك بوونەوەری ئۆرگانی وەهایە، بەهەمان ئەو خولانەدا دەڕوات، کە بوونەوەری زیندوو لە کاتی پەرەسەندن و گەشەکردنیدا پێیاندا دەڕوات و تێپەڕدەبێت. هەموو شارستانییەتێك، منداڵی و لاوێتی و هەرزەکاری و تەمەنی پێگەیشتن و پەك کەوتەیی و پیریی خۆی هەیە، یاخود وەرزی بەهار و هاوین و پایز و زستانی خۆی هەیە.

شپینگلەر، لای وایە، کە شارستانییەتی ڕۆژئاوا، لە قۆناغی بنیادنان و داهێنانی پشتی سەر خستووە (ڕەت کردووە) ئەو ڕوحە زیندووەی کە پێشتر توانستی داهێنانی پێ دەبەخشی، ئێستا دامرکاوەو کپ بووەکانت (kant ١٧٢٣- ١٨٠٤) فەیلەسووفی ئەڵمان، خاڵی بادانەوەی شارستانییەتی بۆ مەدەنییەت دەنوێنێت. ئەو ڕشتەی کۆتایی هزری بەلای ڕەفتار "سوود و مەنفەعەتی – پراگماتی" دا لاسەنگ بووە. کە مۆرکی مەدەنیەت دەردەبڕێت.

شپینگلەر ڕای وایە کە هەوای (النزعە) کۆنی کلاسیکیی دوادواکانی سەدەی هەژدەمی زاییینی ئەوروپا هەستی ماتەمینی ڕوح دەردەبڕێت، چونکە لە پیری نزیك بووەتەوە. لە قۆناغی پیریشدا ئادەمیزاد دڵی بۆ ڕۆژانی رابوردوو لێ دەدات، بیری منداڵی دەکاتەوە. پاشان شارستانییەتی ئەوروپا ترسێکی گەورەتری لە هەوای

---

١٩٧ _ لەم بابەتەوە بڕوانە: کتێبی،علی القریشی: بین الحضارة والمدنیه، دار المعارف، بیروت ١٩٧٧، هەروەها بڕوانە شپینگلەر، تدهور الحضارة، ١٠، ص٨٧.

١٩٨ _ د. بدوی: اشپنجلر، ص ٧٤.

ڕۆمانتیکی دەربڕی، چونکە هەوای ڕۆمانتیکی سۆفیگەرییەکی قووڵ و ئاڵۆزی تێدایە، ترسی شارستانییەت لەوە دەردەبڕێت، کە ڕۆژی کۆتایی هاتنی نزیك بۆتەوە[199]، لەبەرئەوەی کە هێزی داویە لە کزی و ئاووگی (عصارە)ی تێدانەماوەو خوێنی ژیانی وشکی کردووە، لەکاتی وەهادا، شارستانییەت هەوەسی بوون و ژیانی نامێنێت و تەریك دەبێت و خۆی دەهاوێتە (پەنا دەباتە) ئەو تاریکییەی کە دەوری ژیانی ڕوحی سەرەتاییان دەدا لە زگی دایکیدا، واتا لەو زگەدا کە لێیکەوتووەتەوە (پەیدابووە) کە قەبرێکە بۆ خۆی[200].

لەم بارەیەوە گۆتە کە شپینگلەر زۆری بەدڵ بوو دەڵێت: هەر پێشکەوتنێك سەرکەوتنی ڕوحی لەگەڵدا نەبێت خەتەر و ترسناکە، چونکە کاتێك کە ئەقڵ بەهەموو بەڵگە و حوکمی خۆی دیاردەکانی هزر و بیرکردنەوە کۆنترۆڵ دەکات، دەبێتە هۆی وشکبوونی شارستانییەت و دەستپێکردنی ژماردنی پاشە و پاش و شارستانییەتەکە دەگۆڕێت و تەواودەبێت و کۆتایی دێت.

هەموو شتێك، وای لێهاتووە لەژێر ڕکێفی هۆو ئەنجامەوە، واتا کەوتووەتە ژێر ڕکێفی "هۆکار و چارەسەر" ەوە، چۆن؟ واتا (حاڵەتەکە) ش بووەتە: چەند؟ واتا بۆتە ژمارە (بۆتە ژمارە و ڕەنووس و ژمارە) چاخێك ئامێرییەتی پەتی باوی تێدا سەندبێ و داهێنانی هونەری فەلسەفیی تێدا نەمابێ و بیروباوەڕی بێ ئایینی دەستی بەسەردا گرتبێ، ئەو چاخە بێگومان چاخی گلۆربوونەوەو بەسەرچوون و نەمانە. بە گەرمی و بەدڵ رادەگەیێنێت و دەڵێت: ئامراز (دەستکەلا) گۆڕاوەو بووەتە ئامانج و مەبەست، ئەوەش لە دوو حاڵەتدا (بواردا) نیشان دەدات: (١) نەختینە (واتا موڵك و ماڵ). (٢)ئامێر. ئادەمیزاد کە نەختینە (پارە) ی دۆزییەوە، بۆ مامەڵە و ئاڵوگۆڕ بەکاری هێنا، چونکە مامەڵەی شت بە شت نەیتوانی کێشەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی چارەسەر

---

١٩٩ _ د. صبحي،: ص٢٥٦.

٢٠٠ _ د. بدوي: ص ٧٥.

بکات. هەر لەبەر ئەوەش پارەی داهێنا کە ئەو کێشانە چارەسەر بکات و بشبێتە ئامرازی (دەسکەلای) فرۆشتن و ئاڵوگۆڕ، بەلاّم خودی پارەکە بووە ئامانج و بەهای هەموو شتێك بە پارە دەقەرسا (دەپێورا) و سیاسەتیش وای لێ هات کەوتە ژێر رکێفی ئابوورییەوەو ئابووری دەیبزواند. ئادەمیزادیش پارەداربوو، چونکە بەهێزبوو، وای لێهات ئەمجارە هێزداربوو، چونکە پارەی هەبوو، دەوڵەمەند بوو. پێشتر گوند دیاردە و نیشانەی ژیانی بوون. پاشترشاری (المدینة)بووە دیاردە و نیشانەی ژیانی، چونکە شاربووە بازاڕی پارە. ئەو وەهای بۆ دەچێ کە شاری گەورە گەورە پەیدابێن" شارستانییەتیش کۆتایی دێت، شار، بەڕای شپینگلەر دیکتاتۆرییەتی پارەیە٢٠١.

هەرچی ئامێرە ئەوە ئادەمیزاد دایهێناوە، بۆ ئەوەی ببێتە ئامرازی زیادکردنی حەوانەوە و ڕابواردنی خۆی، بەلاّم ئامێرەکەش دیسان هەر بووەتە ئامانج و مەبەست و هەموو شتێك کەوتە ژێر رکێفی ئامێر و ئالییەتەوە. ئامێر و ئالییەت بوون بە مۆرکی مەدەنییەت و هەموو شتێکی ناو کۆمەڵگە وایان لێهات بەهێزی ئەسپ دەپێورێن نەك بەهێزی مەعنەوی و ڕوحی، ئادەمیزاد بووە پاشکۆی (تابع) ی ئامێر. حۆ دەبوو پەرچەکردارێکیش هەر پەیدابێت کە لە داهێنانە هونەرییەکاندا خۆی دەنواند، بە تەواوەتی لە مەزەبگەلی گاڵتەی بێ سوود و ناماقوڵی ئەدەب "شیعر و چیرۆك و شانۆگەری"و سوریالی لە هونەر گەلی تەشکیلی و مۆسیقای دەنگ بەرز و قەرەباڵغی وەهادا دەرکەوت کە نە ڕوحی پێ بەرز دەبێتەوە و نە بەختیاریش بە ڕوح دەبەخشێ. ئەم نموونە و وێنانە بریتی بوون لە یاخیبوونی ئادەمیزاد لە دژی ئامێرکاری٢٠٢..

شپینگلەر ڕای وایە کە داهێنراوەکان بوونە گرنگترین هۆی سەرکەوتنی ئەوروپا، بەلاّم ئەم قارە تێر و پڕە کەوتەبەر مەترسیی گەلانی جیهانی سێیەم، کە ئەو "ڕەشپێستیان پێ دەڵێ" ئەو مەترسییەش کاتێ پەیدابوو کە گەلانی جیهانی سێیەم

---

٢٠١ _ د. الظاهر: مسیرة المجتمع، ص٢٣٨.

٢٠٢ _ د. صبحي: ص ٢٥٧.

شاندی زانستییان نارد بۆ ئەوروپا، تا بزانن ئەم سەرکەوتنەی ئەوروپا لە چییەوە هاتووە؟! چونکە کرێی کار لە دەوڵەتانی جیهانی سێیەمدا کەمترە و شارستانییەتەکانیشیان نایان کات بە کۆیلەی ئامێر. ئەم ڕەشپێستانە حەز بە ئامێر دەکەن، بەلاّم حەزناکەن ئامێر ژێر دەستیان بخات، دەشیانەوێت بزانن ئەو نهێنییە چییە کەوا ئەوروپاییەکان بەسەر ئامێردا زاڵ بوون و سەرکەوتوون.

شپینگلەر حوکم بەسەر شارستانییەتی ئەوروپادا دەدات، کە چاری نییە هەر دەرووخێت و ڕایدەگەیەنێت و دەڵێت: خوگرتن بە زەمەنێکەوە مەزەبگەلی بێ ئایینی تێدا بلاّوبووبێتەوەو ئیستیعماریش بەهەموو شێوەیەك تێیدا بلاّوبووبێتەوە، ئەوە ئەو زەمەنە زەمەنی کەوتن و پووکانەوەیە، نامێنێت ،زۆریش ستەمە ئەم شارستانییەتە لاوێتییی بەبەردا بکرێتەوەو تازەبکرێتەوە، هەروەها زۆریش ستەمە لاوێتیی بوونەوەری ئۆرگانی بهێنرێتەوە و بگەڕێنرێتەوە. ئێمە کە خەڵکی ئەوروپایی هیچمان بۆ ناکرێت، چونکە لە زستانی ئەم شارستانییەتەدا لە دایك بووین و پەیدابووین. ئەوەی کە ئێستا ئەوروپا پێوەی دەناڵێت ئەو تەنگانە ڕێکەوتە نییە ، کە بەکۆتایی هاتنی هۆکارەکانی خۆیشی کۆتایی بێت، نەخێر ئەوروپا ئێستا بە دەست کلۆڵییەکی ڕاستەقینەوە دەناڵێت- نەیدەتوانی خۆی لێ لابدات — ئەم ئەنجامە بە ئێشە بووەو دەبێت هیچ چارێکیشمان نییە.

لەوانەیە، لە حاڵەتی لاوازی و سڕبوونەوە ڕوح و هەستێکی وەها دەربپەڕێت، هەندێ کەس وابزانن، ئەوە درێژەو بەردەوامبوونی چالاکی و شارستانییەتە، بەلاّم لە حەقیقەتدا ئەو ڕوحە ڕوحێکی ڕووکەش و درۆیەو پڕە لە خەیاڵی مەدەنییەت. خەڵك بە ماوەیەکی کەمی حوکمی دیموکراتیدا دەڕۆن و لە سێبەری ئەو دیموکراتییەدا، وا دەزانن کە ئازادن، بەلاّم بە دوای ئەو خەیاڵی ئازادییەدا حوکمێکی ڕەهای بێ سنووری (قەیسەری و دیکتاتۆری) دێتە پێش٢٠٣. کەسانی ساویلکە و ساکار بە ڕواڵەتی

---

٢٠٣ _ د.الضاهر:ص٢٣٨.

بریقەداری ماددی و بە زۆریی داهێنراوەکان دەخەڵەتێن و چەواشە دەبن، چونکە بەرهەمی ئەم دیاردانە بەرهەمێکی بازرگانی و رەمەکی و هەرزانە٢٠٤..

لەبەرئەوە هیچ ئادەمیزادێك لەوە ناگات کە ڕووخانی شارستانییەتی ڕۆژئاوا ڕووخانێکی مسۆگەرەو هەموارکردن و ڕاستکردنەوەو جوانکردنەوەی سوودی نییە و ئەو باق و بریقەی تەنیا خەیاڵێکەو زوو بە زوو نامێنێت و دەکوژێتەوە، ئەو ئادەمیزادەش کە ئەو خەیاڵە دەکات بێگومان نە ئارەزووی تێگەیشتنی مێژووی هەیە و نە ئارەزووی ئەوەشی هەیە لەگەڵ مێژوودا بژی و نە ئارەزووی بەشداربوونیشی لە دروستکردنی مێژوودا هەیە٢٠٥..

## تــــــەوەری ســـــێیەم: بەرنامــــــەی شارســـــتانییەنەکەی شپینگلەر(سروشتی شارستانییەتەکەی)

وێڕای ئەوەش کە هەر شارستانییەتێك نیشانە و کەسایەتیی ناسراوی خۆی و مۆرکی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەم کەسایەتی و مۆرکەی لە ڕوح و بەروبوومی ئەو کەسانەدا دەردەکەوێت کە لە ژێر سایەیدا دەژین، وەلێ ئەو بەرنامەیەی کە فەیلەسووف لە لێکۆڵینەوەی شارستانییەتەکاندا دروستی کردووە، لەبارەی دەرخستنی لایەنەکانی یان لەبارەی ئەو دیاردانە دەوەستێت، کە شارستانییەتەکان تێیدا بەشداردەبن، شارستانییەتەکان یەکەیەکی لێکۆڵینەوەی مێژووەکانیانە، دیاردەیەکی ڕوحیی کۆمەڵە خەڵکێکە بەرامبەر بە جیهان یەك مەزندەیان هەیە ، ئەم مەزندەیەیان لە دیاردەی شارستانییەتی ئایین و فەلسەفەو سیاسەت و هونەر و زانستدا جەمسەرگیردەبێت. ئەم یەکەیە کەسایەتیی شارستانییەتی خۆی هەیە، خەسڵەتی خوی

---

٢٠٤ _ م. ن ص٢٣٨.

٢٠٥ _ د. مؤنس: الحضارة، ص ٢٤٩، هەر لەم جۆرە قسەیەش ئیبن خەلدوون گوتوویەتی، بڕوانە: پەراوێزی باسی "بەدواهاتنی خولەکان – التعاقب الدوری".

هەیە. پاشان دوو شارستانییەتی وەك یەك نابن و لەیەكتری ناچن[٢٠٦]. وەلێ شارستانییەتەكان — بەڕای شپینگلەر — هەموویان لەوەدا لەیەك دەچن، كە هەموویان لە یەك دیاردەدا هاوبەشن و هەریەكەشیان بەجیا ئەم دیاردانەی خوارەوەیان هەیە:

ا_هێماكانیان "واتا رووخسارەكانیان"

ب_فەسڵەكانیان "واتا خولەكانیان"

ج_هاوزەمەنبوونی فەلسەفییان.

(١)مەزندەی شپینگلەر لە هێماگەلی شارستانییەتەوە لەوەدا دەردەكەوێت، كە هەر شارستانییەتێك بەناوی دیارترین رووخساری ئەو شارستانییەتەوە ناودەنێت، كە ڕوح و فەلسەفەی هەر شارستانییەتێك نیشان دەدات. كەسێك كە ناوی شارستانییەتێك دێنێ، دەستبەجێ شێوەی تایبەتی ئەو شارستانییەتەی دێتە بەرچاو و هیچ شارستانییەتێكی تری نایەتە بەرچاو، ئەو شێوەیە هێمای ناسراوی شارستانییەكە پێك دەهێنێت. ئەو رووخسارەی كە شارستانییەتی یۆنان (گریك) دەنوێنێت، كاتێ كە ئەوان مەزندە لە گەردوونی بێ پایان دەدەن. لە تەنیایی تەریكی و داخراوی تەنداریدا دەركەوێت، كە دوای ئەو هیچی تر نییە [٢٠٧] لەبەرئەوە شپینگلەر بۆ ئەم شارستانییەتە هێمای پەیكەری دیاریكراوی كڕ و كپی زۆر ڕێكوپێكی داناوە، كە ئەویش پەیكەرەكەی ئەپۆڵۆیە (Apollo)، ئەپۆلۆش بەپێی باوەڕی گریكەكان خوای جوانی و پیاوەتی و شیعر و مۆسیقایە ، ئەو لاوە زۆر بە رووخسار و جوانەیە كە یۆنانەكان ڕوحی هونەروەریی خۆیان بەم پەیكەرە تەریك و تەنیایە دەردەبڕی، هەروەكو لە سیاسەتیشدا، كەم و زۆر لە(دەوڵەتی شار)دا دەردەبڕی، كاتێكیش یۆنانی بیری لە جێگە دەكردەوە ئەوە مەزندەی ئیقلیدیی لێ دەكرد، واتا جێگەكەی بە پان و كەم و

---

٢٠٦ _ د. صبحي: ص٢٤٨.

٢٠٧ _ د. الشرقاوي: في فلسفة الحضارة، ص١٩٨.

دەورەدراو دادەنا٢٠٨ لە مێژووی کۆنی سیاسەتیشدا یۆنانییەکان میللەتیان بەو مانا فراوانەی کە هەیە پێکنەهێنابوو، ئەوان دانیشتوانی هەموو شارێکیان بە میللەتێك دەدانا، ئەم زاراوەیەیان لە وشەکانی ژیانی سیاسی خۆیاندا، هەر نەشدەزانی. ناوی (هیلینی یان هیلینییەکان)یش کە لە ساڵی (٦٥٠پ.ز) دا دەرکەوت، مانای میللەت یان گەل نابەخشێت، بەڵکو ناوی ئەو کۆمەڵە خەڵکە دەبەخشێت، کەسەر بە شارستانییەتی کۆن بوون و ناوی کۆمەڵی (میللەتانی یۆنانی)دەبەخشێت، هەر وەکو چۆن دەڵێین بەربەرەکان. ئاوەهاش دەڵێن میللەتانی یۆنان٢٠٩.

بەلاّم هێما کە شارستانییەتی میسری کۆن دەردەخات، ئەوە رێگەیە، چونکە ڕوحی کۆنی میسر هەستی بەخۆی کردووە، ڕوحی کۆنی میسر وەهای دەزانی کە ژیان سەفەرێکە و پێویستە لەسەری کە دەبێت ئەم سەفەرەبکات و ملی ئەم رێگایە بگرێت و بڕوات، کە رێگایەکە هەر بۆ ئەو کێشراوە و رێگایەکی دیارکراوەو زۆر بەوردی نەخشەی بۆ کێشراوە٢١٠.

هەرچی شارستانییەتی عەرەبی – ئیسلامییە، ئەوە شپینگلەر رووخساری ڕوحی، واتا شێوەیەکی ڕوحی بۆ داناوە، چونکە شپینگلەر لەو باوەڕەدایە کە خەڵك لەم شارستانییەتەدا هەست بە بوونی ڕوحیی خۆی دەکات لەسەر ئەو بنەمایەی کە پارچەیەکە لەڕوحی گەورە. کەسێکی موسوڵمان، لە شارستانییەتی خۆیدا، شتی هەستپێکراو بەجێ دەهێڵێت و دەگاتە شتی ڕووت و پەتی.

شپینگلەر لەو باوەڕەدایە کە ئیلاهی ئیسلام (خوای گەورە) خوایەکە، نەتەنی هەیە و نەقەوارە، لەبەرئەوە مۆرکی ڕووت و پەتی لەلای موسوڵمان لە هونەری هێڵی بێ ڕوحدا دەردەکەوێت، چونکە هونەرمەندی موسوڵمان حەرامە وێنەی تەندار

---

٢٠٨ _ د. صبحي: ص٢٤٤.

٢٠٩ _ د. بدوي:اشپنجلر، ص١٩٨.

٢١٠ _ د. الشرقاوي: في فلسفة الحضارة، ص١٩٨-١٩٩.

بکێشێت، نابێت نەرەسم و وێنە و نە پەیکەر دروست بکات، بەو پێیە هونەری تەشکیلی لەگەڵ ڕوحی شارستانییەتی موسوڵماندا ناگونجێت و نابێت ببێت. لەبەرئەوە هونەرمەندێکی موسڵمان هەستی ناو دڵی خۆی لە نەقش و زەخرەفەدا دەردەبڕێت، کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا هونەری زەخرەفەی عەرەبیی پێ دەڵێن (ئارابسك - Arabesque)، هونەرمەندێکی موسڵمان هونەرەکەی خۆی کە ئاوێتەی بیروباوەڕەکەی بووە، بەجۆرەها هونەری هێڵ دەردەبڕێت، دەبینیت لە جیاتی تەندار و ماددە، هێڵی ڕووت و پەتی و بێ ماددە دەکێشێت.

پێم وابێ هەر ئەمەیە کە یەکێ لە مێژوونووسانی هونەری فەڕەنسا ئاماژەی پێ دەدات و دەڵێت:" هونەری موسوڵمانان شەرەفمەندترین کۆششی ڕوحی ئادەمیزادە کە لە پێناوی زاڵبوون بەسەر کۆتایی و ڕواڵەت و گوماندار و سەرپێییدا هەوڵ دەدات" ٢١١ لە سیاسەتیشدا، (کە شەرعاندن و دانانی قانوون بەشتێکی گرنگی سیاسەتە) یەکێتی و یەکبوونی خوا لەمەزندەی سیاسی و هزریی موسوڵماندا ڕەنگی داوەتەوەو بڕوای بە ئیجماعی زانایانی ئیسلام هێناوە، کە لە گومڕاهی جیای دەکاتەوە٢١٢.

شارستانییەتی ڕۆژئاوا مۆرکی ڕوحی فاوستیی هەیە " کە دوودڵییەکی بەردەوام و بزووتنەوەیەکی دینامیکی پێوە دیارەو بە دوای ئامانجی بێ پایاندا وێڵە" ئەم ڕوحە هەموو خەسڵەتەکانی عەقڵی ئەورووپایی دەنوێنێت کە مۆرکی بێ پایانی دەنوێنێت و لەو کاتدرائییە قوتییانەدا دەردەکەون، کە هەروەکو باڵەخانەی بەرز بەرزی بێ پایان، واتەسەریان گەیشتووەتە ئاسمان و لوتکەکانیان تیژن و کەوانەیان هەیە و شەبەنگی تیشکی تێکەڵ بە ڕەنگی ڕەسمەکانی سەر لەوحی پەنجەرە شووشەبەندە گرانبەهاکانی پڕیان دەکات لە تیشك و هووڕ. هەروەها ئەو بینایانە سووك و بەرز بەرەڵڵا دەردەکەون

---

٢١١ ـــ م. ن ص١٩٩.

٢١٢ ـــ د. صبحی: ص٢٤٩.

و حەز بە ئاسمانی بێ پایان دەکەن٢١٣. هەروەهاش عەقڵی بەعەمەلیی ئەوروپایی وەك شپینگلەر دەڵێت لە حسابی بێ کۆتاییدا، لە (جیاکاری و تەواوکاریدا) دەردەکەوێت، بەڵام ڕوحی هونەرمەندانەی ڕۆژئاوا ئەوە هەر ڕۆژئاواییەکان لە زمانێکی ڕوحیی جووڵاودا لە مۆسیقای باخ (جان سباستیان باخ — دا J.S.Bash(١٦٨٥ — ١٧٥٠) دەریان بڕی. ئەم مۆسیقایە مۆسیقای ئەڵمانیی بەر لە چاخی ڕۆمانسییە، کە ئاوازگەلێکی زۆر و بەرز و خۆشی داناوە. مۆسیقا زمانی جیهانە و زمانی جیهانیبوونی مەسیحیەت دەردەبڕێت. ئەم زمانە جیهانییە مەودای بێ پایان دەردەبڕێت، چونکە خوای مەسیحیەت بێ پایەنەو مۆسیقاش زمانی ڕوحە و خوای مەسیحیەت خودی ڕوحەو نییە٢١٤،هەروەها ئیستعماری جیهانی بەبێ پایان دەربڕی، هەروەها تەلەفۆنیش کە زاڵە بەسەر جێگایەکی دیاریکراودا، هەروەها ڕادیۆ، کە هێشتا کەس نهێنی تەلەفزیۆن و هەوایی و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و تەلەفۆنی دەستیی نەدەزانی.

سەرەنجام ڕوحی فاوستی لە ئابووریی جیهان بە شێوەی بازرگانیی جیهان و بانك دەرکەوت. ڕۆژئاوایی مەزندەیی لە جێگەیەك بدایە وای دەزانی ئەو جێگەیە هەر درێژ دەبێتەوە و پایانی نییە، چونکە درێژبوونەوە و درێژەکێشان لای ئەو هەموو شتێکە٢١٥.نیشتیمان بەڕای فاوستییەکان پارچەیەك زەوییە و ئەوروپایی هەست ناکات کە ئەو نیشتیمانە سنووری هەیە، بەڵکو وەها دەزانێت کە ئاسۆیەکی جوگرافییە و بەبێ پایان هەر درێژ دەبێتەوە وێڕای ئەوەش کە فاوستیی ئەوروپایی ئامادەیە هەردەم خۆی بکات بە قوربانی لە پێناوی ئەو نیشتیمانە بێ پایانەدا٢١٦

---

٢١٣ _ د. حسن عثمان: منهج تحليل التاريخ، ط١٩٨٤، ص٤٣.

٢١٤ _ د. صبحي: ص ٣٥١.

٢١٥ _ م.ن. ص ٢٤٩.

٢١٦ _ د. بدوي، ص١٩٩.

.لەوە دەچێت هەر ئەم بیروبۆچوونە بووبێتە بەردی بناغەی ئەوەی، کە ئێستا و دوای مردنی شپینگلەر بە نزیکەی حەفتاو پێنج ساڵ بە دیاردەی جیهانگیری بەناوبانگە.

٢- وەرزەکانی شارستانییەت:

ئەو هێمایانە ئەوە دەگەیێنیّ کە هەر شارستانییەتێك لە شارستانییەتەکان کەسایەتی و خەسڵەتی خۆی هەیە، واتا هەر شارستانییەتێك بیگری داخراوەو بە مەزندەی هیگلّ ڕوحێکی ئازاد و بەرەلاّ نییە، چونکە روحی بەڕەلاّ رەوتی شارستانییەتەکان دەرنابڕێت، بەڵکو دوابەدواهاتنی وەرزەکان بە شێوەیەکی خولاوخول ڕەوتی شارستانییەتەکان دەردەبڕێت، چونکە ئەو گۆڕانکارییەی سەر بوونەوەری ئۆرگانیی زیندوودا (بەرنامەی ئادەمیزاد) دا لە دایکبوون و گەشەسەندن و پیری مردندا تێپەڕدەبێت، بەسەر هەموو شارستانییەتەکان تێپەڕدەبێت. شپینگلەر ماوەی گۆپکەکردنی شارستانییەت بە وەرزی بەهار دەچوێنێت، چونکە وەرزی بەهار (ماوەی بەهار) ماوەی پەیدابوونی پیاوی دەگمەنە کە خۆیان لە پێناوی کۆمەڵگەکەیاندا بەخت دەکەن. ماوەیەکە پڕە لە داستان و شیعری قارەمانێتی و بەشان و باڵی توانستی خولّقێنەر و ئازاری ئادەمیزاددا هەڵدەڵێن، هەروەك ماوەکەی هۆمیرۆسی یۆنانی و ماوەی چاخەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژئاوا، ئەم قۆناغە قۆناغی خەملّین وبووژانەوەیە. قۆناغی کارامەیی و عەقلّ و بەجێهێشتنی کونە ئەشکەوتی سارد و سڕی بەربەرییە، قۆناغی بەشداربوونی ریزە ئیشێکی داهێنەرانەیە، کە ژیان و حاڵەتێکی نویّ دەنوێنێت و وا خەریکە مژدەی پەیدابوونی شارستانییەتێکی تازە دێنێت، پاش ئەوە، ئینجا هاوینی بەدوادادێت. لە هاوینیشدا سەرکردایەتی بەهەڵمەت و پڕ ئاوات پەیدادەبیّ، هاوین وەرزی پەیدابوون و گەشەکردنی (دەوڵەتی شار)ە، لە شارستانییەتی ئەپۆلۆنی (یۆنانی )دا هاوین چاخی ڕاپەڕین و هونەرە، چاخی مایکل ئینجۆلێی ئیتالییە Michelanglo (کە گرنگترین پەیکەتاش و وێنەکێشی جیهانە) (١٤٧٥- ١٥٦٤ز) چاخی گالیلۆیە Galileo (١٥٦٤- ١٦٤٢ز) (گالیلۆ زانایەکی ناوداری ئیتالییە و تەلسکۆپی داهێناو وتی ئەم زەمینە خڕەو کەنیسەی ڕۆما دادگایی

کرد). ئەو سەرکەوتنە زانستییانەو گەردوونییانە بە ئازایی و بوێری هزری داکوتاوی ناو مێشکی زانایان و ناو عەقڵی ئادەمیزادی سڕییەوە، کە هەر لە ئەزەلەوە لەناو ئەو مێشك و عەقلانەدا هەبوون. چاخی هاوین، چاخی ئەدەبی شەکسپیرە (شاعیری بەناوبانگی ئینگلیز). لە پاییزیش قۆناغی پێگەیشتنی تەواوی کانیاوی ڕۆشنبیری ڕوحی و یەکەم نیشانەی ماندووبوون و پیری دەردەکەوێت و مولّکی مەرکەزی و فەلسەفەی تەحەددی لەگەڵ ئایین و بەهاکاندا بەناوی ڕۆشنکردنەوەی مێشك (یان بەناوی هەڵکردنی ڕۆشنایی – Enlighten ment ) دێتە ئاراوە، ئەمەش زەمەن و ماوەی سەفسەتائییەکانەو sopist ٢١٧.سوکرات و ئەفلاتوونی شارستانییەتی ئەپۆلۆنی و سەدەی هەژدەمی زایینی ئەوروپایە کەناوەڕاستی پایز لە مۆسیقای مۆزات Mozart (١٧٥٦- ١٧٩١م) مۆسیقاژەنی نەمساوی و لە شیعرەکانی گۆتە و فەلسەفەی کانتدا دەردەکەوێت.

پاش ئەوانە، لە کۆتاییدا ئینجا بەرەو زستانی شارستانییەت دەڕۆین. لەم وەرزەدا هونەر مۆرکی تاڵ و نهێنی لەخۆدەگرێت و فەلسەفەش مۆرکی گومان و نازانم اللاریە لە خۆدەگرێت و لە سیاسەتیشدا چاخی ئیمپراتۆرییەکان و ئیستعمار و زوڵمی سیاسی باویان دەبێت و دەست بەسەر بارودۆخدا دەگرن. لە زستاندا شارستانییەت ڕوحی خولّقێنەرو داهێنانی نامێنێت و تەنیا دەبێتە مەدەنییەت و باشترین شت کە لە بواری چەسپاندنی ئەنجامەکانی زانستدا پێشکەشی بکات، ئەوە هەر لە سەنعەت و پیشەسازیدا بەدەردەکەوێت و توانستەکانیش تەنیا لە درێژبوونەوە و بلاوبوونەوەی ئاسۆییدا گیردەخۆن. هەر لەبەر ئەوەیە گەربێت و لاوێکی فاوستی "ڕۆژئاوایی

---

٢١٧ _ سۆفستایی: ڕێچکەیەکی فەلسەفەی بەناوبانگی یۆنانییە، گۆڕاو بوو بە ڕێچکەیەکی قازانجی ناپاکژ، بڕوانە: الموسوعة الفلسفية المختصرة.

"ڕۆڵێکی بەرچاو لە زستانی شارستانییەتەکەی خۆیدا بگێڕێت، ئەوە ئەو لاوە دەبێت بەسەرباز، یان دەبێتە قوتابی لە پەیمانگایەکدا٢١٨.

٣- بەرنامەی هاوزەمەنبوونی فەلسەفی:

ئەگەر درێژە بە بابەتی وەرزەکان بدەین، کە هەموو شارستانییەتەکان پێیدا دەڕۆن و تێپەڕدەبن. هەرچەندیشە هەر شارستانییەتێك و خەسڵەتی خودی خۆی هەیە، دەبینرێت کە شارستانییەتەکان هەموویان هاوتەریب و هاوجێ و هاوزەمەنن، بە لێکدانەوەی فەلسەفی، واتا هەموویان بە قۆناغی هاوشێوە و هاوجێگەییدا دەڕۆن. ئەگەر بە وردی لە مێژووی ئەو شارستانییەتییانە بکۆڵینەوە دەبینین وەك شپینگلەر دەڵێت:" ئەگەر دوو ڕووداوی مێژوویی لە دوو شارستانییەتدا کە جێگە و زەمەنیان لێك دووربن، ڕوویان دابێت بەمەرجێ هەریەکەیان ڕۆڵی ئەوی دیکە بگێڕێت و هەمان وەزیفەی هاوجێگەکەیی لە شارستانییەتەکەی تردا ببینێت ئەوە ئەو دوو شارستانییەتە بەهاوزەمەن لە قەڵەم دەدرێن.

ئەو بەراوردەش کە هەندێ لە مێژوونووسان لە نێوان ئەسکەندەری گەورە و ناپلیۆن پۆناپەرتدا کردوویانە، یان لە نێوان بوزا و مەسیحدا کردوویانە، یان لە نێوان مەسیحییەتی پێشەوە و سۆشیالی تازەدا کردوویانە، کە لە هەندێ ڕووەوە هاوشێون و لەیەك دەچن، تەنیا بۆ پشتگوێخستنی ناچوونییەکیی نێوان ئەو کەسایەتییە گەورانە کردوویانە، چونکە ئەو کەسایەتیانە لەسەر ئاستی شێوەی ڕووداوەکە و ڕۆڵی ڕواڵەتی ئەو کەسە هاوشێوەن و وێکدەچن. نەك لەسەر ئاستی قۆناغە مێژوویینەکە، واتا وێکچوون و هاوشێوەو بوونەکەیان هاوشێوەبووەنێکی درۆو زاڵمانەیە. واتا بەراوردکردنەکە بەراوردێکی هەڵەیەو خۆسەپاندنە و زۆرتر لە بەراوردی نێوان دوو شیعر دەچێت، نەك لە هەستێکی قووڵەوە هەڵقووڵابێت و مێژوو وەها دابێت کە

---

٢١٨ _ د. صبحي: ص٢٥٠. بڕوانە: د. الطاهر: مسيرة المجتمع، ص٢٣٨.

بەسەر ڕچەیەکدا دەڕوات و بەردەوام کۆمەڵێ وێنە و بارودۆخ و کۆمەڵێ هەڵوێستی دێتە پێش۲۱۹.

شپینگلەر، هاوشێوەبوون تەنیا لە ڕواڵەت و ڕوو دا لەو هاوشێوەبوونە جیادەکاتەوە، کە لە سەربناغەی هاوسۆزی پەیدادەبێت و نیشانەی هاوشێوەبوونێکی ڕێژەیی هەیئەت و پێکهات و وەزیفەی تێدایە. بە نموونە لە ئادەمیزادوئاژەڵە بڕبڕەدارەکانی وەکو و ماسیدا هەر پارچەیەك لە پارچەکانی کاسەیسەر هاوجێیە لەگەڵ جۆرەکانی تردا "بە نموونە: هەردوو سییەکان و خوێندەڵێنەکان لەبەرئەوەش کە مێژوو هەر وەکو ئاژەڵ بەڕای شپنگلەر ملکەچی لێکدانەوەی بایۆلۆژییە، کەواتە پێکهاتن و هاوسۆزی لە هاوشێوەبوون قووڵترو وردترە۲۲۰. پاشان ئەگەر بێینەسەر باسی تر، دەبینین فیساگۆرس زانای وەرزشی مێشك ماتماتیك لە شارستانییەتی گریکداو دیکارت زانای وەرزشی مێشك لە شارستانییەتی ئەوروپای تازەدا هەردووکیان هەم هاوجێن و هەم هاوسۆزن و هەمیش هاوچەرخن، هەروەهاش ئەسکەندەرییە لە شارستانییەتی گریك و بەغدا لە شارستانییەتی عەرەبی ئیسلامیدا، ڕۆڵی هەردووکیان لە هەردوو شارستانییەت هەردوولادا هاوسۆز و هاوجێگە و هاوچاخیشە. مادامێکی پێکهاتەی ناوەوە لە هەموو شارستانییەتی هاوسۆزبێت، کەواتە دەکرێت بەرنامەی هاوچەرخی بەسەر هەموو دیاردەکانی هونەری و ئایینی و زانستی و سیاسی و ئابووریدا لە هەموو شارستانییەتی لە خولەکانی پەیدابوون و گەشانەوە و خەملین و کاولبوون و لەناوچوونیاندا بسەپێنرێت. هەروەها بە گوێرەی دیاردەکانی تریش، هەموویان هاوچاخن لە پەیدابوون و پێگەیشتن و پەرەسەندنیاندا، بە جۆرێکی ئەوتۆ، کە هیچ دیاردەیەك نامێنێت بەهایەکی قووڵی هەبێت لە شارستانیەتێك لە شارستانییەتەکان— بە بۆچوونی شپینگلەر- بەبێ ئەوەی هاوجێیەکی

---

۲۱۹ _ د. بدوی: اشپنجلر، ص ۷۸.

۲۲۰ _ م. ن ص ۷۹.

لەشارستانییەتەکانی تردا هەبێت، بەنموونە: بۆزییەتی هیندی و رواقییەتی ڕۆمانی هاوچەرخن ۲۲۱، هەروەها تێپەڕبوونی شارستانییەتی یۆنانی بۆ دەوری مەدەنییەت لەسەردەمی فیلیپی مەقدۆنی و ئەسکەندەری گەورەی کوڕیدا، لە شارستانییەتی تازەی ڕۆژئاوا دەچێت، کە لە سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسا و ناپلیۆندا هەبوو ۲۲۲.شپینگلەر ڕای وایە کە هەر شارستانیەتێك جۆرە مۆرکێکی هونەری دیاریکراوی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو ڕوح و کەسایەتیی خۆی پێ دەردەبڕێت، لە شارستانیەتێکی ماددیدا، دەقەبلێنرێت هەر وەکو یۆنانییەکان لە هونەری پەیکەرتاشیدا کردیان و وەستایانە هونەرەکەیان گەیاندە ئەوپەڕی تەواوەتی و کەماڵ، کەچی عەرەبی موسڵمان پەیکەر و ڕەسمی لە خۆی دوورخستنەوە، چونکە لەگەڵ ڕوحیانەتیدا ناگونجێن، ئیسلام باوەڕی بێ پایانی خۆی بە نەقش (بەزەخرەفە — ئەرابسك) دەربڕی، چونکە زەخرەفەکە هێڵ هێڵی پەتی نەقش دەکرێت، وەلێ ئەوروپییەکان بە مۆسیقا دەریاندەبڕی، چونکە مۆسیقا زمانێکی جیهانییە و لە درێژبوونەوەدا، بێ پایانی دەردەبڕێت.

ئەم دەربڕینە تایبەتە وەرزشی مێشکیش (الریاضیات) دەگرێتەوە و هێما ڕەقەمییەکانیشی دەگرێتەوە. شپینگلەر بەشێك لە بەشەکانی کتێبەکەی بۆ باسکردنی "مانای ڕەقەم" تەرخان کرد ۲۲۳ و ڕایگەیاند کە هەر

---

۲۲۱ _ ڕەواقی: ڕێبازێکی فەلسەفەی بەرەسەن یۆنانییە، زینون(zenon)دایناوە، بریتییە لەوەی کە مرۆڤ دەتوانێ بەهۆی مایەدارییەوە واتا (فضیلة) دەستبەرداری هەموو شتێك بێت، دانا بە گونجاوی لەگەڵ سروشتدا سەربەست و سەربەخۆیانە ژیانی خۆی بەسەردەبات، سامان و جوانی و ناوبانگە لای مرۆڤی (مایەدار) بوون و نەبوونیان یەکەو وەك یەکی لێ دێت.

د. عادل البکری: الفلسفة لکل الناس، ص٤٢.

د. عرفان عبدالحمید: المدخل الی معانی الفلسفة، ص٨٢.

۲۲۲ _ د. بدوی، شپنجلر: ص:٧٥- ٨٩. د. صبحی: ص٢٥٢.

۲۲۳ _ تدهور الحضارة الغربیة، الفصل الاول، ج١، ص١٢١- ١٩١.

شارســـتانییەتێك هـــزری وەرزشـــی مێشـــکی (ریاضـیات) تایبـــەتی خـــۆی هەیـــە و لـــەوانی دیکـــە جیـــاوازە. ئـــەو دەڵێـــت:" وەرزشـــی مێشـــك" بـــەمانای گـــەردوون و زانستی کیمیـــا، بـــوون و نـــاوی نییە،چـــونکە وەرزشـــی مێشـــك گـــەلێك زۆرە و هـــەر شارســـتانییەتێك وەرزشـــی مێشـــکی جیـــاوازە، هـــەر بـــە تـــەواوی لـــە هونـــەری جۆربەجۆر لە شارستانییەتە جۆربەجۆرەکاندا دەچێت٢٢٤..

## گرنگی و سوودی بەرنامەی هاوچاخی:

ئەگەر بە دروستیی ئەم جۆرە بەرنامەیە باوەڕ بکەین، قەناعەت بێنین کە هەموو شارستانییەتەکان بە قۆناغی چۆنیەکی و هاوچاخیبوونی فەلسەفیدا دەڕۆن، ئەوسا قانوونێکمان دێتە دەست هەر لەو قانوونە دەچێت، کە هەموو شارستانییەتەکان دەگرێتەوە.

جا ئەگەر بێت و ناوەڕۆکی ئەوقانوونە بەسەر ڕووداوەکانی مێژوودا تاقی بکەینەوە و بیسەپێنین، ئەوە ئەو بەرنامەیە سوودی بۆ ئەمانەی خوارەوە دەبێت:

یەکەم: توانای ئەوەمان دەبێت کە پێکهاتەی چاخگەلێکی رابوردووی مێژوو، کە هیچمان لەبیرنەماوە بگەڕێنینەوە. گەڕاندنەوەی پێکهاتەی رابوردووش، بەم شێوەیە ئەو نهێنییەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە بە ئاسەوار و بە بەڵگە و بەکتێبیش ئاشکرا نەدەکرا. واتا ئەمجارەیان فەلسەفە دەست لە خوێندنی مێژوو پان دەکاتەوە کە زووتر مێژوو بۆ ماوەیەکی دوور و درێژیش دەستی لە فەلسەفە پان دەکردەوە. کە زووتر لێکۆڵەری مێژووش وەهای لیّ دێت، دەتوانێت کە بەرنامەی هاوچەرخی بکات بە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی مێژوو کاتێك کە لێکۆڵینەوەکەی دەرامەتی ئاسایی لیّ دەبڕێت و نامێنێت. دکتۆر. بەدەوی دەڵێت: ئەگەر وەها دابنێین کە مێژوو دەکەوێتە ژێر رکێفی زەرووڕەتی ئۆرگانێکی زیندووەوە، ئەوسا دەستبەجیّ دەزانین، کەئەو بەرنامەیە

---

٢٢٤ _ کولن ویلسون، سقوط الحضارة، ص١٢٩.

چ ڕۆڵێکی گەورە لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا دەگێڕێت و دەشتوانین ئەو ئاسۆ فراوانەش ببینین کە لەبەر دەمماندا دەکرێتەوە و دەشتوانین ئەو ئەنجامە کاریگەرانەش بزانین ئەگەر ڕێکی بخەین و ڕێساو شەرت و شرووتی بۆ دابنێین٢٢٥.

دووەم: بە سەپاندنی بەرنامەی هاوچاخی دەتوانین ترپە (ایقاع) و ڕێگا و ڕچە و مانای مێژوو بناسینەوە و بیزانین، پاشان دەشتوانین لە سنووری ئێستاوە بەرەو ئاسۆی دوارۆژ تێپەڕین و بەشێوەیەکی زانستیانە و وردکاریش بزانین ئەنجامی دەگات بەچی و خولەکانی ئایندەی شارستانییەتی ئەوروپا، یان هەر شارستانییەتێکی دی بزانین چۆن چۆنی دەبن،چونکە بەو هەنگاوانە شوێن پێی جۆری پەرەسەندن و ڕچەی ڕێگاکەیان هەڵگرتووە ئەوەش مانای وایە، کە بەرنامەی هاوچاخی لە ڕێگای ئەو قۆناغە دوابەدوایانەی کە مێژوو پیایاندا دەڕوات.فەلسەفەی مێژوو ناچاردەکات لەگەڵ زانستی سیاسەت و ئابووری و پلانی دوارۆژی کۆمەڵگەدا لێك بکەوێت و تەوقەیان لەگەڵ بکات، واتا لەگەڵ ئەو زانستانەدا یەك بگرنەوە.

ئەمەش مانای وایە کە مێژوو پاشان فەلسەفەی مێژووش بەتەنیا نابێتە بواری لێکۆڵینەوە بۆ خودی خۆی، بەڵکو بۆ سوودێکی زۆر و لایەنە بنەڕەتییەکانی ژیانیش دەگرێتەوە ئەم سوودەش ڕێگا بۆ ئەم سوودەی خوارەوە دەکاتەوە.

سێیەم: ڕووداوەکانی مێژوو، بەپێی ئەم بەرنامەیە لەوانە نییە، کە لە ناکاو دەرکەوتبن نەخێر، چونکە ئەوەی لە مێژووەکە دەکۆڵێتەوە توانستێکی وەهای بۆ گەڵاڵەبووە، دەتوانێت زنجیرەی ڕووداوەکان بەهۆی زانینی یەك بە دوایەکەوە بزانێت، لەبەرئەوە ئەو ئێش و ئازارەی کە پەیدادەبن کار لە مێژوونووسەکە ناکات و نایتەزێنن. جەنگی یەکەمی جیهانی بەپێی ڕەوتی گشتیی مێژوو، ڕووداوێکی نائاسایی نییە، کە هەواو هەوەسی کۆنترۆڵکردن و خۆسەپاندن لەلای هەندێ سیستەم و خەڵکەوە دروستی کردبێت، هەروەها ئەو شەڕە تەنیا، بەهۆی ئابوورییەوە لێك نادرێتەوە، بەڵکو ڕاستەقینەکەی ئەوەیە — بەپێی پرەنسیپی هاوچاخی — کە بریتییە

---

٢٢٥ : د. بدوی، اشپنجلر، ص٧٨.

لەبادانەوەی شارستانییەتی ئەوروپا بەهاوجێیی لەگەڵ بادانەوەی چاخی هێلینی (یۆنانی) بۆ چاخی رۆمانی. ئینجا دەڵێت: هاوجێیەکی سەیر هەیە، لە نێوان جەنگی تەروادەو شەڕی سەلیبیەکاندا لە نێوان جەنگی پۆلینیزو٢٢٦ جەنگی یەکەمی جیهانیدا لەنێوان ڤیەنا و پاریسدا، لە نێوان ئەرەستۆ و کانتدا، لەنێوان هەوای جیهانگەرایی ئەنجامی داگیرکارییەکانی ئەسکەندەرو ئیستعماری ئەورووپیدا٢٢٧.

**تەوەری چوارەم: داخرانی شارستانییەتەکان — گفتوگۆ لە نێوان شارستانییەتەکان نییە" یان " شارستانییەتەکان چۆن چۆنی کارلێکتردەکەن؟"**

وتمان هەر شارستانییەتێك ، بە بۆچوونی شپینگلەر کەیانێکی سەربەخۆی جیاواز لە کەیانی شارستانییەتەکانی تری هەیە و هیچ شارستانییەتێك رێگای پێوەندیکردنی بە شارستانییەتەکانی تردەوە نییە، مادامێکی هەر شارستانییەتێك ، بەتەنیا بۆ خۆی کەیانێکی ئۆرگانی و بوونی خۆی هەبێت و یەکەیەکی داخراوی خۆی هەبێت. ئەو وێکچوونەش کە لە نێوان شارستانییەتێك و شارستانییەتێکی تردا دەبینرێت یان ئەو وێکچوونەش کە لە نێوان شێوازی دەربڕینی دوو شارستانییەتی جیاوازدا دەبینرێت، ئەوە هەر تەنیا خەیاڵە و هیچی تر، چونکە ئەو وێکچوونە تەنیا هاوشێوەبوونێکی رواڵەتە و لە کرۆك و جەوهەرەوە نییە، لەبەر ئەوەی هەر شارستانییەتی ڕوحێك دەردەبڕێت و ڕوحیش لە شارستانییەتێك تا شارستانییەتێکی تر جیاوازە و وەکو یەك نابن سا ئەو جیاوازییە چ لە جەوهەر و شێوازدا بێت چ لە توانستی بوونی شارستانییەتەکە دابن واتا هیچ فەرقی نییە لە جەوهەردا یان لە رواڵەتدا لێك جیاوازبن٢٢٨.

---

٢٢٦ _ شەڕی بولێنیزی: ئەو شەڕە لە نێوان هەردوو شاری ئەتینا و ئەسپارتەی یۆنانیدا لە ماوەی ٤٣١– ٤٠٤. پێش زایین رووی داوە، بە سەرکەوتنی ئەسپارتە و بەزینی ئەتینا و رژێمە دیموکراتییەکەی دوایی هات.

٢٢٧ _ د. صبحي: ص٢٥٢.

٢٢٨ _ د. بدوي: اشپنجلر، ص:٩١-٩٢.

هیچ شارستانییەتێك گشتی و گشتگیر نییە، بەڵكو هەر شارستانییەتێك فەلسەفە و خەسڵەتی خۆی هەیە و ژیانی دیاریكراوی تایبەتی خۆی هەیە و ڕۆژێك لە ڕۆژان كۆتایی دێت.

هەر وەك چۆن تاكەكەس لەناو دەچێت و نامێنێت، بەلاّم جوون و جۆرەكەی دەمێنێت هەر بەو جۆرەش، هەر شارستانییەتێك دەمرێت و لەناو دەچێت و هیچ ڕێگایەكی تری نییە، تەنیا ئادەمیزاد دەمێنێت، كە نوێنەری هەموو شارستانییەتەكانە. هەروەك چۆن ماناو باوەڕی دروستبوون (لەدایكبوون) و گەورەبوون و پیربوون و مردن هەموو بوونەوەرێكی ئۆرگانی دەگرێتەوە، هەر بەو جۆرەش هەموو شارستانییەتێك دەگرێتەوە بەو جۆرە مێژووی جیهان بەوە پێك دێت، كە هەموو شارستانییەتەكانی جیهان یەك لە تەك یەكەوە بە شێوەیەكی سەربەخۆ دادەنرێت، بەو حسابەی كە هەریەكەیان دیاردەكە و بەسەرخۆیدا داخراوە و ڕوحی شارستانی دروست دەكات و دەریشی دەبڕێت ٢٢٩.

خۆ ئەگەر هۆكارە دەرەكییەكان بەهاوبەشی كاریان كردەسەر دووشارستانی، ئەوا هەر یەكە لەو دوو شارستانییەتە بە شێوەیەكی جیاواز ،لەوی دی خۆی بۆ ئەو هۆكارە دەرەكییانە شل دەكات، چونكە بەهەردووكیان ناتوانن ئەو هۆكارانە هەرس بكەن، مەگەر بیگەڕێننەوە سەر سروشتەكەی خۆی چونكە ئەگەر خووەكان جیاوازبن.

ئەو مۆركانەش جیاوازدەبن، كە هەر ڕوحێك لە ڕوحەكان دیاردەكانی خۆی پیێ مۆر دەكات لەبەر ئەوە حەقیقەت تەنیا لە شارستانییەتە جیاوازەكاندا هەیە. بەنموونە ئەگەر بابەتێك لە شارستانییەتێكەوە بگاتەوە شارستانییەتێكی دی، ئەو گەیشتنە دەیگۆڕێت، چونكە هەروەكو خۆی چۆنە ئاوەها ناگات، بەڵكو چار نییە هەر دەبێت كرداری ئاڵۆزیی دوور و درێژی گۆڕین هەرسكردنی بەسەردابێت ٢٣٠.

---

٢٢٩ _ د. صبحی: ص٢٥٠.

٢٣٠ _ د. بدوی: ص٩٣.

کەواتە هیچ شتێك نییە بەناوی "کاریگەریی شارستانییەتێك لە شارستانییەتێکی دی" بەو جۆرەی کە بڵێین شارستانییەتی دووەم کولتووری یەکەمی وەرگرتبێت نەخێر، چونکە ئەگەر شارستانییەتێك لە شارستانییەتەکانی رووکاری شارستانییەتێکی تری (وەرگرتبێت ) ئەو پێویستە ئەو ڕووکارە بچێتەوە سەر سروشتی خۆی. ئەگەر وەها دابنێین کە هۆکاری شارستانییەتێك لە شارستانییەتەکانی با بڵێین هۆکاری ئایین — ئەگەر دوو شارستانییەتی جیاواز خۆیان بۆ شل کرد، ئەوا هەریەکە لەو دوو شارستانییەتە بە شێوەیەکی جیاواز لە یەك خۆیانی بۆ شل دەکەن، نەك هەر ئەوە، بەڵکو شارستانییەتێك خۆی بۆ شارستانییەتێکی دی شل ناکات، تەنیا لەوەدا نەبێت کە لەگەڵ سروشتی خۆیدا بگونجێت و پاشان ڕوحی ئەوی بەردا بکرێت.

بە نموونە: کاتێك کە ئایینی بوزی لە هیندستانەوە گەیشتە وڵاتی چین، ڕوحێکی چینی لەبەرکرد لە بوزیە ئەسڵییەکە جیاوازبوو، هەروەها مەسیحییەتی ڕۆژهەڵات (مەزەبەکانی یەعقوبی، نەستوری و ئەریبوستی) جیاوازبوون لە مەسیحییەتی کاسۆلیك٢٣١.

ئەم تێبینیە ئەوەمان بۆ لێك دەداتەوە، کە بۆچی شارستانییەتێك چەند هۆکارێکی دروستبوونی شارستانییەتێکی دی پشتگوێ دەخات؟ بۆچی عەرەبەکان بەو جۆرە لە (ئەرستۆ) نەگەیشتبوون ،کە گریك تێیگەیشتبوو، تا ئەرەستۆ لەلای عەرەب، ئەو ئەرستۆیە نەبوو کە لای گریك هەبوو٢٣٢. چەندی شارستانییەتێك کەسایەتییەکی لە شارستانییەتێکی دی بە دڵ دا چووبێت، ئەوە ئەو کەسایەتییە بچووکتر دەکاتەوە و دەیشێوێنێت، هەر وەکو شپینگلەر گوتوویەتی ٢٣٣شپینگلەر دەڵێت: کەواتە با

---

٢٣١ _ دەربارەی ئەو کڵێسەو ڕێبازانە بڕوانە: ادمون رباط : المسیحیون فی الشرق قبل الاسلام.

٢٣٢ _ بڕوانە: د. بدوی: ارسطو عند العرب، وکالة المنطبوعات، الکویت، دار القلم، بیروت.

٢٣٣ _ د. صبحی: ص٢٤٧.

هەموو ئەو بیروباوەڕە پڕوپووچانە لەناوببەین، کە مێژوونووسانێکی خەڵەتاو، بە شێوەیەکی زۆر ناشرین مێژوویان پێ شێواندووەو خەڵکیان بەم گومراهیەدا بردووەو تووشی پڕوپووچی زۆریان کردوون، چونکە ئەوان مێژوونووسانیان وەها لێکردووە کە شتی بێ بەها بەم شێوەیە بخەنە سەر ئەو شێوە شێواوەی، کە بۆ مێژوو دروستیان کردووە. ئەم بیروبۆچوونانەش بریتین لە کاریگەری بەردەوامی یەکبوونی مێژوو.

ئەو مێژوونووسانە وتیان کە شارستانییەتەکان پێوەندییان بە یەکدی هەیە و بەیەکەوە بەستراون، ئەو پێوەندییانەش بریتین لە پێوەندیی نێوان نەخۆشی و هۆکارەکانی نەخۆشی ،هەموو شتێك بریتییە لە ئەنجام، ئەنجامەکە گرنگە، هیچ شتێکی تازە لە ئارادا نییە. ئەوانە هەرکاتێ هۆکارێکی سادەی ڕووی شارستانییەتێکی کۆن بە شارستانییەتێکی تازەوە ببینن، هاوار دەکەن و دەڵێن: ئەمە "کاریگەرییە" ئیدی بە دوای کاریگەرییەکەدا دەڕۆن و بۆ هەموو شتێك هەر دەیانەوێت. ئەوانە خەیاڵیان وابوو کە ئەرك وفەرمانی مێژوو ئەوەیە پەردە لە ڕووی "کاریگەری" هەڵماڵێت، کە ئەوەش تەواوبوو ئیدی بە هەوەسی خۆی دەخەوێ، فەرمانەکەی هەر ئەوەبوو تەواو[٢٣٤].

لە کورتی بیبڕینەوە: شارستانییەتەکان سەربەخۆن و یەك لە یەك جیاوازن. هەر یەکەیان بازنەیەکی داخراو بە دەوری خۆیاندا دەگێڕن و لە پەنجەرەیەك زیاتر لێکیان جیاناکاتەوە، کە ئەو پەنجەرەیەش ڕێگا بە هیچ ڕووناکییەك نادات بۆ جەوهەر و ڕوح و کرۆکی شارستانییەتەکەی تر بگونجێت ئەوەش کە لەو پەنجەرەیەوە ئاودیو دەبێت زوو بە زوو دەچێـە سروشتی شارستانییەتەکەی ترەوە، هەموو وێکچوون وهاوشێوە بوونێکیش تەنیا ڕواڵەت و ئەگەر بشڵێین کە ئادەمیزاد یەك کولتووری هەیە و مەزندەی کاریگەری یان کارلێکراوی دەکات، ئەوە لە خەیاڵ زێتر هیچی تر نییە[٢٣٥].

---

٢٣٤ ـ د. بدوی :ص٩٤.

٢٣٥ ـ م. ن ص٩٥..

لەوەوە تێدەگەین کە شپینگلەر شارستانییەتەکانمان وەها پێشان دەدات، کە ئەو حەقیقەتانەی زەمەنێکی دوورودرێژە لە هزر و زەینی مێژوونووساندا هەر ماون هەموویان رەتدەکاتەوە و هەمووی بە "نە !! و" نەخێر"دەخاتە بەرچاو و دەڵێت:

"نەکاریگەری و نەکارلێکراو و نەچاو لێکەری هەیە، ئەوەی کە هەیە تەنیا چاوئەندازێکی خێراو داهێنان و دەسپێکەو بەردەوامی لە ئارادا نییە، بەڵکو ئەوەی کە هەیە دابەشبوون و تەریکی و تەنیایە، پێشکەوتن هەربوونی نییە، بەڵکو ئەوەی کە هەیە خولێکی داخراوە و مەبەست و ئامانج لە ئارادا نییە، بەڵکو ئەوەی کە هەیە تەنیا چارەنووسێکی کۆتبەدەستەو هیچی تر"٢٣٦..

## تەوەری چوارەم: پێگەی بیروباوەڕی شپینگلەر

وێڕای ئەوەش کە بیروباوەڕی شپینگلەر کەوتە بەر رەخنەی هەندێ بیرمەند و فەیلەسووفی مێژوو ٢٣٧، بەلاّم بە کوچکەیەك لە کوچکە گرنگەکانی هزری مێژوو لە جیهاندا هەر دەمێنێت. هەر لە ساڵی ١٩٢٠ دا کتێبەکەی " هەرەسهێنانی ڕۆژئاوا" کە بەرگی یەکەمی دەرچوو، لەناو هەموو ڕۆشنبیرانی ئەوروپادا دەنگێکی گەورەی دایەوە و جەماوەر زۆر بەدڵیان بوو، بەسەریدا دابارین، کە هەندە بەدڵ و بە قووڵی و بە گشتگیرییەوە لە مەسەلەی مێژووی دەکۆڵییەوە٢٣٨ هەرچەندیشە بەر لەم کتێبە کتێبێکی تری لەسەر "هیراقلیتس" و زێتریش لە بیست کتێبی دانابوو٢٣٩.

---

٢٣٦ _ م.ن،ص٢٠٠.

٢٣٧ _ بۆ نموونە بڕوانە: هـ.أ مارو: من المعرفة التاريخية ترجمة،الى العربية: جمال بدران مراجعة د. زكريا ابراهيم، القاهره ١٩٧١. - د. موجان: نقد الفكر البرجوازى المعاصر ترجمة: يوسف عبدالمسيح ثروه، منشورات وزارة الثقافة والفنون، بغداد ١٩٧٩.

- سيمون دى بوفرار: واقع الفكر.دار الطليعة، بيروت١٩٦٣. - د. مصطفى ابو ضيف احمد: منهج البحث التاريخى الدار البيضاء، ١٩٨٧، - ايرى نف، المؤرخون و روح الشعر. و مصادر اخري.

٢٣٨ _ د. مؤنس: التاريخ والمؤرخون، مجلة عالم الفكر، ژمارەی باسکراوە ص١٠٣.

(ئیمری نف) خەسڵەتی شپینگلەر بە "کەسایەتی گەورە" دادەنێت و ڕێز و حورمەتی کتێبەکەشی لە ڕۆژئاوا و گەیشتە پلەیەکی ئەوتۆ بەنایابترین کتێب لە قەڵەم درا، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەرچووبێت٢٤٠. ئەو کەسەش کە کتێبەکەی کردووە بە عەرەبی وتی: ئەم کتێبە تەنیا بۆ خوێندنەوە نییە، بەڵکو بۆ لێکۆڵینەوەیە، ئینجا زۆر بە دڵ وتی: ئێستا وەختی ئەوە هاتووە، کە خوێندەواری عەرەب واز لە خوێندنەوەی رابواردن بێنێت و کتێبێك بخوێنێتەوە. کە هزر و بیری ڕۆشن بکاتەوە، کتێبەکەی شپینگلەریش یەکەم هەڵمەتی کتێبخانەی عەرەبییە کە خوێندەواری عەرەبی بەم کولتووره مرۆڤایەتییە نەمرەی دڵشاد کردبێت ٢٤١.

ڕەنگە بەڵگەی بەرزیی هزری شپینگلەر و کاریگەری دووربینی شپینگلەر ئەوەندە روون بێت کە کاری لە ڕشتەی هزری هەندێ لە گەورە بیرمەندانی چاخی نوێی ئەورووپا و ئەمریکاش کردبێ بەتایبەتی لەماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا، کە هەموو بیر و هۆشیان بەلای شپینگلەرەوە بوو، بە دوای چارەنووسی شارستانییەتی ئەورووپا (ڕۆژئاوا) و تەنگانەی ئەورووپایی مۆدێرندا وێل بوون، بە نموونە وەك بیرمەندی ئینگلیز کۆڵن ویلسۆن٢٤٢ و فەیلەسووفی ئەمریکی - بە ئەسل ئەڵمانی — هێربرت مارکۆزە H.Marcuse ٢٤٣، (ئەرنۆڵد تۆینبی) ٢٤٤ش دواکەسیان نەبوو

---

کولنجوود. فکرة التاریخ، ص٣٢٠

٢٣٩ _ ایمری نف، ص٢٦٩.

٢٤٠ _ مقدمة "تدهور الحضارة الغربیة"،ص٧٠.

٢٤١ _ هەمان سەرچاوە: ص٨. د. بدوی،اشپنجلر.

٢٤٢ _ کتێبەکەی "ئاوابوونی شارستانییەت" باسکراوە.

٢٤٣ _ کتێبەکەی "مرۆڤی یەك مەودا" وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: جۆرج گرابیشی بەناوی (الانسان ذوالعبد الواحد) چاپی دار الاداب، بیروت ١٩٦٩، هەروەها کتێبەکەی "عەقل و

## تەوەرەی پێنجەم:ڕەخنە لە بیرەکانی شپینگلەر

کولنجوود دەڵێ: ئەو تەقدیرەی شپینگلەر بۆ مێژووی دادەنێ تەقدیرێکە بەرهەڵستی سروشتی مێژوو خۆیەتی، چونکە تەقدیرێکە پشت بە فەلسەفەیەکی سروشتیانەی رووت دەبەستێ ، هەر وەکو ئەوەی کە بەرودواهاتنی ئەو قۆناغانەی کە لە ڕۆشنبیرییەك لەو ڕۆشنبیریانەدا هەیە بەو شێوەیەی ئەو بۆی دەچێ، مانایەك لە ماناکانی مێژووی زیاتر لەوەی تێدا نییە، کە بەرودوا هاتنی قۆناغەکانی ژیانی زیندەوەرێکی وەکو مێشولە ڕێك دەخات واتا کرمۆکە، مت بوو، پێ کوڕە ئەوجا زیندەوەری پێگەیشتوو. هەر قۆناغێکیش لەو قۆناغانەی ڕۆشنبیریی لێ پێك دێت. بەڕێگەیەکی میکانیکی دەگوێزێتەوە قۆناغەکەی دوای خۆی، ئەگەر هاتوو، کاتی خۆی هات، بە بێ بایەخدان بە چالاکی ئەو کەسانەی تێیدا دەژین ٢٤٥.

لەسەر بناغەی ئەم قسەیەی باس کرا ژمارەیەك فەیلەسووف و بیرکەرەوە تۆمەتی مەزهەبییەت و دۆگمایی دەخەنەپاڵ، هەر بۆیە ئەرنۆلد تۆینبی مێژرونووسی بەناوبانگی ئینگلیز دەڵێ: شپینگلەر زیاد لە پێویست مەزهەبییەتی هەبوو، بەبێ گێرانەوە باوەڕی بە حەتمییەت هەبوو٢٤٦.

کولنجوود لای وایە، کە شپینگلەری بار و قورسی ڕۆشنبیری، بۆ خاتری گونجان لەگەڵ مەبەستی ئەو بیرەی کە دەیەوێ مێژوو بە زانستە سروشتییەکان رابگەیەنێت، ڕۆشنبیرییکەی دەشێوێ و دەستکاری دەکرێت. ئێجگار دلڕەقانە پێی دەڵێ: هەڵگەڕاوەی "تا ئەو رادەیە پێ هەڵبڕین لە هەڵگەڕانەوەی راستیدا کەس نەی

---

شۆڕش" کە د. فؤاد زکریا بەناوی "العقل والثورة" کردوویە بە عەرەبی، الهئیة المصریة العامة للتالیف والنشر، بیروت ١٩٧٠.

٢٤٤ _ د. صبحی: ص ٢٥٨.

٢٤٥ _ کولنجوود: ص٣٢٢.

٢٤٦ _ د. صبحی: ص ٢٦١.

گەیشتووەتیٚ، تەنانەت بیرمەندەکانی چەرخی نۆزدەمینیش کە بەدوای میتۆدی وەزعی کەوتبوون، کە زۆر رەنجی بیٚ بەریان دا بۆ گۆڕینی میٚژوو بە زانستیٚکی سروشتی٢٤٧.

گۆڕینی میٚژووش بە زانست، بەو ڕشتەیەی شپینگلەر ویستوویەتی، وادەکات شارستانییەك هەرگیز نەتوانیٚ خۆی لە چارەنووسی وەك ڕووخان و نەمانی شارستانییەتەکانی دی بە دوور بگریٚت، گوایا چونکە ئەم چارەنووسە، سروشتیٚکی شارستانەتییەکانە. ئەمەش مانای وایە کە چارە نییە و بە شیٚوەیەکی لە چارەنووسراوی بیٚ سیٚودوو کردن دەبیٚ ڕووداوو ڕاگویٚزان لە قۆناغیٚکەوە بۆ قۆناغیٚك بەو دوا بیٚن." چونکە ڕیٚی دەربازبوون نییە "٢٤٨، هەروەها شپینگلەر لە توانای ڕەگەزی مرۆڤ بۆ رزگارکردنی شارستانییەتی — هەر شارستانییەك بیٚت — لە ڕووخان، بەگومانە٢٤٩.

خۆ ئەگەر ویستمان ئەم بیردۆزەیە لە شیٚوەیەکی مامناوەندیدا سەیر بکەین و تیٚی بگەین. بە دەست خۆمان نییە دەبیٚ بلیٚین کە شپینگلەر خولی شارستانەتی بە خولی ژیانی بوونەوەری زیندوو دەشوبهیٚنیٚ، ئەوەندە سەردەکات، کە لەگەڵ پرۆگرامی زانستیدا ڕیٚکناکەویٚت، چونکە "بوونەوەری زیندوو پاش ئەوەی لەشی دەگاتە پلەیەکی تایبەتی پیٚگەیشتن دەمریٚ، بەلاّم گەلان یان کۆمەلاّن لەگەڵ هاتنەدنیای هەر نەوەیەکدا لاویٚتییان نویٚ دەبیٚتەوە٢٥٠. ئیتر شایانی ئەوە نییە ئەگەر لە رووی مەجازیٚکی ڕووتەوە نەبیٚت شارستانەتییەك بە پیری وەسف بکریٚت، چونکە لیٚرە پیری

---

٢٤٧ _ کولنجوود:ص ٣٢٣.

٢٤٨ _ کولن ویلسون: ص ١٤١.

٢٤٩ _ ایمری نف: المؤرخون و روح الشعر، وەرگیٚرانی بۆعەرەبی د. توفیق اسکندر. طبعة مکتبة الانجلو مصریة القاهرة،١٩٦١، ص٢٧٢.

٢٥٠ _ د. حسن مونس: التاریخ والمورخون. عالم الفکر الکویت، ص١٠٣.

که بێ هێزی و ڕزینەی لە دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا لە پیربوونی ئەندامی (العضوية) ی زیندووان زۆر جیایە.

دوو لێکۆڵەرەوە "کاروبر" و "سوروکین" زۆر بە روونی و بێ لە گومان پیشانیان داوە، کە زۆر ڕژێمە شارستانییەتی یان کۆمەڵایەتی لە زۆر شارستانەتیی مەزندا رووی داوە لە دایکبوون پاشان مردوون، جارێکی دیکەش لە دایکبوون و پاشان ردوون، ئەم شارستانییەتانەش لە "ڕووی کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسییەوە هەڵکشاون، پاشان لە ژیانی بێ ڕادەو درێژیاندا زۆرجار دانەویون، وەنەبێ هەر یەك جاریش لەدایکبوون و مردنیان تووش بووبێت، وەنەبێ هەر ماوەیەکیش تەنیا گەشانەوەو یەك ماوەش سیسی و ئاوابوونیان تێدا بێت٢٥١.

هەروەها زۆر مێژوونووسی ڕۆژئاوایی لەبارەی ئەو پێشبینییە ڕەشەی شپینگلەر بەرامبەر ڕووخانی ڕۆژئاوا و تێکهەڵوەشانی شارستانەتییەکەی هەیەتی کە گوایا، بەهۆی مادییەت و میکانیکییەوە زیندوویەتی ون کردووە و پێی ناوەتە کۆڕی خۆش رابواردنی مادییانە و نەرمونیانی ژیری و چارنییە دوای ئەمە نەمانی تووش دەبێت. لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لێگرتووە. سەرباری ئەوە کە مێژوو بواری سەربەستیی مرۆڤانەیە و وەکو سروشت نییە دیاردەکانی حەتمی و داسەپاوبن، بۆیە پێشبینیکەران (المتنبئين) لەناو لێکۆڵەرەوانی مێژوودا جێییان نابێتەوە٢٥٢.

هەندێ لەو بیرمەندان ڕەخنە لە شپینگلەر دەگرن لایان وایە تێڕوانینی بۆ جیهان گەلێك لە تێڕوانینی میکافیللییەکان پڕ لە کارەسات ترە. چونکە مرۆڤایەتی لە هەموو دوارۆژێك دادەبڕێت و بێواتای "بێهوودەیی" ی دیاردەخات کاتێك کە مێژوو بە گەردوون

---

٢٥١ _ د. صبحي، ص١٧٢.

٢٥٢ _ د. الشرقاوي: في فلسفة الحضارة، ل:٢٠٣. د. مصطفى ابو صيف: منهج البحث التاريخي، ل:١٢٣. د. مؤنس: التاريخ والمؤرخون، ص١٠٤.

دەبەستێ٢٥٣. بەڵکو هەندێکی دی ڕەخنەکەیان لە شپینگلەر دەگەیەننە ڕادەی هێرشێکی ڕووت و دەڵێن بیروڕاکانی شپینگلەر بانگی "ناهیوایی " دەدەن٢٥٤.

هەرچۆنێك بێت، بیروڕاکانی شپینگلەر، سەرەڕای مەودای فەلسەفییانەیان، لە ئەنجامدا لە ئاشی بیری کۆنەپەرستی دەکەنەوەو دان نانێن بە دەوری شارستانەتییەکانی تر لە گەشەسەندنی ڕەوتی شارستانییەتیی مرۆڤایەتیدا، کە ئەمەش دوورە لە واقیعی بەردەست و دوورە لە لۆژێك و بەڵگە چەسپاوە مێژووییەکان. هەربۆیەش بیروڕاکانی بوونە هۆیەکی یاریدەری دەرکەوتنی بیری نازییەت لە ئەڵمانیا، ئەگەرچی شپینگلەر شەخسی خۆی دژی نازییەت وەستاو لە کتێبی "سالآنی بڕیاردان" دا (میونیخ١٩٣٣) ڕەخنەشی لێگرت.

بیری شپینگلەر وەکو ئەنجامی شارستانەتییەکانی خۆی کۆتاییەکی دڵتەزێنانەی هەبوو، کەوا وای دانا لە مێژوودا نەڕاستی و نەداهێنانەکان هیچیان نا، بەڵکو خواستی هێز سەردەکەوێ. لای ئەو دەوری تەکنەلۆژیا و ئابووری لە پلەی دووەمدا دێن.

هەرچی مرۆڤیشە بەو پێیە کە بەرهەمهێنە "بەرهەمی بەرهەمەکەیەتی" ئەوا فڕێ دراوەتە دەرەوەی مێژوو. ئەگەر مرۆڤ هەر نرخێکی هەبێ ئەو نرخە لە خانەدانەکان (ئەرستوکراتیی کۆمەڵ)، واتە هەڵبژاردەکاندا هەیە نەك لە جەماوەردا. لای وایە کاتێك خانەدانی نەمێنێ و جەماوەر سەربکەوێ، مانای وایە مێژوو کۆتایی

---

٢٥٣ ـ سیمون دی بوڤوار. واقع الفكر اليميني، دار الطليعة , بيروت، ١٩٦٣، ص ٥٥.

٢٥٤ ـ هـ. أ. مارو: من المعرفة التاريخية ترجمة: جمال بدران: مراجعة د. زكريا ابراهيم القاهرة، ١٩٧١،ص٥٦.

د. موجان: نقد الفكر البرجوازي المعاصر، ترجمة: يوسف عبدالمسيح ثروة. دار الحرية للطباعة بغداد، ١٩٧٩، ل٢٥. د. عبدالجليل الطاهر، مسيرة المجتمع، ص:٢٤٠.

دێت و مرۆڤایەتی لە بێدەنگی و بێئاگایی و لە نەبووندا نوقم دەبێت. بۆیە شپنگلەر بە ئایدیولۆژیی پاشگەزی کۆنەپەرستانە و دوژمنایەتیی زانستییەوە پەیوەندیدار بوو.

# بەشی پێنجەم

## بەرەنگاری و وەڵامدانەوە (بێباکی و گوێڕایەڵی) لە پەیدابوون و ڕووخانی شارستانییەتدا یان بیرۆکەی "ئارەزووی ئادەمیزاد" بەڕای تۆینبی.

## (بێباکی و گوێڕایەڵی ) لە پەیدابوون و ڕووخانی شارستانییەتدا

## بیرۆکەی "ئارەزووی ئادەمیزاد" لای تۆینبی

مەنزڵگەی (پلە و پایەی) تۆینبی مێژوونووسی گەورەی ئینگلیز، ئارنۆڵد جوزێف تۆینبی (A.J.toynbee ١٨٨٩ -١٩٧٥) بە هەموو مانای ئەم وشەیە، مێژوونووسێکی مەوسوعیی خاوەن تێبینی قووڵ و لە لێکۆڵینەوەدا ورد و ڕژدبووە.

لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە مێژوونووسێکی مەوزوعی و پەتی و خاوەن بیرێکی مرۆڤانە و دوور لە فەرق و جیاوازی بووە و هیچ کینەیەکی لە دڵدا نەبووە و، جیاوازیی ئایینی یان مەزهەبیی بە خەیاڵیدا نەهاتووە، تۆینبی بەروبوومی هزریی زۆری هەبووە. لە بواری مێژوو هەروەها فەلسەفەی مێژوودا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی داناوە، کتێبێکی بەناونیشانی " لێکۆڵینەوەیەك بۆ مێژوو—دراسة للتاريخ" داناوە. هزر و بیری خۆی تێدا گوشیوە، ئەو کتێبە بەڕاستی نایابترین و بەرەوایترین کتێبە کە هەتا ئێستا هزری مۆدێرنی ڕۆژئاوا لە مێژوو و فەلسەفەی مێژوودا پەی پێ بردبێ. کتێبێکە تا بڵێی بەبەها و پایەبڵندە.

تۆینبی مێژوونووس و بیرمەند و فەیلەسووف، بە شێوەیەکی بەرپرسانە لەگەڵ مێژووی ئادەمیزاددا کاری هەبووە. تۆینبی شانبەشان لەگەڵ شانازی و بەروبووم و هەڵە و جاروبار لەگەڵ پڕوپووچی ئادەمیزاددا ڕچەی گرتووە و لەگەڵیدا هەڵدێری ماندووبوون و بێ برستی و بێ خێریی تاقی کردووەتەوە و پاشان ڕزگاربووە و سەرکەوتووە و لەژێر چاڵی خوێن و خۆڵ و خراپەکاریدا دووبارە سەری دەرهێناوەتەوە و ژیاوەتەوە. ئەم بیرمەندە لەگەڵ ئادەمیزاددا تەعامولی کردووە، بەتەمای ئەوەش بووە کە مێژووی ئادەمیزاد، بەشێوە و لەسەر ئاستی جۆربەجۆر دووبارە ببێتەوە. بەو جۆرە دووپات و تەئکیدی کردەوە، کە ئادەمیزاد دەتوانێت لە (شاری خامۆشانەوە) بگاتە (شاری ژیان)، هەرچەندیشە ژیان و رزگاربوون بۆ کەس هەتاسەر نابێت.

گوتیان تۆینبی ئەفلاتوونی سەدەی بیستەمە، چونکە داوای دامەزراندنی حکومەتێکی فەزیلەتی جیهانی دەکات، وەکو "شارە فەزیلەتەکەی ئەفلاتوون" ئینجا گوتیان تۆینبی ئەشتاینی ئەدەب و مێژووە. بەڵکو گوتیشیان "خاوەن پەیامێکی تازەیە" هەموو ئەمانەش لەبەر ئەوە بوو کە کەس پێش ئەو، وەك ئەو مێژوو و فەلسەفەی مێژووی نەنووسیوە. ئینجا سوروکن- کە یەکێکە لە رەخنەگرە گەورەکانی تۆینبی گوتی: لێکۆڵینەوەی مێژوو کە تۆینبی پێوەی ماندووبووە، گەورەترین ئاسەواری هزرە لە بواری لێکۆڵینەوەی مێژوو لەم زەمانەدا.

ئەگەر تۆینبی لەسەر ئاستی جیهان، ئەوەندە بەگرنگ دابنرێت، کەواتە لەناو میللەتانی جیهاندا مەنزڵگە و پلە و پایەی تایبەتی خۆی هەیە، نەخاسمە لەلای عەرەب، چونکە تۆینبی نەبزی کێشەکانیان گرتووە و بە دڵسۆزی و بێلایەنی گرفتەکانیانی چارەسەرکردووە، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە هیچ بیرمەندێك وەها چارەسەری نەکردووە. تۆینبی باسی بابەتی یەکێتی عەرەبی کردووە، راشیگەیاندووە، کە ئەم یەکبوونە هەر دەبێت ببێت، چونکە مەسەلەیەکی سروشتییە، لە کاتێکدا کە پەرتەوازەیی دیاردەیەکی ناکاوە، ئارەزووی عەرەب هەر سەردەکەوێت.

## شارستانییەتی جوو، شارستانییەتێکی مردووە، تەنیا لە چەند کۆمەڵێکی بەردین دەچن

تۆینبی زایۆنیزم تاوانبار دەکات و دەڵێت: داگیرکردنی فەلەستین تاوانبارییەکی ئاشکرا و ڕوونە و ڕای مێژوونووسانی جوو بە درۆدەخاتەوە و دەڵێت: مێژوونووسانی جوو، تەنیا بەڕاوبۆچوونی خۆیان مێژووی خۆیان نووسیوە و دەیگێڕنەوە. مێشکی ئەوانە هزری " شعب الله المختار" دەستەمۆی کردووە، گوایا ئەوان گەلێکن لە لایەن خواوە هەڵبژێردراون، بەدرێژایی رۆژگار ئەم خەیاڵە لە مێشکیان دەرناچێت. هەموو میللەتەکانی تر بەڕای ئەوان لە جوو خوارترن، لە ئادەمیزاد نزمترن، هەموو

میللەتەکان لە شەریعەتی خودا بێ ئاگان و ناوی "الامین" واتا ناوی دۆستانی هەموو میللەتان لە خەڵکی خۆیان دەنێن، گاڵتە و قەشمەری بەخۆیان دەکەن.

تۆینبی جوو بە پاشماوەی شارستانییەتێکی مردوو لە قەڵەم دەدات و دەڵێت: جوو بریتین تەنیا لە چەند کۆمەڵێکی بەبەردبوو.

مەسەلەیەکیش کە زێتر فکری ئەو فەلەستینیانە ڕادەکێشێ کە لەگەڵ دوژمنی زایۆنیزمی داگیرکەردا ڕووبەڕووی شەڕێکی چارەنووسساز دەبنەوە، ئەوەیە کە تۆینبی ڕای خۆی لەسەر دەربڕیوە و پێی دەڵێن بەخشش و بەروبوومی جوو، ئەوەتا دەڵێت: جوولەکەکان بەهۆی بێباکی لە (پەرتەوازەیی- Diaspora) شتیان بەرهەمهێناوە، نەك وێڕای پەرتەوازەیی، وەك خۆیان دەڵێن. پاشان کە ئەوان لەناو یەك دەوڵەتدا کۆبوونەتەوە و یەکیان گرتووە، واتا هۆکاری بێباکییەکەشیان نەماوە ،کە لە ئەسڵا بووبووە هۆی ئەوەی کە بێن بەبەرهەمهێن. سەرباری ئەوەش، کە ئەم کۆبوونەوەیان "واتا دروستبوونی دەوڵەتێکی ڕەگەزپەرستی لە فەلەستین" بریتییە لە بێباکییەکی تەواو لە عەرەب کە عەرەبەکان لە دژیان دەورووژێن. پاشان ناهەمواریی جوولەکە لە چەوساندنەوە و پەرتەوازەییدا دووبارە دەبێتەوە. ڕاستیشت دەوێت ئەم قسەیە ڕوون و ئاشکرایە، نەك هەر تەنیا بڕوای عەرەب و ئیسلام بە مەسەلەی فەلەستین پتەوتر دەکات لەسەر ئەو ئەساسەی، کە لە مێژوونووسێکی بێلایەن و سەربەخۆیی "بیانییەوە" دەرچووە، بەڵکو دەیانخاتە سەر هەوەسی ئەوەی کە لە بیرۆکەکەی بکۆڵنەوە، کە ئەم هەڵوێست و بۆچوونەی لێ پەیدابووە.

ئەم هەڵوێستانەی تۆینبی تووشی ناحەزی و دوژمنایەتییەکی زۆری کردووە، چ لەلایەن سیاسییە ئینگلیزەکانی "ئەوانەی کە لە ساڵی ١٩١٧ دا وەعدی خەجاڵەتباری بەلفۆریان دەرکرد" چ لەلایەن خودی جوولەکەکانەوە، لە کاتێکدا هیچ توێژەر و سیاسییەك نەیتوانیوە وشەیەکی هەقیانەت لەم بابەتەوە بنووسێت یان بڵێت. تۆینبی لە موحازەرەیەکیدا وتی: ئیسرائیل لەناو ئەم دەریا عەرەبەدا، کە شەپۆلەکەی هەموو کەنارەکانی گرتووەتەوە هەندەی پێ ناچێت، لە خۆیەوە تەواو دەبێت، چونکە ئیسرائیل

وەك تۆینبی دەڵێت — لەسەر بناغەی گەندەڵی دروست بووە و لەبار نییە و ئەگەر عەرەب بیانەوێت و حەزبکەن، ئیسرائیل ناژێت و بەردەوام نابێت.

وەزیری دەرەوەی ئیسرائیلیش کتێبێکی بەناونیشانی "گومراهی تۆینبی و موسوڵمان" داناوە.

تۆینبی لە هەموو بەشەکانی کتێبە گەورە مێژووییەکەیدا باسی شارستانییەتی عەرەب و ئیسلامی کردووە. هەروەها جێگایەکی بەرچاوی لە کتێبی "نزیکبوونەوەی مێژوونووسێك لە ئاین" بۆ ئیسلام تەرخان کردووە و ڕاشی گەیاند کە ئایینی ئیسلام لە هەموو بیروباوەڕێکی ئایینی زیاتر لەگەڵ عەقڵدا ڕێك دەکەوێت و لە هەموویان زیاتر بەرامبەر بە بڕوا و ئیمان بە پرەنسیپی یەکێتی و یەکبوونی خوای گەورە، لە ڕووتر و ڕاشکاوانەترە و لە زانینی شەرەفمەندیی و خوداوەند و بەرز و بالآیی خودی خوای گەورەدا ڕوونتر و ئاشکراترە.

تۆینبی ئاماژە دەدات بە دۆخی ئیسلام و دەڵێت: ئەو ڕووکەش و ڕووکارە درامییەی لەگەڵ ئیسلامەتیدا لە دایکبوو و دەرکەوت زۆر لەو زیاترە کە لەگەڵ هەردوو ئایینی مەسیحییەت و بوزیدا دەرکەوت " پێغەمبەری بە حورمەتیش" د.خ" بە خەڵکی سەلماند، کە ئەوە ئەوپەڕی زیرەکیی سیاسییە و خاوەن پەیامێکی ئایینیی گەورەیە. تۆینبی تەئییدی قسەکانی مێژوونووسان دەکات، کە دەڵێن هۆی گەورە و قەتعیی بنبڕی بڵاوبوونەوەی ئیسلام، هۆی ماددییە. بەڕای ئەو جێگرەکانی پێغەمبەر کە بڕوایان بەم ئایینە تازەیە هێنا، ئایینە تازەکە تەنیا پێویستی بە چەن فەرزێك هەبوو. ئەنجامدانی ئەو فەرزانەش زۆر گران نەبوو.

هەرچی لە بارەی میسرەوەیە نیل خەڵاتە بە میسرییەکان. مێژونووسی گەورە، تۆینبی زۆر بەدڵ و هاوسۆزی باسی ڕۆڵی شارستانییەتی میسرییەکان دەکات. کاتێك مێژوونووس — ئەرنەست بارکەر- ڕەخنەی لێگرت و گوتی: لە بەشەکانی کتێبە گەورەکەیدا ڕووبەرێکی بۆ ئینگلتەرە داناوە بە قەدەر شەش یەکی ئەو ڕووبەرە دەبێت، کە بۆ میسری تەرخان کردووە" تۆینبی بەرپەچی دەداتەوە و دەڵێت: ئەوەی لە

رووبەری فەهرەسەکەی ئینگلتەرای کردووە بە شەش یەکی ڕووبەری میسر ئەوە تەنیا پێکدادانە، نەك من ئەو دەبوو لە شەست بەشی فەهرەسەکە پەنجاو نۆی بۆ میسر تەرخان بکات، چونکە میسر وەك تۆینبی دەڵێت: سێ هەزار و پێنج سەد ساڵە بووەتە تەوەرەی مێژووی جیهان، کە مێژووی شارستانییەتی جیهان هەمووی پێنج هەزار ساڵە. تۆینبی باسی دەسکەوتەکانی شارستانییەتی میسر لە سیستەمی وردکاریی ئاودێریی و زانستی نووسین و پێوان و کێشان و ئەندازەیی بینا و هەرەم و بازرگانی و ئاسنگەری و زێڕەنگەری و چنین و زانستی حیسابات و داهێنانی ساڵنامە و کشتوکاڵی بەبەرنامە و پزیشکی و کیمیا و مۆمیا وتاد... دەکات و بیناکردنی هەرەمەکان دەکات بە شاهێدی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئیدارەی میسری، کە هەموو توانستی هونەری و ئابووری و ئیداریی میسری ئامادەباشی کردووە، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم پرۆژە جوانەی لە چاخی بنەماڵەی چوارەم و پێنجەمی مێژووی میسردا هاتووەتە دەست ،کاتێ کۆمەڵگەی میسر گەیشتە لوتکەی گەورەیی کە کەس نایگاتێ.

مەبەستیش لە لوتکەی گەورەیی میسر ئەو ئیشە پاشانەیە، کە هەتا ئێستاش ماونەتەوە، میسر بە نموونە، بەهاودەنگی و هێزی ئادەمیزادی میسر پرۆژەگەلێکی زۆری ئەندازیاری بۆ چاککردنی گولاو و زەلکاوەکان بنیاد ناو هەرەمەکانیشی دروست کرد. هەر لەو چاخەدا گەیشتە لوتکەی ئیدارەو سیاسەت و هونەر و ئایینیش هەرچی میسری ئیسلامیەتییە، دوای ئەوەی هەر لە چاخی مەملوکەکاندا شرتوشۆی لە مەغۆلەکان لەشەڕی عەین جالووت — دا بڕی و سەلیبییەکانیشی دەرکرد ئەوسا بووە قەلای قایمکاری سەربازیی موسوڵمانەتی و پایەی بەهێزی ئابووری و سیاسی و منارەی ڕۆشنبیری و ئایینی میسر بەڕای تۆینبی دوای ئەو هەموو سەرکەوتنانە بووە قەڵغانی عەرەبایەتی و ئیسلامەتی.

هەرچی عێراق و شارستانییەتی کۆنی ڕەسەنی عێراقە، ئەوە تۆینبی لە ساڵی ١٩٥٦ زایینی دا هاتە عیراقیش دوای ئەو ساڵەی کە کتێبی "کورتەی لێکۆڵینەوەی مێژوو" لە عێراقدا تەرجەمەکراو بڵاوکرایەوە، لە عێراق چەندین موحازەرەی گوتەوە و

مامۆستا — تەها باقر- یشی لەگەڵدا بوو. مامۆستا تەها باقر، ئەو کاتە بەڕێوەبەری ئاسەوارەکانی عێراق بوو، یەکەم کەسیش بوو کتێبە گەورەکەی تۆینبی کرد بە عەرەبی. تۆینبی سەری لە شاری نەجەفی پیرۆزیش داو بە شارستانییەتی وڵاتی رووبارەکەی دیجلە و فوراتیش زۆر سەرسام بوو. کاتێکیش، کە سەری دا لە مۆزەخانەکەی عێراق. زۆر بەدیار "بەردەکەی حەمورابی" یەوە وەستاو، گوتی: ئەم بەردە ناوی ئەو مەلیکە گەورەیەی لە مێژووی جیهان و لە مێژووی پێشکەوتنی عەدالەتدا بە نەمری هێشتەوە و کردی بە ناوبانگترین کەسایەتی مێژووی کۆن، بەڵکو بەناوبانگدارترینی مێژووی هەموو چاخەکانیش، جا لەبەر ئەو هەڵوێستە شەرەفمەندانەیەی ئەم مێژوونووسە، گەورەیە عێراق لە پێش هەموو کەسێکەوە باوەشی حورمەتی بۆ گرتەوە، چ بە زیندوویی و چ بە مردووییش، ئەوەبوو وەزارەتی راگەیاندن بە هاوکاریی یەکێتی مێژوونووسانی عەرەب، مەهرەجانێکی تایبەتی بۆ سازدا، لە دوابەدوای مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٧) دا کۆمەڵی نوخبەی بواری مێژوو و فەلسەفەی مێژووی تێیدا بەشداربوون و ئاهەنگێکی شایستەیان بۆ ئەو هەڵوێستە بوێر و بەجەرگەی تۆینبی بەرامبەر بە عێراقییەکان و عەرەب و بیانییەکانیش، گێرا.

لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن. ڕاوبۆچوونی تۆینبی بەلای غەیری ئەوروپاییەکانەوە بەهاو نرخێکی گەورەیی هەیە، کە لە خەیاڵی زۆربەی مێژوونووسانی ڕۆژئاواو جیاوازە، کە هەر وەك خۆی دەڵێت — لە ئاستی هزری ئەوروپی لایداوە بۆ هزری جیهانی، چونکە ئەو ماددە مێژووییەی ئەو هەند بە پێزە و هەند جۆراو جۆرە کە بگرە لە نموونە نیوەچڵەکانیشدا ڕووداوگەلی هیچ شارستانییەتێکی لەبیرنەچووە، لەبەرئەوە چینی و هیندی و عەرەبیش هەند گرنگی بە شارستانییەتەکانی خۆیان دەدەن، مەگەر هەر هێندەش گرنگی و بایەخ بە شارستانییەتی ئەوروپا بدەن.

پاشان تۆینبی تەنیا مێژووی لایەکی دیارکراوی زۆری نەنووسیوە، هەروەها گرنگیی بە مێژووی یان بە شارستانییەتی ماوەیەك نەداوە، بەڵکو لە هەموو

شارستانییەتی جیهانی بە کۆن و تازەوە بە درێژایی زیاتر لە پەنجا ساڵ زۆر بە قووڵی و بەپێز و بەمەوزوعی کۆڵیوەتەوە، پاشان ئەو، کە ڕەخنە لە مێژوونووسانی دیکە و فەیلەسووفەکانی دیکەی مێژوو دەگرێت و دەڵێت، ئەوانە لە نۆکێك نۆ پاروو دروست دەکەن (واتا لە ماددەیەکی کەم قولەیەکی بەرز دروست دەکەن) خۆ مەبەستی لە خۆی نییە. ئەوەی کە ئەو دەیکات تەنیا لێکۆڵینەوەیەك نەبووە، کە لەسەر بنەمای زانین و دیتن دامەزرابێت، بەڵکو زۆرتر هەولی داوە ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە ڕێگەی سەفەر و هاتوچۆوە، زیاتر لە مەبەستەکەی نزیك بکاتەوە. واتا ئەگەر بشێت دەتوانین بلێین لە "مێژوونووسێکی سەر مەیدانی ڕووداوەکان دەچێت" و لە ڕووی پێزی ماددەی مێژووشەوە کەس ناتوانێت بلێت من تۆینبیمە، واتا کەس بەو ناگات و هیچ مێژوونووسێك وەك تۆینبیی بۆ ناکرێت. ئەوەتا کتێبەکەی کە (٦٢٩٠) لاپەڕەیە و بەزێتر لە سێ ملیۆن وشە و تەنیا ناوەڕۆکەکەی (٣٣٢) لاپەڕەیە و نزیکەی بیست هەزار پێناسەی تێدایە، پڕە لە زانیاری پڕ بەهای زانستی مێژوو و لێکۆڵینەوەی فەلسەفی و مەعریفەی ئەدەبی و ئایینی، هەموو ولاّتانی ئەم سەرزەمینە دەگرێتەوە، هەر لەبەرەبەیانی شارستانییەتەوە ، تا دەگاتە زەمەنی ژیانی خۆی، ئەمە سەرباری کتێبە زۆرەکانی دیکەی کە دایانی ناوە و کتێبگەلێکی زۆرن.

## ڕەخنەی تۆینبیی لە هزر و بۆچوونی مێژوونووس وفەیلەسووفەکانی مێژووی ئەورووپا

هەر بە وێنەی شپینگلەر تۆینبیش ڕەخنەی لە ڕاوبۆچوونی مێژوونووسانی ئەورووپا گرتووە، کە لە بارەی مێژووەوە لە زەین و هزری مێژوونووسانی ئەورووپادا دایکوتاوە و وازیان لێ نەهێناوە. تۆینبی بە دووری دەزانێت، کە شارستانییەتەکان بووبن بەیەك، واتا بە دووری دەزانێت کە ڕەوتی شارستانییەتی هێشتا هەر بەرەو ژوور، بەشێوەی هەرەم سەردەکەوێت و لە شارستانییەتی ڕۆژئاواو تەواو دەبێت، چونکە شارستانییەتی

ڕۆژئاواو وەرەسەی شەرعیی هەموو ئەو شارستانییەتانەیە ، تۆینبی ئەو بیروبۆچوونانە ڕەتدەکاتەوە.

تۆینبی لەو باوەڕەدا نییە کە شارستانییەتی ئەورووپا لە هەموو شارستانییەتەکانی تر بەهێزتر و بەپێزتر و گرنگتر بێت، تۆینبی ڕای دەگەیەنێت کە ئەو هزرو بیرە بریتییە تەنیا لە قسە و قسەلۆك و تەڵەی ئەورووپایی کە بۆ خاوەن شارستانییەتەکانیان ناوەتەوە. ئەو دەڵێت، شارستانییەتی ئەوتۆ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتدا بە کۆششی ئادەمیزاد دروست کراون لە شارستانی ئەورووپا پێشکەوتووتر و سەرکەوتووترن، نەك تەنیا لەبەرئەوەی کە کۆنتر و ئەسڵتر و ڕەسەنترن، بەڵکو لە ڕووی ماوەی زەمەنیشەوە لە شارستانییەتی ئەورووپا بەپێزتر و بالاترن، ئەوەتا بنۆڕە شارستانییەتی میسر، لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینەوە، هەتا سەدەی پێنجەمی زایین تەمەنی هەر بەردەوامە و تازەیە، ئەو ماوەیە سێ جار بە قەدەر ماوەی ژیانی کۆمەڵگەی ڕۆژئاواو لە بوونییەوە تا ئەمڕۆ زیاترە.

ڕاستیشت دەوێت، یەکبوونی شارستانییەتەکانی جیهان بەپێی ئەو بیرۆکە تازەیەی ڕۆژئاوا خەیاڵێکە و ڕووکەشی لێکۆڵینەوەی شارستانییەتی و کێشەی پڕ لە زەحمەتی ئەو لێکۆڵینەوانە سەپاندوویەتی دەکات و هیچی دیکە نییە.

## دابەشبوونی سێ کۆچکەیی نەبووە و ناشبێت

دابەشبوونی مێژوو بەسەر سێ کوچکەی کۆن و ناوەند و نوێدا کە وەك لە زەینی مێژوونووسانی ڕۆژئاوادا جێگای خۆی گرتووە، ئەوە لەلایەن تۆینبییەوە ڕەخنەی لێگیرا و تۆینبی ڕایگەیاند ئەو دابەشکردنە لە ئیشی کەسێك دەچێت لە جوگرافیا بزانێت و کتێبێك لەسەر جوگرافیای جیهان دابنێت و لە باسی ئەورووپا و دەریای ناوەڕاست زێتر هیچی تری تێدا نەبێت و دەڵێت ئەم دابەشبوونە سێ کوچکەییەی مێژوو و ساڵنامەی زایینی لە دەرەوەی ئەورووپا بەهیچ ناچێت.

## لێکدانەوەی ڕەگەزدۆستیش لە ئارادانییە

مێژوونووسی گەورە تۆینبی، ئەو لێکدانەوە ڕەگەزدۆستێیە باوەی ئەورووپایش ڕەتدەکاتەوە کە بڕوایان بە لێکدانەوەی " ڕەگەزدۆستی یان جنسیی" مێژوو هەیە و بەر ڕەخنەی دەدات. سەرانی ئەم دابەشکردنە گۆج و ئیفلیجەش ئەمانەن: (هۆستن ستیوارت چمبرلن – Houstun Stewart Chamberlain ) و (کۆنت گۆبینۆ – Counte de Gobineau) (ترێتشك – Treitschke) و (فریمان freemane) و (گرانت - Grant ) ئەوانە، کە خاوەنی ئەو لێکدانەوەیەن لایان وەهایە، کە گەلانی جیهان خەسڵەتی دیارکراویان هەیە و ئەوان بەپێی ئەو خەسڵەتانە مێژوو دادەڕێژن و دەینووسن و خەسڵەت و جۆری " سپی" بەسەر هاوجنسی خۆیاندا دادەبڕن، بەتایبەتیش بەسەر "نۆردی – باکووری – جەرمانی" دا خەسڵەتی ڕەگەزدۆستی دادەبڕن، کە لەو خەسڵەتانەوە حوکمی زۆرەملێ و توند بەسەر مێژوودا دەسەپێنن. ئەوەتا مستەر چمبرلن کە یەکێکە کە هەڵگرانی ئەم لێکدانەوەیە لە کتێبێکدا (بناغەکانی سەدەی نۆزدەمین – The foundation of the nineteenth century ) دەنووسێت و دەڵێت: (مێژووی ڕاستەقینە لەو ساتەوە دەست پێدەکات، کە ئەڵمانەکان، بە دەستێکی بەهێز میراتی کۆنەکانیان وەرگرت ) دیاریشە کە ئەم جۆرە بیرۆکە ڕەگەزدۆستانەیە، لە رووی زانستی جنسی ئادەمیزادەوە، واتا لە رووی (ئەنسرۆپۆلۆجیاوە) هیچ دروست نییە و نەجنسی باڵاهەیە و نە جنسی نزم و بێ بەها، چونکە هەموو جنسەکان دەتوانن ئامراز و هۆکاری شارستانییەت بەدەست بێنن و ئەگەر میللەتێکیش، کەمتر یان زۆرتر لە دامەزراندنی شارستانییەتدا بەشداریی کردبێ، ئەوە بەهۆی هەلومەرجی ژینگەکەیەوە رووی داوەو هیچ پێوەندییەکی بەڕەنگی پێستەوە نییە، چونکە ڕەنگی پێست جۆرە خۆگونجاندنێکە لەگەڵ ژینگەدا لە چەندین ملیۆن ساڵەوە بۆ ئەو ئادەمیزادانە ماوەتەوە و بە دەست خۆیان نییە.

بەڕای تۆینبی، نۆردییەکان لە چوار یان لە پێنج شارستانییەتدا بەشداربوونە و ئەلبیبەکانیش لە نزیکەی حەوت شارستانییەتدا بەشداربوونە، بەلاّم ڕەگەزی ئادەمیزادی دەوروبەری دەریای ناوەڕاست لە دە شارستانییەتدا بەشدارییان کردووە، گرنگەکانیان ئەوانەی میسر و گریکە. بەو جۆرە دەبینین جنسی سپی — یان وەك نیچە پێیان دەڵێت پاڵەوانی سپی — بەشداربوونی کەمی هەبووە و یەکەم کەسیش کە ئەم ئادەمیزادە سپییەی لەسەر کورسیی مێژووی ئادەمیزاد دانابێت، ئەوە گوبینۆی ئەرۆستۆراتی فەرەنسییە " ،کە لە بەڕایی سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا ئەو کارەی کردووە. بەڕای تۆینبی ڕەگەزی ڕەش. لە دروستکردنی هیچ شارستانییەتێکدا بەشدارنەبووبێت، ئەوە بەهۆی نەبوونی پادداشت و دانەوەیە یان بەهۆی نەبوونی (بێپاکی یان نەبوونی گوێڕایەڵییەوە. قصور التحدیی والاستجابه) پەیدابووە، یان ئەوەتا کە هێشتا دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە، چونکە گەلانی ڕەشپێست هێشتا چاوەڕێی دەکەن، کە بە شێوەیەکی چاك لە دروستکردنی شارستانییەتەکانی ئایندەدا بەشداری بکەن.

## دووەم:

تۆینبی بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ شرۆڤەکردنی بیرۆکەکەی خۆی تەخت بکات، ڕای کۆمەڵێك لە فەیلەسووفانی مێژوو تاوتوێ دەکات، ڕای خۆی و ڕەتکردنەوەکانی هزری ئەوان دەنووسێ و بیروڕای خۆی دەردەبڕێ :

**١- بیرۆکەی دەوڵەت لەلای هیگڵ:**

(تۆینبی ڕەخنەی لە بیرۆکەکانی بەستنەوەی مێژوو بە بیروباوەڕی روحەوە گرت و وتی، ڕوح لە بواری مێژوودا دەردەکەوێت) و دەڵێت ئەم بیرۆکەیەی هیگڵ لەسەر قسە و قسەلۆکی ئەوە وەستاوە، کە گوایا تاکەکەس (الفرد) روحی سەربەخۆیی نییە، چونکە تاکەکەس (الفرد) بەشێکە لە کۆمەڵگە و پاشان ئەو بیرۆکەیە گەیشتە ئەوەی کە کۆمەڵگە بەڕێز و موقەددەس دابنێت و لە شێوەی دەوڵەتدا خۆی بنوێنێت (واتا

لەبەرزترین دەزگای کۆمەڵگەدا خۆی بنوێنێت ). ئەمەش بە ڕوونی و بە ئاشکرا لە کۆمەڵگەی ئەڵمانی لەسەردەمی هیتلەر و حزبە نازییەکەیدا دەرکەوت کە سەرانی ئەو حزبە لە دڵی هەموو ئەڵمانییەکدا تەقدیسی ئەڵمانیا و دەوڵەتی ئەڵمانیان دەکرد، نازییەکان لە جیاتی پەرستنی خوا، دەوڵەتی ئەڵمانیان دەپەرست یان ڕوونتر بڵێین "تنین" واتا ئەژدیهایان دەپەرست.

ئەم حاڵەتەش بێگومان هەرچەندیشە ئاگری ئەم بیرۆکەیە کەم کاتەوە، بەلاّم هێشتا هەر لێقەومانێك و بەلاّیەکی ئەخلاقییە.

خۆ ئەگەر هەق و هەقیانەتێکیش لەم بیرۆکە هەڵەیەدا هەبێت — کە بەڕای تۆینبی بیرۆکەیەکی ترسناکە — ئەوەیە کە تاکەکەس (الفرد) بوونەوەرێکی کۆمەلاّیەتییەو ناتوانێت بەتەنیا ئاواتی خۆی وەدەست بێنیّ و وەك پێویست کۆششی خۆی بە خەرج بدات، مەگەر لە چوارچێوەی دەوڵەت سەرکاری لەگەڵ کەسانی تردا هەبیّ، چونکە دەوڵەت تەنیا ئامێرێکە لەپێناو ئازادی تاکە تاکەی خەڵك و پاراستنی ویژدان و هزرو ئاسایش و ئەقڵ و موڵك و ماڵیان تێدەکۆشێت. دەوڵەت ناتوانێت بەسەر ئازادیی تاکەکەسدا زاڵ بێت یان سنووری بۆ دابنێت واتا بە پێچەوانەی بیروڕای هیگڵە.

بەڕای تۆینبی تاکەکەس مادامێکی خانەیەکە لە کۆمەڵگا ،کەواتە هەر خۆی ئەو بناغەیە، کە دەوڵەت لە پێناوی ئەو و بەختیاریی ئەو و ئەمانەتی ئەودا دامەزراوە، کۆمەڵگە تاکەکەسەکان دەپارێزێت و ئامانجی هەق و ڕەوایان وەدی دێنێت، کەواتە بوونی ڕوح لەناو مێژوودا ئەسڵی نییە تا ئەو ڕادەیەی کە دەوڵەت بەخوا بزانێت و دیکتاتۆرییەتی لیّ دروست بکات.

٢-ڕەخنەی تۆینبی لە بیروبۆچوونی ئیسکاتۆلۆجییەکان:

تۆینبی ڕەخنە لە بیرۆکەی لێکدانەوەی مێژوو دەگرێت، کە لاهوتییەکان بەرامبەر بە بۆچوونی رابردوو دایانناوە. تۆینبی لە ڕەتکردنەوەی بۆچوونی ئیسکاتۆلۆجییەکاندا " ئەو دنیاییەکاندا" کە مانای ڕوحیان لە دەرەوەی مێژوو داناوە، واتا بۆ "ئەو دنیا — الاخرە" دایانناوە. کە ئەم بۆچوونە کەوتووەتە ژێر کاریگەریی رەواقییەکان و شتی

ترەوە بریتییە لە بۆچوونێکی لاهوتی پەتی بۆ لێکدانەوەی مێژوو ، ئامانجی ژیانیش وەها دادەنێت کە تەنیا بریتی بێت لە ئامادەکردنی خەڵك بۆ پێشوازیکردنی ژیانی نەمری ڕاستەقینەی ئەو دنیا. تۆینبی — کە خۆی بە پیاوێکی دیندار بەناوبانگ بووە — دەنووسێت و دەڵێت: ئەم بۆچوونە باوەڕی مەسیحییەت لێك دەداتەوە ، سەرباری مێژوویش — بەلاّم بە لێکدانەوەی هەڵە دەزانێت و دەڵێت: ئەگەر ژیان هەندە بێ قیمەت و بێ بەهایە کە حەقیقەت بەهیچ بزانێت تەنیا لەوە دنیادا نەبێت، مەسیح خۆی نەدەکردە قوربانی لە پێناوی رزگارکردنی خەڵك لەم دنیای نەمانەدا، هەق وایە کە بمبێنێت و مێژووی ژیانی بنووسرێتەوەو بەبێ پشتگوێخستن و دواخستن، بلاّوبکرێتەوە. ئینجا دەڵێت: ئیسکاتۆلۆجییەکان بیروباوەڕی ئایینیان خستەبەر هێرشی عەلمانییەکان لەو کاتەوەی کە لە توێژینەوەی دروستکردنی ئادەمیزاد لە مێژووە، بایاندایەوە بۆ توێژینەوەی پلانی خوا لە دروستکردنی ئادەمیزاددا، ڕوح لە دەرەوەی مێژوو دانانرێت بەرادەیەکی ئەوتۆ کە کۆششی شارستانییەتی مرۆڤ بە گاڵتە بزانرێت، مادامێکی سەرەتاترین مرۆڤ و بێ بەختترین گەل بتوانێت بەبێ کۆششی شارستانییەت و ماندووبوونی دنیایی هزری رزگاری لە پێناوی بەختیاریی ئەودنیادا وەدی بهێنێت. (واتا بەپێی ئەم بۆچوونە کۆمەڵگەیەکی خاوەن شارستانییەت و کۆمەڵگەیەکی بەشدارنەبوو، هیچ جیاوازییان نییە).

٣-تۆینبی بیرۆکەی رێکەوت (المصادفه) رەتدەکاتەوە:

پێش ئێستا باسی بیرۆکەی رێکەوتمان لە مێژوودا خستە بەرچاو. تۆینبی لەبەر ئەوە ڕەخنەی لێ دەگرێت، چونکە ئەم بیرۆکەیە لەبەهای کارو ویستی ئادەمیزاد کەم دەکاتەوە. تۆینبی ڕای وایە کە کاری ئادەمیزاد وەك ئەوە نییە کە بەرۆژ دەیرێسێت و بەشەو هەڵی دەوەشێنێتەوە. خۆ مێژوو ئاشی شێتان نییە بەبێ ئامانج و تەنیا بۆ ماندووبوون هەڵیسوورێنن، رەورەوەی مێژوو، ئەو ئامێرە شەیتانییە نییە، کە خەڵکی تووشی ئازارێکی بەردەوام کردبێ، بەڵکو لە مێژوودا ئاوازێکی بنەڕەتی هەیە لە

بێباکی و گوێڕایەلیدا دەردەکەوێت، لە کشانەوە و تێهەڵچوونەوەدا بەدیاردەکەوێت لە نسکۆ و ڕاپەڕیندا بەرچاو دەکەوێت و لە کەرتبوون و یەکگرتنەوەدا خۆی دەنوێنێت.

٤-ڕەتکردنەوەی حەتمییەت لەلایەن تۆینبییەوە:

لێکۆڵەری مێژوو وا دەزانێ ئەوەی ڕێکەوت ڕەتدەکاتەوە بڕوای بە حەتمییەت (determinism) هەیە. مەزەبێکی زۆری مێژوو بڕوایان بە حەتمییەت هەبووە بە نموونە، بیرۆکەی گۆڕان و پەرەسەندن، کە لە بواری مێژوودا بەبیرۆکەی پێشکەوتن "کە باس کرا" ناونراوە، بەپێی راوبۆچوونی جۆراوجۆر. وەڵی تۆینبی کە بیرۆکەی ڕێکەوتی ڕەتکردەوە. بیرۆکەی حەتمییەتیشی ڕەتکردەوە. بیرۆکەی حەتمییەت — وادیارە — پابەندی بیرۆکەی (لێکدانەوەی ئابووری) بێت، کە مارکس پیرۆی دەکات و هەروەهاش پابەندی بیرۆکەی "بەدوای یەکدا هاتنی خولبەخولی شارستانییەتەکان"ی هەریەکە لە ئیبن خەلدون و ڤیکۆ و پاشانیش شپینگلەرە. تۆینبی لە بزووتنی مێژوودا سووڕانەوەیەکی یەك هەوا نابینێت وەك سووڕانەوەی ڕەوڕەوە و دەڵێت: ئەگەر بزووتنی گەردوون شەو و ڕۆژ و هەر چوار وەرزەکەی لێ پەیدابیێت، ئەوە بەپێی قانوون و ڕێسایەکی گەردوونیی سروشتی پەیدادەبێت.خۆ ئەگەر دووبارەبوونەوەیەکیش لە بزووتنی ئەو هێزانەدا هەبێت، کە شاڵی مێژووی ئادەمیزاد دەچنێت، ئەوەش مانای ئەوە نییە، کە ئەو دووبارەبوونەوەیە لەسەر یەك هەواو بەیەك جۆر دەڕوات، خۆ ئەوە وەك سووڕانەوەی مەکۆی هەلاج نییە، بۆ پاش و بۆ پێش لە ئامێرەکەدا بێت و بچێت.

بەلاّم ئایا ئەوە مانای ئەوەیە کە شارستانییەتی ڕۆژئاوا دەتوانێت خۆی لە مەرگی حەتمی بپارێزێت، ئەو مەرگەی کە شارستانییەتی رابردووی گرتەوە؟

یان ئایا ڕووخانی شارستانییەتی ڕۆژئاواش حەتمییە ؟

بەڕای تۆینبی مردنی پازدە شارستانییەتی ڕابردوو لە ئەسڵی بیستویەك شارستانییەت هەروا بە قەزاو قەدەرنەبووە، بەڵکو خۆکوشتن بووە، هەر ئەم خۆکوشتنەشە کە تووشی شارستانییەتی ڕۆژئاوا دەبێت ئەگەر جەنگێکی تازەی سێیەم لە جیهاندا ڕوویدات. خۆ ئەگەر بزووتنەوەی مێژوو وەکو بزووتنەوەی ڕەوڕەوەیەکی

خولاو نەبێت، ئەوا لە عەرەبانەیەك دەچێت بەسەر چیایەكدا سەركەوێت و سەركەوتنەكەشی پێویستی بە بزووتنەوەی ڕەوڕەوەكانی دەبێت. خۆ ئەگەر سەركەوتنەكەش، پێشكەوتن بێت، ئەوەش نابەخشێت كە لایەنی ماددییەكەی سەردەكەوێت و لایەنی ڕوحییەكەی بەجێ دەمێنێت. ئەوروپایی ئاستی عەقڵی و تەكنەلۆژیی هەرچەندە دەبێت، بابێت، بەڵام نەیتوانیوە خراپە و شەڕەنگێزیی خۆی لە كۆڵ خۆی بكاتەوە.

ئەوروپایی توانیویەتی لە ڕێگەی ئامێری نامرۆڤانەوە مل بە سروشت و بۆشایی ئاسمان كەچ بكات، بەڵام نەیتوانیوە لە مەیدانی مرۆڤایەتیدا، واتا لە بواری پێوەندی و سەروكاری لەگەڵ ئادەمیزادی برای خۆیدا زۆر پێش بكەوێت.

## بەرهەڵستی و وەڵامدانەوە – التحدی والاستجابە - Challenge and Respon

### شارستانییەتەكان چی پێك دێنن؟ (چی دروست دەكەن؟):

تۆینبی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە ودەڵێت: كاتێ باسی پرەنسیپی چاكی پێكهێنانی شارستانییەتمان كرد، زاراوەی مەدرەسەی "كلاسیكی" مان بەكارهێنا كە تایبەتە بە زانستی نوێی سروشت و لە سنووری زاراوەگەلی پەتیدا بیرمان دەكردەوە و كاریگەریی هێزە مەبیوەكانمان تاقی دەكردەوە، كە بریتی بوون لە ڕەگەزی یان ڕەگی ڕەس (Race) و ژینگە. پاشان رایدەگەیەنێت، كە ئەو هەوڵ و كۆششانەی بێهوودەبوون و سەریان نەگرتووە و بەدەستی بەتاڵ گەڕاوەتەوە. پاشان بۆ كاریگەر و پرەنسیپی تری زۆر گەڕاوە بۆ ئەوەی بیرۆكەكەی خۆی لەسەر دابمەزرێنێت. پاشان ڕایگەیاند، وتی: ئەو كاریگەر و پرەنسیپەی كە ئێمە بە دوایدا وێڵین و دەگەڕێین شتێكی سانا و ساكار نییە، بەڵكو ئاوێتەیە. وەلێ، تۆینبی كە بیرۆكەی (ڕەگ) بە

بناغەی بەرپابوونی شارستانییەت رەتدەکاتەوە- وەك باسمان کرد — کەواتە تۆینبی هەر ئەوە ماوە، کە بڵێت ئایا ژینگە تا چ ڕادەیەك کاریگەری لەسەر بەرپابوون و پەیدابوونی شارستانییەت دەکات- بەڕاستیش بەستنەوەی ژینگە بە خەسڵەتی ئاوەز و عەقڵی ئادەمیزادەوە، بیرۆکەیەکی کۆنە و لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە پەیدابووە، وەلێ تۆینبی ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە بەستنەوەی ژینگە بە خەسڵەتی عەقڵەوە شتێکی حەتمی بێت. ئەوانەش کە بەشێوەی جوگرافی لێکیدەدەنەوە وا دەزانن مەسەلەکە یەکلاکراوەتەوە و تەواو بووە٢٥٥. تۆینبی ئینجا رایدەگەیەنێت ودەڵێت: هەرچەندە بیرۆکەی ژینگە لە بیرۆکەی — رەگ — کاریگەرتر و بەکێشترە، بەلاَم لەژێر تاقیکردنەوەدا بەرگە ناگرێت و دەڕووخێت و بەختی لەوەش چاکتر نابێت.

ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە مێژوونووسێك و بیرمەندێکی گەورەی وەکو تۆینبی بتوانێت نکوڵی لە ڕۆڵی ژینگەی جوگرافی بکات، وەلێ تەنیا ژینگە بە کاریگەر دانانێت، بگرە جاروبار بە کاریگەری یەکەمیش لە پەیدابوونی شارستانییەتی حیسابی ناکات. جا بۆ ئەوەی کە تێی بگەین. هاوکێشەیەك دادەنێت. هەردوو تای هاوکێشەکە

---

٢٥٥ _ لە وێنەی مونتسکیۆ (Montesquieu)ی فەرەنسی (١٦٨٩– ١٧٥٥) کە لە کتێبەکەیدا (گیانی قانوونەکان) باسی پێوەندی نێوان ئاووهەواو سەرهەڵدانی شارستانییەتی کردووە، هەروا (باکل) ی ئینگلیزیش. بەلاَم بۆدان Bodin backle لە سەدەی شازدەهەمدا لەبارەی پێوەندی نێوان جوگرافیا و رەفتار و زیرەکی نووسیوە. فریدریك راتزل (Ratzel)یش کاریگەری ژینگەی لە شارستانییەتەکان بە تایبەتی ژینگەکانە و کەناراوانەی کە پێشکەوتووترین شارستانەتیان لێ دامەزراوە باس کردووە. بەلاَم (هەنتیگتون Huntigton) ١٨٧٦– ١٩٤٧ کە زانایەکی ئەمەریکییە لای وایە چەندیی باران بارین چارەنووسی نەتەوە و شارستانەتییەکان دیاری دەکات، لەبارەی رای ئەو نووسەرانە سەیری کتێبە بەناوبانگەکەی (ویل دیورانت) بکە. هەروەها د. نوری جعفر: التاریخ مجاله و فلسفته، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٥، ل٥٠– ٧١.

یەکسان دەکات، لە یەکێکیاندا (ویست و ئارەزووی بەهێز و توانستی لە بنەهاتووی ئادەمیزاد دادەنێت و لە تاکەکەی تریدا یادداشتی هەرێمە زەحمەتەکان دادەنێت. شارستانییەتیش ئەنجامی کارلێکی نێوان هەردووکیانە.

ژینگەیەك شارستانییەتی تێدا هەڵبگۆزرێت، ئەوە ژینگەی ئاسان نییە، بەڵکو ژینگەیەکی زەحمەتە" بێدەنگیش دوژمنی باوەکوشتەی شارستانییەتە. تەنیا تەنگانە هیممەت و غیرەت دەبزوێنێت.

ئەو ژینگەیەش کە شارستانییەتی تێدا دروست دەبێت، هەمووی وەك یەك نییە و جیاوازن، لەوانەیە ژینگەکە، ژینگەیەکی نیشتەنی (رسوبیە) بێت وەکو ژینگەی عێراق و میسر و دۆڵی رووباری سەند، لەوانەشە ژینگەکە بانێکی (هضبة) بەرزبێت، وەك نیشتیمانی شارستانییەتەکانی حیتی و بیزەنتی "وەك بانەکەی ئەنەدۆل" و مەکسیك. لەوانەشە ژینگەیەك بێت لە کۆمەڵێ دوورگە وەك هەردوو شارستانییەتەکەی گریك .

تۆینبی رای وایە، ئەو ژینگەیەی شارستانییەتی تێدا هەڵدەگوزرێت ئەوە ژینگەیەکی سەخت و زەحمەتە و ئاسان نییە شارستانییەتی دروست و تەواو قەت و قەت شارستانییەتەکانی پاڵدانەوەو بێ دەنگی (ستاتیکی) نەبووە، بێدەنگی و سەرکزی دوژمنی گەورەی شارستانییەتییە ، خەڵك چار نییە دەبێ بەردەوام کۆشش بکەن و ماندووبن تا ئەوەی کە کۆیان کردووەتەوە لە غەزەبی سروشت و هێرشی بەرپەرچی سروشت بیپارێزن و خەسارنەبێت.

کەواتە، هێشتا هۆکارێك هەیە، بەڵام بە تەواوەتی دیارنەکراوە چییە و چی نییە، دەبێـتە هۆی هەڵگوزرانی شارستانییەتە ، ئەو هۆکارەش، نە ئابوورییەو، نە ژنیگەییە و نە ڕەگ دۆستی. شارستانییەت هەروا لە خۆیەوە ناگۆڕێت و دروست نابێت، تۆینبی دوای لێکۆڵینەوەیەکی ئاودامان کە چەندین ساڵ درێژەی کێشا، گەیشتە بیرۆکەیەك دەڵێت: ئادەمیزاد کە شارستانییەتی وەدی هێناوە لە هەڵوێستی زەحمەت بێباك و بێمنەت بووە، ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیەش دنەی داوە، کە کۆشش بکات، لەوە پێش

مەجبوو نەبوو ئەو کۆششە بەخەرج بدات، ئەگەر ئەو بێباکی و بێمنەتییەی نەبوایە. باشترین نموونەش شارستانییەتی میسر و پێکهێنانی شارستانییەتی میسرە کە تۆینبی بە نموونە بۆ ئەو لێکۆڵینەوەیەی خۆی دەیهێنێتەوە.

بەرامبەر ئەو وشکی و بێ ئاویەی کە بەرە بەرە بەهۆی بادانەوەی باران بەرەو باکوور، لە جیهاندا پەیدابوو، (باران لە ئەفەریقاوە بایدایەوە بۆ ئەوروپا) دانیشتوانی راوچیی بانی لیبیا کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەم گۆڕانەوە، پێویستی کرد یەك لەم دوو شتەی خوارەوە هەڵبژێرن:

(١)خۆیان و ئیشی راوچێتییەکەیان بچن بەرەو باکوور یان بەرەو باشوور و چۆنیان گوزەران دەکرد هەروا گوزەران بکەن، ئاوو باران و ڕاوەکەیان بمێنێ.

(٢)یان ئەوەتا لە جێگە ئەسڵییەکانی خۆیان بمێننەوە، کە گۆڕاوەو بووەتە وشکانی و قاتوقڕ و بەو ژینە کوڵەمەرگییە تازەیە قانیع بن و هیچ بێباکی و بێمنەتییەك نەنوێنن و بەبێ پەیدابوونی شارستانییەت هەر وەکو خەڵکی بیابانەکان قانیع بن، بەڵام هەندێ کۆمەڵی خەڵکی ئەو بانە، بێ باکانە بەرامبەر بە دژی وشکەڵاتنی نیشتیمانە ئەسڵییەکەی خۆیان وەستان و جێگا و ژیانی خۆیان گۆڕی.

ئەم کاردانەوەیەش، هەر ئەو کار و وزە دوو قاتە دەگمەنەیە ، کە شارستانییەتی میسری هێنایە گۆڕێ و گووڕاندی. ئەم شارستانییەتەی لەناو گۆمەڵگەیەکی ساکارو سەرەتایی وەهادا دروست کرد، هەموویان لە لەوەڕگاکانی ئەفریقادا دەژیان، کە لە ژێر کاریگەریی وشکەڵاتنی گۆڕانی ئاڕاستەی بای سەرزەمیندا بەرەو مردن و نەمان دەچوون. گۆڕینی جۆری ژیانی کۆمەلانی خولقێنەر لەوەدا دەردەکەوێت، کە بە گشتی لە کۆکردنەوەی خۆراك و راوەماسییەوە هەموویان بوون بە زەرعەتکار. بێگومان ئەمەش گۆڕانێکی گەورەیە ئەگەر بێتو بەراوردێك لە نێوان ئەو لەوەڕگایانەی کە ئەو راوچییانە لەبەر وشکەڵاتن بە جێیان هێشتووە و لە نێوان ئەو ژینگە پڕ لە دووبارە تازەیەدا، بکەین.

دۆڵی نیلی نزیك كه ئێستا سعێد "صعید" ی پێ دەڵێن كاتێ كه باوباپیرانی میسرییەكان لێی دا سوكنابوون"استقرار"، لەگەڵ ئەوە ئێستادا بە تەواوەتی جیاوازە، واتا ئەوەی ئێستا وەك ئەوەی ئەو كات نییە، ئەو كات بارانی زۆری لێ دەباری و دەشتاییەكەی بەردەمی نیل ببوو بە گۆلاو و زەلكاو و پڕبوون لە ئاو، پێشەنگەكانی شارستانییەتی میسر توانییان ئەو سروشتە بەش بەشە بخەنە ژێر ویست و ئارەزووی خۆیان و زەلكاو و دەریاچەكانی پڕ لە گژوگیای دەلتای نیل بزربوون و نەمان و كۆمەڵێ جۆگە و جۆبار و كێلگەی رێك و پێك جێگەیانی گرتەوە، بەهۆی ئەو كۆششەی كە كردیان ئەو گوێڕایەڵییەی، كە لە دژی بێمنەتی و بێباكیی ژینگەكە كردیان.

لەبەر ئەوە تۆینبی دەڵێت: ئەگەر ڕاست بوایە كە چەمی نیل مایەی شارستانییەتی میسرە، ئەوا پێویست وابوو شارستانییەتەكان لە هەموو ژینگەیەكی هاوشێوەی ژینگەی میسردا پەیدابوونایە، خۆ ئەگەر شارستانییەتی ولاّتی دیجلە و فوراتیش لەسەر ئەوە مكووڕ بێت، كە خۆی جێگای پەیدابوونی بالاّترین و ڕەسەنترین شارستانییەتی ئادەمیزادە، كە شارستانییەتی سۆمەرە، كەواتا دروست نەبوونی شارستانییەت لە دۆڵی ئوردون، ئەوە بە درۆدەخاتەوە. هەر بەو جۆرەش دۆڵی ڕووباری (ریۆگراند) و چەمی (كلۆرادۆ) لە ئەمریكای باكوور. زێتر. لەوەش دەبینین، كە شارستانییەتی — ئەندیانی — لە هەردوو ئەمەریكا، بەسەر بەرزایی و بانەكانەوە پەیدابوون و دانەبەزیونەتە پادەشتەكان. لێرەدا ڕێگا بە خۆمان دەدەین بپرسین: ئایا بەرزایی و بانەكان هەمیشە شارستانییەتی گەلی وەك شارستانییەتی ئەندیانی دەخولقێنن؟ بنۆرە بەرزایی و بانەكانی رۆژهەلاّت و ڕۆژئاوای ئەفریقیا، كە بە ژینگە و بە ئاووهەوا وەك ئەوەی ئەندیانی وانە، هیچ شارستانییەتی وەك ئەوەی ئەندیانی دروست نەكردووە.

تۆینبی پاشان نموونەگەلێك بۆ بەهێزكردنی بیرۆكەكەی دێنێتەوە و دەڵێت: شارستانییەتی چین لەسەر كەناری ڕووباری زەرد (هوانهو)هەڵقولاّ كە ئاوەكەی لە هیچ

وەرزێکدا بە کەڵکی هاتوچۆی سەر رووبار نەدەهات و توانەوەی بەفر لە بەهاراندا، لافاوی کاولکار دروست دەکات و بە شێوەیەکی بەردەوامیش ڕێگای ئاوەکە دەگۆڕێت و ڕێڕەوە کۆنەکانی دەبن بە دەریاچە و زۆنگی پڕ لە گژوگیا. هەروەها شارستانییەتی لەسەر کەنارەکانی رووباری "یانگستی"یش هەڵنەگوزرا، کە لە هەموو وەرزەکاندا بە کەڵکی هاتوچۆی سەر رووبار دێت و لافاوەکانیشی بەقەدەر لافاوەکانی رووباری زەرد دووبارە نابێتەوە و وەرزی زستانیش لە رووباری یانگستیدا کەمتر بە تەوژمە. هەروەها دۆڵی ڕووباری دانۆب کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپاوە و، لە سروشتدا هەروەکو دۆڵی ڕووباری زەرد، (هوانهۆ) وایە، واتا ئاووهەوا و خاك و دەشت و چیایان وەك یەك وایە. بەلاّم نەیتوانی شارستانییەت دروست بکات.

## هەر تەنگانەیە ئادەمیزادی بەهێز و خوڵقێنەری شارستانییەت دێنێتە مەیدان

### گریك:

دانیشتوانی گریکیش، واتا گریك خۆیان لە دژی بێباکیی هەژاریی ولاّتەکەیان گوێڕایەڵییان پەیداکرد و کەوتنە کۆشش و شتی تازەبابەتیان داهێنا، بۆیان بووە زانست کە بریتییە لە چاندنی زەیتوون و هەڵدڕینی ناو زگی زەوی. ئەسینییەکان بوون بە بازرگان و بە هەموو دنیادا گەڕان و داهاتی خۆیان بە گەنم ئاڵوگۆڕ دەکرد (وەك بەقاڵییەکەی کوردەواریی خۆمان) لەو ماندووبوونەش شارستانییەتی هێلینی چ بە هزرو چ بە هونەر و چ بە سیاسەت و چ لە رووی قانونییەوە پەیدابوو، تا وای لێهات ئەسینای هەژار بووە مامۆستای هەموو ولاّتی یۆنان و پاشان بووە مامۆستای جیهانی تازەی ئەورووپا.

تۆینبی دەڵێت: لە سوریەی کۆن شارستانییەت لە جێگە بەپیتەکانیدا نەخەملّیوە، بەڵکو لە جێگە رووتەینەکانیدا یان لە نیمچە رووتەینەکانیدا خەملّیوە.

بازرگانانی سوریە کە زۆرتر دانیشتوانی چیاکانی لوبنانن، ئەوان بە درێژایی دەریای ناوەڕاست شانیان پێوەناوە و نیشتیمانی دووەمیان بۆ خۆیان دروست کردووە

ڕەوشتی تایبەتی خۆیان لەسەر کەنارەکانی ئەفریقیا و ئیسپانیا دەردەبڕێت، کە شاری قرتاجنە تونسی ئێشتا لە ڕێگای دەریاوە ئەو شارە جیهانیەی نیشتیمانی فینقییە کە هەموومان دەیزانین.

ئوسکوتلاندی (شاخاوی) گەورە پیاوانی بەریتانیای مەزنی لە سیاسەت و ڕۆشنبیری و ئابووریدا هێنایە کایەوە. ئوسکوتلەندییەکان هەتا ئێستاش دەسهاتێکی گەورەیان لە مەرکەز و مۆڵگە بەرپرسەکانی حکومەت و کۆمپانیاکانی بەریتانیاوە بە دەست هێناوە.

لە یابانی هەژار شارستانییەت چ کۆن چ تازە هەر خەملیوە و گەشەی کردووە، کەچی لە ولاتی دەولەمەندی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیادا نەخەملیوەکە دەرامەتێکی زۆر و دەولەمەندی هەیە. هەروەها باکووری هەژاری چین لە باشووری بە پیتی چین پێشکەوتووترە.

هەلومەرجی تەنگانە و زەحمەت نەك هەلومەرجی ئاسان، هەر ئەوەیە کە دنەی ئادەمیزاد بەرەو شارستانییەت دەدات و خۆشگوزەرانی و بەختیاریی ژیان ڕێگا لە پەیدابوونی شارستانییەت دەگرێت، چونکە تەنیا ڕۆژەرەشی تەنگانە غیرەت و هیممەت دەنێتە بەر ئادەمیزاد، کە لە هەلومەرجی گران و زەحمەتدا خۆی دەنوێنێت چ لە ژینگەی سروشتی چ لە ژینگەی مرۆڤایەتیدا ژینگەی گران و ناهەموار گالی ئادەمیزاد دەدات، کە نیشتیمانی خۆی بگۆڕێت یان ژینگەکەی چاك بکات، چونکە خاکی زەحمەت و نیشتیمانی تازە بێمنەتی و بێباکی پێك دەهێنن. هێزی داهێنان و ڕەنێوهانین لە مرۆڤدا دەورووژێنن.

بەلام ئەوانەی کە نەیانویستووە نیشتیمان و نیشینگەی خۆیان بگۆڕن یان شێوازی ژیانی خۆیان ڕاست بکەنەوە، ئەوانە لە سزای لەناوچوون و مەرگ بەولاوە هیچ چارێکی تریان نییە، چونکە نەیانتوانیوە بەرامبەر بێباکیی وشکەلاتن گوێڕایەلی خەبات بکەن، چونکە ئەم لەناوچوون و مردنە وەك لەعنەتی مێژوو وەهایە لەو کەسانەی کە گوێڕایەلییان لە دژی بێباکی و بێمنەتیی کارەسات نەکردووە.

بێباکی و بێمنەتی لەناو ئادەمیزاددا لە دەستدرێژیی دەرەکیدا لە دەوڵەتێکی دراوسێوە، یان لە کۆمەڵێکی ئادەمیزادەوە، دیاری دەدات، یان هەڕەشەیەکی بەردەوامە، بەشێوەی هێزێکی فشار لەسەر کۆمەڵگەوەیە.

بە نموونە کاتێ شارستانییەتی هێلینی، بەر لە ئیسلام وڵاتی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی داگیرکرد، دوای پەیدابوونی ئیسلام لادراو شارستانییەتی عەرەبی — ئیسلامی جێگای گرتەوە و پاشان دەوڵەتی رۆمانی ڕۆژهەلاتیشی لە سوریە و میسر لەناوبرد.

بێمنەتی و بێباکی لە دەستدرێژی کە لە داگیرکاری و هەڕەشەی دەرەکیدا خۆی دەنوێنێت، نابێتە تەنیا هۆی گوێڕایەڵی بۆ دەرکردنی داگیرکاران یان بۆ رزگاربوون لە هێزی فشاری سەرسنوور، بەڵکو ڕەنگە بەوەشەوە نەوەستێت، بکەوێتە تۆڵەسەندنەوە، ئەمەش هەمیشە بە هەق سەندنەوە دانانرێت، بەڵکو دەتوانین بە ڕێگەیەکی سایکۆلۆژیانە یان بە خۆهەڵکێشان و داپۆشینی عەیبە و کەموکورتی چ لە ئاستی تاکەکەس چ ئاستی دەستەجەمعی دابینێین، چونکە جاری وەها دەبێت کەمئەندامێتی غیرەت و هیممەتی پیاوی خاوەن ئیرادە دەبزوێنێت و وەهایان لێ دەکات لە بواری کەمئەندامێتییەکەیاندا سەربکەون و دانەمێنن، بە نموونە جاری وەها دەبێت کەسێکی کوێر کە ناتوانێت شەڕ بکات دەبێت بە شاعیرێکی گەورە، سەربازەکان وەك سروودی حەماسی دەیڵێن و دەیڵێنەوە.

وەك ئەوەی کە لە هۆمیرۆس(homer)ی کوێر رووی دا. هۆمیرۆس شاعیرێکی گریکە، بەیت و باڵۆرەی جەنگی بەناوبانگی گریك هۆمیرۆس دایناوە.

شیعرەکانی هۆمیرۆس لە (ئەلیادە و ئۆدێسە) دا پێگە و جێگەیەکی بەرزیان لە ئەدەبی جیهانیدا داگیرکردووە.

ئەوەتا، تەیموور لەنگ کە پیاو هەر لە ناوەکەی ترسی لێ دەنیشت و دەتۆقێ، پیاوێکی شەل بوو، نەیدەتوانی ژیانی خۆی بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان بباتە سەر، بەڵام بووە داگیرکار و کاولکارێکی ترسناك، هەروەها هەندێ کۆیلەی وەك ئەپتیکۆس. ئەپیتکۆس، ئەویش کۆیلەیەکی شەل بوو، مندالەکانی بنەماڵە ڕوحانییە بالاکانی

فێری فەلسەفەکەی خۆی دەکرد، بەلاّم خۆی بەتەنیا گوێی بۆ غیرەتی خۆی راهێشت و کەوتە بێمنەتی و بێباکی و لەخۆبوردن. لەسەر ئاستی دەستەجەمهیش دەولّەتی ڕۆمان بە نموونە دێنینەوە، دەولّەتی ڕۆمان لە سەردەمی قوستەنتینەوە بڕوای بەئاییینێك هێنا. مژدەهێنانی ئەو ئایینە، بە بۆچوونی رۆمان هەموویان کۆیلەبوون ڕووباری — المعاصی- و لە سوریە یان ڕووباری ئوردون ئاوەکانیان لە ڕووباری — تیبە و لە رۆما کۆتایی دەهات، واتا ئاوی ئەو دوو ڕووبارە دەرژایە ناو رووباری تیبە لە نێو سنووری ئیمپراتۆرییەتی رۆما بەڕای رۆمان گەلی زالّ (واتا ڕۆمان) ئیمانی بە ئایینی گەلی بەزیوو (واتا گەلی سوری — فەلّەستینی) هێناوە.

## پلەکانی بەرهەلّستی (لێی راستبوونەوە):

تۆینبی دەپرسێت: بەلاّم ئایا هەموو بێمنەتییەك گوێڕایەلّییەکی سەرکەوتوو دەورووژێنێت (پەیدادەکات)؟ یان ئەگەر ئێمە توندیی بێمنەتی تا پلەیەکی بێ پایان زیادبکەین. ئایا گوێڕایەلّی و دنەدانیش پلەیەکی بێ کۆتایی زیاد دەکات؟ یان ئایا زیادکردنی گوێڕایەلّی تا پلەیەکی بێ کۆتایی گوێڕایەلّییەکی سەرکەوتوو، پەیدا دەکات؟ تۆینبی خۆی وەلاّم دەداتەوەو دەلّێت:" پێوەندیی گوێڕایەلّی لەگەلّ بێمنەتی، یەك لەم سێ شێوەیەی خوارەوە بەخۆیەوە دەبینێت:

١-ئەگەر بێمنەتی کەمی کرد، ئەوا لە لایەکی تر بە تەنگەوە نابێت. واتا گوێڕایەلّییەکی سەرکەوتوو لەلای وەرگری بێمنەتییەکە دەرناکەوێت.

٢- بێمنەتییەك ئەگەر زۆر توند و بەهێزبێت، ئەوا ڕوحی لایەکتر دەڕووخێنێت و توانستی گوێڕایەلّییەکی سەرکەوتوو لێ دەبڕێت.

٣- بەلاّم ئەگەر بێمنەتی بگاتە پلەیەکی ئاسایی مامناوەندی و وزە داهێنەرەکانی ورووژاند، ئەوە "گەورەترین جۆری بێمنەتی کە گوێڕایەلّیی لێ بکەوێتەوە، ئەوە ئەو بێمنەتییەیە،کە دەکەوێتە ناوەڕاستی کەمهێزترین بێمنەتی و زۆر هێزیی

بێمنەتییەکەوە" گوێڕایەڵیی سەرکەوتوو تەنیا لێرەدا دەردەکەوێت، کە تۆینبی ناوی ناوە:" مامناوەندی زێرین" بۆ پەیدابوونی شارستانییەت.

گوێڕایەڵی نابێت هەر لە خۆیەوە سەرکەوتووبێت، بەڵکو دەبێت بێمنەتیی تازەش بورووژێنێت و گوێڕایەڵیی تازەی سەرکەوتووشی بەدوابێت. ئیدی بەم جۆرە گەشەسەندن تەکامول دەکات و لەوەدیهێنانی مەبەستێکەوە ململانێیەکی تازەی لێ پەیدا دەبێت و لە چارەسەرکردنی کێشەیەکەوە دەچێتە رووبەڕووبوونەوەکی نوێ و لە هێوریيەکی رەفتەنییەوە دەچێتە بزووتنەوەیەکی بەردەوام، ئیدی بەم شێوەیە.

ئەم گوێڕایەڵییە سەرکەوتووەش، بێمنەتییەك پەیدادەکات ناچاری دەکات بچێتە ناو قۆناغێکی ململانێ، کە کۆمەڵگە لە حاڵەتی "ین – Yin" واتا کپی دەگوازێتەوە (دەبات) بۆ حاڵەتی "یانگ – yang" واتا دووبارە بۆ حاڵەتی هێزێکی پاڵنەر، تا کار و کاردانەوەی (الفعل و رد الفعل) هەردووکیان دەبنە ترپەیەکی (ایقاع) رێك و پێك، هەردوو لایەکە ناچار دەکات هەر یەکە و تای تەرازووی خۆی قورستر بکات و لە حاڵەتی هاوسەنگیدا نەوەستێت.

هەر بە وێنەی شپینگلەر، تۆینبیش رای وایە کە بێباکیی شارستانییەتی گریك (هێلینی) لە کۆمەڵگەی سووری (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لەبارەی داگیرکارییەکەی ئیسکەندەرو پاشان هاتنی ڕۆمان، وای لەم کۆمەڵگەیە کرد – کاتێك کە بووە لانکی مەسیحییەت – پاڵ بە دەوڵەتی ڕۆمانەوە بنێت بڕوا بەو ئایینە بێنێت. کاتێکیش ولاتی رۆژهەلات گەڕایەوە سەر ئایینی مەسیحییەتی رۆما، مەزەبەکەی جیاواز بوو لە مەزەبی دەوڵەت و کەنیسەکەشی کە شێوازی دەرەبەگی ئەورووپای لە خۆگرتبوو جیاوازبوو، جا ئەم بێباکییەی ڕۆژهەڵات بووە هۆی ئەوەی کە گوێڕایەڵی لەلایەن دەوڵەتی ڕۆمانەوە بەدیارکەوێت، کە لە ئازاردانی نەستوورییەکانی شام و عێراق و قیبتییەکانی میسردا خۆی دەنواند، واتا لە ئازاردانی ئەو ڕۆژهەڵاتیانەدا بڕوایان بە مەسیح هێنابوو.

پاشان ئەم بێمنەتییە دوای هەزار ساڵ لە داگیرکارییەکەی ئەسکەندەر (یەکەم بێمنەتیی گریك) بووە هۆی گوێڕایەڵییەکی سەرکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتداو لە بەرپابوونی ئیسلامیەتیدا خۆی نواند.

داگیرکاریی ئەسکەندەر کوتەکێکی پشتسکێن بوو لە ڕۆژهەڵات درا و هەروەها بێمنەتییەکی بەهێزیش بوو، گوێڕایەڵیی بەدواداهات، ئینجا بێمنەتی دیسان گوێڕایەڵیی پاشان دوایین گوێڕایەڵیدا. محەمەد پێغەمبەر(د.خ) لە دوورگەی عەرەب دەرکەوت. بە دەرکەوتنی ئەویش ئیسلامەکان بۆ گەڕاندنەوەی شانازیی وشکبووی ڕۆژهەڵات بەرەو پێشچوون و بە سەرکەوتنی ئیسلامەکانیش وڵاتی خۆرهەڵات کەسایەتیی خۆی وەدەستهێنایەوە کە سەدەها ساڵ بوو، ڕۆشنبیریی هیلینی ناوی بزر کردبوو، ئیدی شارەکانی ئیسلام بوونە مەرکەزگەلی شارستانییەتێکی خەملیو و گەشە سەندوو.

## شارستانییەتەکان بۆچی دەڕووخێن؟

چەند ڕاوبۆچوونێك لەسەر ڕووخان. ڕووخانی شارستانییەتەکان مانای چی دەگەیەنێت؟ بۆچی کۆمەڵگەکان نەیانتوانی گوێڕایەڵیی سەرکەوتوو، دەرهەق بەو بێمنەتیانە بنوێنن کە تووشیان بووە؟

چەندین فەیلەسووفی مێژوو، وەڵامی ئەم پرسیارە ترسناکەیان داوەتەوە. هەندێکیان چارەنووسی ئادەمیزادیان بە چارەنووسی گەردوونەوە بەستووەتەوە و ئادەمیزادیان کردووە بە گەردوونێکی بچکۆڵە. دەڵێن شەو و ڕۆژ هەر چوار وەرزەکە، چۆن چۆنی بە دوای یەکتریدا دێن، ئاوەهاش شارستانییەتەکان بە دوای یەکتریدا دێن. چۆن چۆنی ململانێی دژبەیەکەکان پەیدادەبن. ئاوەهاش ململانێی نێوان کۆمەڵگەکان پەیدادەبن. چۆن چۆنی وزەی گەردوون بەکاردەبرێت، ئاوەهاش وزەی شارستانیەتەکان بەکاردەبرێت، چۆن چۆنی خولی گەورەی گەردوون جیهان پیر دەکات، ئاوەهاش خولی گەورەی شارستانیەتەکان زیاد دەکات.

ئەوەشمان دیت کە چۆن چۆنی شپینگلەر بە شێوەیەکی بایۆلۆژیانە مەسەلەی کەوتن و ڕووخانی لێك دایەوە، کە خۆی بەو جۆرە لێکدانەوانە بەناوبانگە، ئەوەبوو گوتی: کۆمەڵگەکان وەکو بوونەوەری زیندوو وان و لێك دەچن. ئادەمیزاد بە قۆناغی کۆرپەیی و منداڵی و هەرزەکاری و پیری و مردندندا دەڕوات: هەروەهاش کۆمەڵگەکان، وەلێ تۆینبی ڕەتدەداتەوە دەڵێت: قانوونەکانی زانستی زیندەوەران تاکە تاکەی خەڵك و بوونەوەرەکانیشی بۆی ملکەچن و بڕوایان پێی هەیە، بەڵام ئەمە پێوەندیی بە شارستانییتەکانەوە نییەو شارستانییەتەکان ناگرێتەوە. شپنگلەریش بە دڵنیاییەکەی خۆیەوە دەڵێت:" هەموو کۆمەڵگەیەك تەمەنی خەملیوی خۆی هەیە" ئەم قسەیەش لە قسەکەی ئیبن خەلدون دەچێت، قسەیەکی بێ مانایە و هەروەکو ئەوە وایە کە بڵێت: هەموو تەمسیل و نواندێك بریتییە لە چەند بەشێك، شارستانییەتەکان شتێکن ملکەچی قانوونە بایۆلۆژییەکان نابن، کەواتە هیچ پێویستییەك بە پیرییەکەی شپینگلەر (بەشی دووەم) هیچ پێویستییەکیش بە (کۆتایی فەترە زەمەنییەکەی) ئیبن خەلدون نییە.

## خوێنی سەرگەرمێکی درندانە:

کەسانێکیش هەن، کەوتن بە لەناوچوونێك دادەنێن، لە ئەنجامی بۆمانەوەی (توارث) شارستانییەتەکاندا تووشی شارستانییەت دەبێت، لەم حاڵەتەدا هیچ چارێك نییە، دەبێت خوێنێکی دڕندانەی تازە پەیدابێت و شارستانییەت تازە بکاتەوە، ئەم خوێنە دڕندانەیە تازەیەش لە داگیرکارێکی سارانشین یان بەربەردا دەردەکەوێت، تا کۆمەڵگەیەکی نوێ دێتەکایەوە و سەرهەڵدەدات. هەروەکو لە تازەکردنەوەی شارستانییەتی ئیتاڵیادا ڕوویدا، لەو دەمەدا، کە داگیرکارانی قوت و لۆمباردییەکان. خوێنی خۆیان ڕشتە ناو دەماری ئیتاڵییەکانەوە، ئەوە بوو ڕێنیسانسی ئەوروپا لە ئیتاڵیاوە دەستی پێکرد، کە دەوڵەتی ڕۆما، چەند سەد ساڵێکیش بەر لەوە ڕووخابوو.

تۆینبی ئەو لێکدانەوە ڕەگەزپەرستانەیە ڕەتدەکاتەوە " خوێنی چالاك بەناو دەماری سستدا بڕوات"و دەڵێت: ئەگەر لێکدانەوەی مێژووی ئیتالیا، ئا بەم جۆرە تا سەدەی شازدەمینیش هەقی خۆی بێت و ڕێی تێ بچێت و کەمو زۆر بەڕاست دابنرێت، مادامێکی هێشتا لەو قۆناغەی زەمەنەدا وەستاوین، بەلاّم ئەم لێکدانەوەیە ناکەوێتە سەرپاو خۆی ڕاناگرێت، کاتێك کە دەبینین ئیتالیا لە سەدەی نۆزەمیندا بە بێ ئەوەی قوتی یان لۆمباردی خوێن لە دەمارەکانی بکەن، یەکی گرتەوەو بوو بە یەك. تۆینبی پاشان دەڵێت: ئەگەر بمانەوێت لێکدانەوەیەکی ڕەگەزپەرستانە بۆ ئەم مێژووە بڕازێنینەوە. دەتوانین بەلگەی ئاسایی و ئاسان بهێنینەوە کە خوێنی لۆمباردییەکان "ئەکسیری ژیان"، واتا مایەی ژیان نەبووە، بەلکو پەلەیەکی ڕەش و شەرمەزاری (وصمە عار) بووە.

یەکەم: داگیرکاریی دەرەکی

تۆینبی هەروەها ئەوەش ڕەتدەکاتەوە و مل نادات بەوەی، کە گوایا رووخانی ئاوەدانی بەهۆی داگیرکاریی دەرەکییەوە ڕووی دابێت " تۆینبی ڕای وایە کە شارستانییەت ، خۆی لەناو خۆیدا دەتەپێت، بەرلەوەی داگیرکارانی دوژمن بگەنە ناوی.

بەو جۆرە تۆینبی چوار جۆرە لێکدانەوەی هەلوەشان و لەناوچوونی شارستانییەتەکان ڕەتدەکاتەوە ئەم جۆرانەی خوارەوەن:

ا_ ئەو بیرۆکەیەی کە هۆی لەناوچوونی شارستانییەت دەگەڕێنێتەوە سەر "کۆتایی قورمیشی سەعاتی " گەردوون، یان نەمانی زەمەنی قورمیشەکە واتا قورمیشەکە خاوردەبێتەوە، چونکە کاتەکەی بەسەردەچێت و نامێنێت. ژیان و پیربوونی شارستانییەت و کاولبوونی زەوی و بێ بەربوونی خاك بە سەردەچێت.

ب_ ئەو بیرۆکەیەی کە شارستانییەت بە بوونەوەری زیندوو دەشوبهێنێت، گوایا تەمەنی دیاری کراوە، لە لایەن قانوونەکانی بایاۆلۆژیی تایبەت بە سروشتی ئەو بوونەوەرەوە.

ج_ ئەو بیرۆکەیەی کە وەستانی شارستانییەت لە خەملین و گەشەسەندن دەباتەوە سەر ئەوەی، کە گوایا خەسڵەتی ئەو کەسانە خۆی لە ئەسلاّ ڕووخاو و بێ قیمەتە، کە بەشدارییان لە دروست کردنی شارستانییەتەکەدا کردووە، واتا بەشداربووەکان خەسڵەتی بایۆلۆژییان لە بناغەدا رووخاوە، چونکە ئەوان زەمەنێکی زۆر دووریان بەسەردا تێپەریوە، لەو ڕۆژەوەی کە لە پشتی باو و باپیرە بەهێز و خاوەنی شارستانییەتەکانیانەوە کەوتوونەتەوە. لەو ماوە درێژەشدا خوێنەکەیان ماوەتەوە و تازەنەکراوەتەوە، سوودی نەماوە.

د_ ئەو بیرۆکەیەی کە هەرەس و ڕووخانی شارستانییەت ، بە داگیرکاریی دەرەکی لێك دەداتەوە، تۆینبی دەڵێت داگیرکاریی بیانی بەهۆی لاوازی و هەرەسی شارستانییەتەکەوە روودەدات، خۆی نابێتە هۆی کەوتنی شارستانییەت.

گەورەترین گێچەڵ ئەوەیە، کە دەمهێنێتە پێکەنین!

جا، ئەگەر تۆینبی هەرەس و ڕووخانی شارستانییەت ، بەو هۆیانە رەت بکاتەوە و ئەو بیرۆکانەش بە هیچ و پووچ دابنێت، کەواتە هۆی هەرەس و رووخانی شارستانییەتیی چییە؟

تۆینبی ڕای وایە کە هۆی هەرەس و ڕووخانی شارستانییەت ئەوەیە، کە حاکمەکان (دەستەبژێرەکان) وزەی داهێنان و بنیادنانیان نامێنێت، ئەو وزەیەی کە کاریگەریی جادووگەری (سیحر) ی لەسەر پرۆلیتاریا ٢٥٦"گەل" هەیە.

---

٢٥٦ _ پرۆلیتاریا (proletariat ):لە کولتوری گریکدا بەو ئازادانە دەگوترا کە هەژاران و بەندە (کۆیلە) نین، لە بیروبۆچوونی مارکسیزمدا بەو کەسانە دەگوترێ کە بە رەنجی باسکی خۆی بژیت، هیچ هۆیەکی بەرهەم هێنانی تری نەبێت (واتە چینی کرێکار). مانای (پرۆلیتاریا) لای تۆینبی زۆرینەی خەڵکە (عامە الناس)، بەرامبەر بە کەمینەی فەرمانڕەوا (النخبە / الاقلية المبدعة).بڕوانە: نامەی ماستەری کاوە عەزیز برایم بەناونیشانی (النخبة و دورها في نشوء الحضارات وسقوطها عند ارنولد توينبي)جامعة صلاح الدين — اربيل كلية الاداب.

# جادووی بالآیی لە خۆدەرچوون

ئەوەش وەهای لیّ کردوون کە لە ڕێی چاولیّکەری لەسەرەتای دامەزراندنی شارستانییەتەکەدا وزەی داهیّنان بدۆڕێنن، ئەمەش مانای وایە کە تۆینبی سروشتی سستبوون و وەستانی شارستانییەت بە شیّوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە سنووری ناماددیدا دادەنیّت، بەلّکو ڕاشی دەگەیەنیّت کە ئەم سستبوون و راوەستانەی شارستانییەت ، هۆی ئەوەیە کە توانست و مەلەکەی داهیّنان لە ڕوحی کەسانی داهیّنەردا نامیّنیّت، ئەم نەمانەش هیّزی ئەوەی لیّ دەبڕیّت بتوانیّت کار لە زۆرینە واتا کار لە (جەماوەر) ی ناداهیّن بکات. واتا لە هەر جیّگەیەك داهیّنان و بنیادنان و دروستکاری، نەمیّنیّت، چاولیّکەری و لاساییش نامیّنیّت. بە نموونە: کاتیّ کە زوڕناژەنی "داهیّنەر" هونەرمەندییەکەی خۆی لە دەست دەدات و هونەرەکەی نامیّنیّت، ئیدی ناتوانیّت ئاهەنگی بەشداربووانی هەلّپەڕکیّ و ڕەشبەلّەکەکە بجوولّیّنیّت، ناچاردەست دەکات بە توندوتیژی، ئیدی لیّدانی ئاوازی خۆش و خڕۆشی کۆن سوودی نامینیّت و هیچ شتیّك نابزوویّنیّت، ئەوجا دەپەشۆکیّ و لە گەرمەی تووڕەبووندا خۆی لیّ دەبیّت بە "عەریفیّکی مەشقی سەربازی" بە زۆر و زۆرەملیّ خەلّکانیّك دەهیّنیّتە خۆبادان و هەلّپەڕکیّ کە ئەو توانستەی جارانیان نەماوە موگناتیسی پیّکەوە بنووسیّن و دەست بگرن و هەلّپەڕن، ئەوجا لە جیاتی زوڕناکە قامچییەك دەگریّت بە دەستەوە پشتی ئەو خەلّکە دەداتە بەر قامچی، کە ئەوانیش بەهیچ جۆریّك ئاوڕیشی لیّ نادەنەوەو زۆر بە خۆشییەوە ئازاری قامچییەکە دەچیّژن، چونکە بە تەواوی بۆیان دەرکەوتووە، کە ئەو دەستەی لیّیان دەدات و ئازاریان دەدات، ئەوە ناهیّنیّت گویّی بدەنیّ، باشتر وایە لیّی بیّ دەنگ بن.

لەوەوە تۆینبی دەبینیّت کە کۆمەلّگەی رووخاو بەم شیّوەیەی خوارەوە دەبیّت:

١- کەمینەیەك دەسترۆ و دەسەلاّتدارە، بەلاّم توانستی داهیّنانی تیّدا نەماوە و بە تۆپزی حوکم دەکات.

له حەقیقەتیشدا، کەینێ کەمینەی داهێنەر لە مێژووی هەر کۆمەڵگەیەکدا داکەوت و گۆڕا بۆ کەمینەیەکی دەسترۆی حوکمبەدەست، دەیەوێت — لەڕێگای هێرشەوە بێت — مەرکەزی خۆی لە دەست نەدات، کە شایانی ئەو مەرکەزەی نەماوە، ئەم گۆڕانە لە سروشت و ڕەوشتی چینی حوکمداردا، لەلایەنی بەرامبەردا سەرهەڵدەدات، پرۆلیتاریا جیادەبێتەوە.

٢- پرۆلیتاریایەکی ناوخۆی دەستەمۆ (زەلیل)، بەلاّم بە ورك و جیڕ، بۆ دەرفەتی شۆڕشکردن دەگەڕێ و لە بۆ سەدایە. تۆینبی پرۆلیتاریا وەسف دەکات و دەڵێت، پرۆلیتاریا:" چینێك یان کۆمەڵێکی کۆمەلاّیەتییە، سا بە هەر جۆرێك لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا دروست بووە و بووە بە کۆمەڵگەیەك لە قۆناغێکی مێژووی خۆیدا (بەلاّم، لەو نییە)، پرۆلیتاریا بەو جۆرە جودا دەکرێتەوە، نە هەژاریە و نەهەتیوچییە، بەڵکو بە هەستە، ئەو بوغز و کینەیەیە، کە ئەو هەستە دیوروژێنێت، ئەو هەستەیە کە تاکەکەس وا دەزانێت پێگەو جێگەی کۆمەلاّیەتی خۆی لێ زەوت کراوە، کە ئەو پێگەیەی لە باب و باپیرانەوە بۆماوەتەوە. ئەم دۆخەی پرۆلیتاریا کە شایانی پرۆلیتاریا نییە وڕکنی دەکات و وەهای لێ دەکات کە دەرفەتی شۆڕش بێنێتەکایەوە و پەلاماری کەمینە زاڵمەکە بدات.

ئەم پێناسەیە بەسەر ئەو پرۆلیتاریەدا دەچەسپێ کە لە قاڵبی (جسم) ی شارستانییەتی هێلینی لە ڕۆژانێکدا جیابۆوە، کە شارستانییەتی هێلینی هەڵدەوەشا، کە دەتوانرێت بکرێت بە جووتێکی گشتی بۆ هاوشێوەکانی لە شارستانییەتە جۆربەجۆرەکاندا.

٣- پرۆلیتاریای دەرەکی کە لە کۆمەڵگە جیابۆتەوەو لە دژی تێکەڵبوونەوە دەوەستێت و لە بۆسەدایە تا هێرش و داگیرکاری دەست پێ بکا.

ئەم جۆرە پرۆلیتاریایە، کەلێنێکی ئەدەبی و جوگرافی، لە کەمینە حاکمەکەی جیادەکاتەوە" بە سنوورێك کە دەتوانرێت بپشکنرێت و لەسەر خەریتەش ڕەسم بکرێت"

ئەم پرۆلیتاریایە، لە سەرەتای دروستبوونی شارستانییەت تیشکەکانی دەگاتە جێگایانی دوورو کاریگەرییە ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانیشی دەگاتە هەوارگەی خێڵە دراوسێکانی و رایان دەکێشێت بۆ ناو ریزی ئەو زۆرینەیەی کە بە دوای کەمینەیەکی خولقێنەر کەوتبوون، کەمینەکەش بە چالاکی دەمێنێتەوە تا ئەو ساتەی تووشی لاوازی و داهێنزران (الانحلال) دەبێت و ڕەونەقی نامێنێت ، خێڵە دراوسێکانی ئیدی ملی بۆ کەچ ناکەن و چاوی لێ ناکەن و دەمیشی شیرین دەکەن کە پەلاماریان بدات و پەل وپۆی بەرەلاّی ئەم لاو ئەو لایان لێ دابڕ بکات و تێیاندا دابمەزرێت و بیانکات بە بەرەی بەردەوام و جێگا سنوورییەکان کە ئەمانە لەوە پێش لەسەدەی گەشەکردنی شارستانییەت بووبوون بە دەرگای دانەخراو و ئازاد.

ململانێ، لە نێوان کەمینەی دەستبالاّو، پرۆلیتاریای دەرەکیدا بەردەوام دەبێت. کەمینەی دەستبالاّ هیچ چارەسەرییەك بۆ کێشەکانی ناوەوەی خۆی لە دژی پرۆلیتاریای بەرق غەزریو هیچ چارەسەرییەکیش بۆ ململانێی دەرەکی لە دژی پرۆلیتاریای دەرەکی نادۆزێتەوەوهیچی بە دەستەوە نامێنێت، لەوە زیاتر کە دەستبکات بە داگیرکردنی دەوروپشتی دەرەکیی خۆی و دامەزراندنی ئیمپراتۆری ئیدی بەم جۆرە دەوڵەتە جیهانییەکان جاروبار دوای دارووخانی شارستانییەت و سەرەنجامی ڕووخانی شارستانییەت (نەك بەر لە رووخانی شارستانییەت پەیدادەبن و بۆ یەکێتی سیاسیی ناو جەماوەرەکەیدا خەبات دەکەن، لە کاتێکدا نیشانەی زۆری ئەو کۆمەڵگەیە، هەر داهێزان و هەڵوەشان بوو.

کۆمەڵگەی هەرەسهێناوی داکەوتوو، نیشانەگەلی نەمانی بەهاو هەڵوەشانی کۆمەلاّیەتیی تێدا بەدیاردەکەوێت. دەبا بزانین هۆکاری ئەم هەڵوەشانە چییە؟ ئەمانەی خوارەوە نیشانەی کۆمەڵگەی هەڵوەشاوی هەرەسهێناو، پیشان دەدەن:-

١- کەمینەی دەستبەکار و ئاڕاستەکار هێزی داهێنانی کەم دەکات و ناتوانێت بەرەو پێش خۆی دەرباز بکات و دەبێتە تاوێرێکی ناپەسەند لە سەر ڕێگای هەموو جۆرە داهێنانێکدا کە خۆی لە پێشدا ببوو بە دەسەلاّتێکی دڕندە و زاڵم.

٢- زۆرینه حەز بە چاولێکەریی کەمینە ناکات، چونکە کەمینەکە نەتامی ئەوەی تێداهێشتووەتەوە کەس چاوی لێ بکات و خۆیشی توانستی ڕاکێشان و بەدۆست کردنی کەسی پێنەماوە.

٣- یەك پارچەیی کۆمەلایەتی نامێنێت، یەکێتیی نێوان هەموو تیرە و تاقمی کۆمەڵگەکە لێك دەترازێت. سا بە هۆی تووڕەبوونی خەڵکەکە یان بە هۆی کەرتبوون و جیابوونەوە دەرەکییەکان.

لەوەوە دیارە تۆینبی ڕای وایە، کە سەرەتای هەڵوەشان لەو کاتەدا ڕوودەدات، کە کەیان و سروشتی کەمینە دەستبالاکە، خۆی تووشی هەڵوەشان دەبێت و هەڵوەشانەکە ئەوانی دیکەی دەوروبەرەکەی تووش دەکات. ئەم کەمینەیە لە قۆناغی یەکەمدا کەمینەیەکی خولقێنەر بوو، دەشیتوانی ڕەتدانەوەی بەردەوام و سەرکەوتوو لە دژی زنجیرە بێباکی و بێمنەتییەکی تازە بداتەوە، بەلاّم لە قۆناغی دووەمدا ناتوانێت شانبەشانی داهێنان بڕوات. لەبەر ئەوە دەبینین، دەبێت بە کەمینەیەکی دەستبالاّ و دەیەوێت بە کوتەك ئەو مەرکەزە فەرماندەییە بۆ خۆی بهێڵێتەوە کە ئیدی بۆی نابێ و مافی تێدا نەماوە.

سەرەنجام لەم دۆخەش ماوەی لەناوچوونی شارستانییەت دەست پێدەکات و "زەمانی ئاژاوە و تەنگانە" دێتە پێش، کە ئیدی فیتنەی محەللی و جەنگی ئیقلیمی لەناو یەك کۆمەڵگەدا بەرپادەبێت.

مادامێکیش کلیل بەدەستی مەسەلەکە دەستەبژێرەکان خۆیان بن، ئایا ئەم دەستەبژێرانە چۆن چۆنی هۆکارەکانی داهێنان لە دەست دەدەن و بەرە بەرە دەبن بە کەمینەیەکی دەستبالاّو؟ شارستانییەتەکەش دەگاتە قۆناغی هەرەس و هەڵوەشان؟

تۆینبی دەڵێت: داهێنەرەکان کەسایەتیی ناودارن، یانیش کەمینەکانن، ئەگەر برادەرەکانیان لەگەڵ خۆیاندا نەبەن، ناتوانن یەك هەنگاو بەرەو پێش بچن، جەماوەریش داهێنەر نییە، کە زۆربەی زۆری کۆمەڵگە پێك دەهێنێ، ناتوانرێت، بە چاوترووکاندنێك هەموویان بگۆڕدرێن و سەربخرێن تا ئاستی سەرکردە داهێنەرەکان.

ئەركی سەركردە ئەوەیە كە دەستداكانی بكات بە برادەری خۆی، یەكەم ڕێگاش كە بتوانیت هەموو ئادەمیزاد بەرەو ئامانجێكی دوور بەریت، ئەوەیە كە بتوانیت چاولێكەری و لاسایی هەموو ئادەمیزاد بكەیتەوە، چونكە لاساییكردنەوە و چاولێكەری جورێكە لە جۆرەكانی مەشقی كۆمەلآیەتی.

كاتێكیش "سەركردەكان لە داهێنان دەكەون، ئەوجا نازانن ئەو هێزەی كە لە ژێر دەستیان دایە چۆن چۆنی بەكاری بێنن، بەخراپی بەكاری دەهێنن، لەبەر ئەوە جەماوەری دەستدا لە دژیان دەورووژێن و ئەفسەرەكانیش بە ڕەفتاری توند و بەخێرایی ڕیزەكان ڕێك دەخەنەوە "، بەلآم بە قامچی نەك بە (چنگی قیسارەی ئۆروفیوس٢٥٧) جیابوونەوەی خەلك لە سەركردەكان، دەتوانرێت بە بزربوونی هاوگونجاویی ناو پارچەكانی یەك كۆمەلگە دابنرێت، ئەمەش لەسەر حسابی هەموویان ڕوودەدات كە توانستی دیاركردنی چارەنووسی لە دەست دەدرێت، ئەم لە دەستدانی توانستی دیاركردنی چارەنووسەش، پێوەر و نیشانەی ڕاست و دروستی وەستانی خەملین و گەشەسەندنە و نیشانەی دوابڕانی سەروكاری نێوان لایەنەكانی كۆمەلگەیە.

جا ئێستا پێویستە شارەزایان ئەو شێوانە ببین، كە لە ڕێگەی نەمانی هاوگونجاوییەوە، نەمانی توانستی چارەنووس بەدیاردەكەوێت. یان ڕوونتر بلێین، بۆچی كەمینەكان هۆكارەكانی داهێنان لە دەست دەدان؟

هۆی ئەم لە دەستدانەش بەڕای تۆینبی ئەمەیە:

١- سركەكە ، سركەی تازەیە، بەلآم لە كوپەلە كۆنەكان كراون:

(New winw in old Bottles)

---

٢٥٧ _ ئورفیوس: orpheusی: گۆرانی بێژ كە دەنگێكی خۆشی هەبووە، كاریگەربووە، وەكو ئەفسانە گریگییەكان دەلێن دار و بەردی دەلەراندەوە.

- باسی ئەو پرەنسیپ و هۆکارانە دەکرێت، کە لە رووی جەدەلییەوە، پێکەوە گرێ دراون.

ئەو نموونەیە، لە دەستەواژەیەکی ناو ئینجیلی (سەردەمی تازە)وە، وەرگیراوە، قسەیەك هەیە گوایا، مەسیح (د.خ) وتوویەتی:" کەستان پارچە قوماشێکی تازە بە کراسێکی کۆنەوە نەنێت، چونکە خەڵکەکە کاتێك کراسە (کۆنەکە) دەکرێت، پینە تازەکەی زیاتر دەردەکەوێت. "سرکە"ی تازەش ناکەنە کوپەڵەی کۆنەوە، نەوەکا کوپەڵەکە بقڵیشێت و سرکەکە برژێت و، کوپەڵەکەش ورد و خاش ببێت، بەڵکو سرکەی نوێ دەکەنە کوپەڵەی نوێوە، تا هەردووکیان سەلامەت بن".

کەمینە داهێنەرەکان، یان ناودارە دەگمەنەکان، قسەی لەو جۆرە لە پێغەسبەران و بیرمەندان وەردەگرن و سیستەمی تازەیان لێ دروست دەکەن، بەڵام پاشان ئەو سیستەمانە بە قالبی کۆندا دادەڕێژرێن، ئەوجا سروشتی سیستەمە تازەکان وەك کۆنەکانیان لێ دێت و لە دژی هەموو هەواو هەوەسێکی تازەکردنەوە و داهێنان دەوەستن، بەوەش سیستەمەکە هەڵدەوەشێت یان نەمانی لێهاتوویی و شایانی، نەمانی داهێنان و رەسەنایەتیی لێ دەکەوێتەوە و وەسیلەکە دەبێت بە ئامانج.

نموونەی ئەوەش، ئەوەیە کە بزووتنەوەی سەنعەتکاریی بەرفراوان، سیستەمێکی تازەی گونجاوی بۆ ژیان دروست کرد و هەرزانی و بەختیاریی بۆ هەمووان رەخساند. وەلێ دەبینین ئەم سیستەمە تازەیە لە سیستەمی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتیدا دارێژراو کرێکاران لە سیستەمی سەرمایەداریدا وەکو کۆیلەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتییان لێ هات.

ا- قۆناغی سەنعەتکاری: کرێکاران بوونە قوربانی.

ب- شۆڕشی پیشەسازی: سامانی میللەتان بووە قوربانی.

ج- فێرکاریی: خوێندەواران، ڕۆژنامە ڕەشەکان دەخوێننەوە.

نەك هەر ئەوە، بەڵکو سیستەمی پیشەسازی ئەم سیستەمی کۆلایەتییەی ئێستای لێ کەوتەوە، کە بۆ ژیانی ئەم زەمانە ناگونجێت، خولێکی تازەی ژیانە و مانای

پێشکەوتن لە قۆناغی سەنعەتکاریدا نەما، چونکە سرکە (شەڕابە) تازەکە ڕۆکرایە ناو کوپەڵە کۆنەکانەوە. دوای شۆڕشی پیشەسازیش هەر هەمان شت ڕووی دا، کە دەوڵەتە پیشەسازییەکان پێویستییان بە کەرەستەی خاو و سووتەنی بازاڕ بۆ فرۆشتنی بەروبووم و سەرمایەی خۆیان، ئەم هەموو پێداویستییانە کێبڕکێ و دوژمنایەتی لەسەر دابەشکردنی جیهان بۆ ناوچەگەلی هەژموون و دەسەلاّت دروست کرد. ئەوەش کۆششێك بوو لە نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا بۆ زێدەڕۆیی و فراوانبوون و تەشەنەکردنی ئیستعمار، بە هەمان چەشنی بزووتنەوەی فراوانبوون و نیشتەجێبوونە کۆنەکە. سەرئەنجام جەنگی خوێنین قەوما، "جەنگیش هەروەکو کۆیلایەتی وایە سوودی بۆ کەس نییە" ئەم حالّەتەش بێگومان هەوا و هەوەسێکی بەربەریی کۆنە. هەرچەندیش بەناوی شۆڕشی پیشەسازییەوە و بەناوی پێداویستییەکانی شۆڕشی پیشەسازییەوە ڕوودەدات.

فێرکاریی گشتییان پێی دەڵێن" فێرکاریی دیموکراتی" یەکێکە لە گۆڕینی گەورەی کۆمەلاّیەتیی نوێ. هەموو دەوڵەتێك حەزی بە مەرکەزێکی شەرەفمەند لە نێوان کۆمەڵەی میللەتە تازەکاندا بکردایە، شانازیی بەم فێرکارییە دیموکراتییەوە دەکرد و بیرمەندە ئازادەکان ئەوەیان بە سەرکەوتنی عەدالەت و ڕۆشنکردنەوەی هزر دادەنا و شاباشیان دەکرد، بەلاّم هەموو کەسێك کە بە وردی سەرنجی لێ بدات دەبینێت ئەوەی رووی دا ئەوەبوو، کە خۆراکی ڕۆشنبیری لەناو کۆمەڵگەدا سەرجەم "بێ خوێ و بێ تام و بەبێ ڤیتانین مانەوە" و کاتێك ئەم جۆرە پەروەردەیە کەوتە دەست هەموو کەسێك ڕوحی سوود و مەنفەعەتی ماددی بلاّوبووەوە.

ئینجا دەڵێت: ئەم جۆرە پەروەردە دیموکراتییەش ئاستەنگێکی لە ڕێگای فێرکارییەکەدا دروست کرد، بەلاّم چۆن ئاستەنگێك. ڕەش وەکو سێپایەی ژێر مەنجەڵ. ئەم (نان)ەی لەم فێرکارییە گشتییە و هاتە دەست، هەر ئەوەندە لەناو ئاوی بهاوێی، لە بن ئاوەکەوە ماسیی پیاوەخۆر پۆل پۆل وەسەردەکەون و (نان)ی منداڵەکان لەبەرچاوی مامۆستاکەیان دەخۆن، جا بە دوای ئەو بەزمەدا ڕۆژنامەگەلی ڕەش یان

زەرد "Yellow press" سەرهەڵدەبڕن. واتا رۆژنامەی وورووژاندنی هەستی خەڵك و پڕوپاگەندەی بێ بەها. " لە کوردییەکەدا (زەرد) دەبێت بە (ڕەش)، چونکە (ڕەش) لای کوردەواری نیشانەی نەگبەتییە، نەك (زەرد).

ئیدی بەو جۆرە و خاوەن چاپخانەکان بەو خۆراکە خراپە و بەو منداڵ خەڵەتاندنە کە گوایا بە ناخێریان خێر بە ڕۆشنبیران دەکەن، بە ملیۆنەها پارەی قازانج لە بەریکی خۆیان دەنێن و پڕوپاگەندەیەکی کاڵ وکرچ و هەرزان و بێ بەها بڵاودەکەنەوە، بەنرخێکی زۆرکەم، وەلێ قازانجێکی گەورەی بۆ خۆیان زامنە. بەو جۆرە ئەو وڵاتەی فێرکاریی گشتی دەهێنێتە ئاراوە، خەڵکەکەی دەکەونە بەر مەترسیی کۆن و بەندکردن و بەندایەتیی عەقڵی، کە کۆتکردن و بەندایەتیش چەوساندنەوەی تایبەت یان دەسەڵاتی گشتی (حکومەت) تەگبیری بۆ دەکات و بەڕێوەی دەبات. ئەم سیستەمە تازەیە لە ئەوروپا گۆڕاوە بوو بە رەگەزپەرستی دوژمنایەتی و سیستەمی دیکتاتۆریی وەك فاشیزم و نازیزمی لێ هەڵقووڵا.

تۆینبی دەڵێت: ئەگەر بمانەوێت خەڵك لەم بەڵایە ڕزگار بکەین، تەنیا ڕێگە ئەوەیە ئاستی فێرکاری هەندە بەرز بکەینەوە، ئەوانەی بە دەستی دێنن لەو جۆرە بن کە شێوە ترسناکەکانی چەوساندنەوە و پڕوپاگەندە کاریان لێ نەکات.

دووەم: بەڵای داهێنان یان کینەی داهێنان:

پەرستنی نەفسی هیچ و پووچ و سیستەمی هیچ و پووچ:

یان (ڕێگە نەدرێت بە داهێنان کە درێژە بکێشێت) واتا وەستاندنی داهێنەرەکان.

شاعیرێکی وڵاتی چین، کە لە سەردەمی ڕووخانی شارستانییەت چیندا ژیاوە، ئەم بیرۆکەیە هزرە دەردەبڕێت و دەڵێت:

"ئەو کەسەی لەسەر پەنجەکانی پێی دەوەستێت، جێگیر ناوەستێت".

"کەسێکیش بە هەنگاوی گەورە بڕوات، ئەوە زۆر بە خێرایی ناڕوات"

"کەسێکیش خۆی هەڵبکێشێت، لە هیچ ئیشێکدا سەرناکەوێت"

" هەر کەسێکیش بە ئیشی خۆی بنازێت، هیچ شتێك وە دنیا ناهێنێت، دەوام بکات"

پاداشتی داهێنان، یان سزای کینەی داهێنان، ئەوەیە کە ئەو شاعیرە چینییە پیشانی داوە، پیاو هەر کە بۆی دەرکەوت داهێنانێکی ئەنجام داوە، هەر زوو بە زوو داهێنانەکەی دەبێتە بەربەستێکی رێگر و نایەڵێت رۆڵی خۆی بگێرێت و دەبێتە هۆیەکی کاریگەریی هەرەسهێنانی شارستانییەت.

ئەوە لە شارستانییەتەکانیشدا ڕوودەدات کاتێك، کە دەست دەکات بە هەرەسهێنان و کەمکردنەوەی ژمارەی داهێنەرەکان. لەوانەی کە دەتوانن ڕۆڵی داهێنەرەکە بگێڕن بەرامبەر بە هەر بێمنەتییەکی چاوەڕوانکراو. لەم جۆرە حاڵەتەدا، داهێنەرەکان ناتوانن یاریدەی کۆمەڵگە بدەن، کە پێش بکەوێت، بەڵکو وەك " دەریاوانێکیان لێ دێت کە لە تەنیشت سەوڵەکەیەوە هەڵگژاوەو دەحەوێتەوە". لە کاتێکدا کە داهێنان وەها دەخوازێت کە وزەی نادیار هەمیشە لە حاڵەتی رەسەنی ئامادەباشی دابێت. کاتێکیش هەلومەرجەکە تازە دەبێتەوە و داهێنەرەکە هیچی بە دەستەوە نامێنێت پێشکەشی کۆمەڵگەکەی بکات، لەوە زێتر کە هەڵوێستەکانی ڕابردووی خۆی بۆیان بگێڕێتەوە و باسی بیرەوەرییە خۆشەکانی خودی خۆی بکات، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە لە سەر خەیاڵی ڕابردوو دەژی. لە کاتێکدا کە پێداویستەکان تازە دەبنەوە و ئەویش توانای ئەوەی نەماوە شتی تازەیان پێشکەش بکات. ئیدی بەم جۆرە داهێنەرەکەی قۆناغی یەکەم، لە قۆناغی دووەمدا دەبێتە پێشەنگی بەرهەڵستکارانی ئەو کەسەی گوێڕاڵییەکی سەرکەوتووانە دەکات. ئا، ئەوەیە بەلاو خراپەی داهێنان. واتا داهێنەرەکەی بەری (پێشوو) لە سستی و بێ دەسەلاتی زێتر هیچی تری لانامێنێت و جەماوەرەکەش لە تاکپەرستن و دڵبەندبوونی تاکپەرستی بەو لاوە هیچی تری و بۆ نامێنێتەوە. لەم جۆرە حاڵەتەدا، ئەو جەماوەرە کە دەستی لە پەرستشی بتەکان هەڵگرتووەو وازی لێیان هێناوە، یان ڕوونتر بڵێین، ئەو جەماوەری کە پشت بە داهێنەرەکە و عەقڵی داهێنەرەکەدەبەستێ، دەستی لە پەرستشی تاکی بێ

گیان هەڵگرتووە، بۆ ئەوە دەستی هەڵنەگرتووە، کە خوای هەق بپەرستێت، بەڵکو بۆ ئەوە دەستی هەڵگرتووە تا ڕووخێنەری بتەکان بپەرستێ یان روونتر بڵێین" بۆ ئەوە دەستی هەڵگرتووە جارێکی تریش تاکی بێ گیان بپەرستێت، نەك تەنیا لە بواری ئایینەکاندا، بەڵکو لە هەموو بوارەکانی تریشدا. لەوانەیە بزووتنەوەکە شێوەیەکی دیاریکراوی لە پەرستنی سیستەمێکی تایبەت یان پەرستنی دەسترەنگینییەکی هونەریی لە پیشەسازیدا لە خۆبگرێت، کە لە رابوردوودا سوودی بۆ بەندەکان هەبوو.

لە بواری تەکنەلۆژیادا نەوەی کۆن بە هەوێنی پێشکەوتنە ماددییەکەی یان بە ئامرازی سەرکەوتنە جەنگییەکەی دا شاناز و شێلگیربوو، بە جۆرێکی ئەوتۆ شانازیی پێوەدەکرد، سەرنجام خۆی لەو ئاستەدا سست بوو. پێش نەکەوت و پەرەی نەسەند و بوو بە هۆی سەرکەوتنی دوژمن. بە نموونە، باسی بەسەرهاتی مەملوکەکانی میسر دەکات٢٥٨. کە بە هەمان شێوازی جەنگ و بەکارهێنانی سوارچاکی و مەنجەنیق سەلیبییەکانیان لە دوا قەڵاکانی خۆیان دەرپەڕاند و پاش ئەوەش کە لویسی نۆیەمی مەلیکی فەڕەنسایان دەستگیرکرد. دوای ئەوەش بەسەر تەتەرەکاندا لە شەڕەکەی (عەین جالووت) دا سەرکەوتن، بەڵام ئەو مەملوکانە ئەوەیان لە بیرچووبوو،کە بەردەوامبوونیان لەسەر بەکارهێنان ئەو شێوازانە تووشی شکاندنیان دەکات، چونکە تەکتیکی جەنگەکەیان لە ڕووی چەکی ئاگردار و ئەو تۆپانەدا، کە ناپلیۆن دایمەزراندبوون زۆر لاوازبوو، لەبەر ئەوە بەلای داهێنان لەم بوارەدا ئاماژە بەم شێوازەی خوارەوە دەدات:

---

٢٥٨ _ مەمالیك یا کۆیلەکان، یا "بەندەکان – الممالیك" سەرداری وڵاتی میسر بوون و لە ساڵی ١٢٤٨ – تا ساڵی ١٥١٧ز. ئەو تورکانە وڵاتی شامیش لە ژێر فەرمانڕەوایییاندا بوو. جارێکی کەش هاتنەوە سەر حوکمی میسر، بەڵام ناپلیۆن پۆنابرت لە شاڵاوەکەیدا بۆ سەر ئەو وڵاتە شکاندنی، پاشان محەمەد عەلی پاشا لەناوی بردن.

داهێنان (دروستکردنی شتی تازە بابەت) دەبێتە هۆی سەرکەوتن پاشان سستبوون پاشان لێقەومان یان تێکشکان.

جوولەکەکانیش، هەر لە کۆنەوە ئەمەیان لێ قەوما، کاتێك کە قەناعەتیان بە خۆیان هێنا، کە ئەو تاکە خوایەی ئەوان دۆزیویانەتەوە دەیسەلمێنێت کە جوولەکە گەلی هەڵبژاردەی خوایە. کاتێك بەشێوەیەکی کاتی بەرزببوون، ڕوحی کە پێیگەیشتبوون وەهایان لە قەڵەمدا کە هەروەکو تایبەتمەندییەك خوا بەردەوام بەوانی بەخشیبێت وەهایە.

سێیەم: جەنگ هەوەسێکی خۆکوشتنە:

ڕای تۆینبی ئەوەیە- لەبەر چەند هۆیەکی عەقڵیی پەتی — کە جەنگ وەکو کۆیلایەتی (الرق) وەهایە " هیچ سوودێکی تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش نییە، کە وەها دەزانن سوودی لێ دەبینن چونکە جەنگ زەرەری گەورەی بۆ سەرکەوتوو و ژێرکووش وەکو یەك هەیە. بێ ڕاکێشان و فراوانبوونی دەرەکیش، دیاردەی هەرەسهێنان و هەڵوەشانە. ئەوەشمان دیت کە نەمانی وزەی داهێنان لە لای کەمینەی حوکمدار دەیگۆڕێت و دەیکات بە کەمینەیەکی دەستبالاّ. دەسەلاّتی خۆی. بە زۆری کوتەك بەسەر جەماوەردا دەسەپێنێت.. هەرچی پرۆلیتاریایە، ئەوە چاولێکەرییەکە یەکەم جار دەگۆڕێت و دەبێت بە لاساییکردنەوەیەکی ئامێرئاسایی پاشان ئەم زۆرینەیە. ملکەچییەکەی خۆی دەکێشێتەوە و واز لە لاساییکردنەوە دێنێت، بەڵکو لەوانەشە بەشێکیان ببن بە پرۆلیتاریای داخ لە دڵ و کەلێنێکی ئەدەبی و جوگرافی لە کەمینە حوکمدارەکەی جیادەکاتەوەو خۆی لە بەلای کەمینە بالاّدەستەکە بە دوور دەگرێت ململانێیەکەش بەردەوام لە نێوان کەمینەی دەستبالاّ و پرۆلیتاریا داخ لە دڵەکەدا دەمێنێتەوە. کەمینەی دەستبالاّ هیچ چارەسەرێك نە بۆ کێشەکان ناوخۆی لەگەڵ پرۆلیتاریای داخ لە دڵی (ناوەوە)دا، نە بۆ ململانێی بەردەوامی خوێناویی لەگەڵ پرۆلیتاریای دەرەکی دا نادۆزێتەوە، تەنیا بە پەلهاوێشتن و فراوانبوونی دەرەکی و دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەت نەبێ. واتا ناچارە کێشەکانی لە ڕێگەی فراوانبوونی

دەرەکی و هێز و دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتەوە چارەسەر بکات. ئیدی بەو جۆرە دەوڵەتە جیهانییەکان (universal states) لە قۆناغی لاوازبوون و بێهێزبوونی شارستانییەت دەردەکەون و پەیدادەبن. ئەو دەوڵەتانە، ئینجا هەوڵ دەدەن یەکێتیی سیاسی لەناو جەماوەری خۆیاندا وەدی بهێنن، هەروەها هەوڵیش دەدەن لە کاتی هەڵوەشاندا خەڵکەکە لە دەوری خۆیان خڕبکەنەوە و بیانکەن بەیەك. بۆچوونی پەلهاوێشتن و فراوانبوون تەنیا تەگبیری سەرۆکە سیاسی و فەرماندارە سەربازییەکان نییە، بەڵکو مەزەبگەلی فەلسەفیش بانگەوازی تێدا هەڵدەدات و لە رووی ئایدیۆلۆجیاشەوە پاڵپشتی لێ دەکات.

بەو جۆرە بەرفراوانبوون لە رێگەی جەنگەوە، هەرەسهێنانی ناوخۆ لە کۆمەڵگەدا دەردەبڕێت، هەروەهاش پەیدابوونی ئیمپراتۆریەت، بە داپۆشین و شاردنەوەی حالاتی ئاژاوە و دەمکوتکردنی جەماوەر (پرۆلیتاریا) و بێ دەنگ کردنی رق و کینەی جەماوەر لە قەڵەم دەدرێت.

هۆی سیاسیی جەنگ لەگەڵ هۆی سایکۆلۆژی دا یەك دەگرن، چونکە هەوەسی جەنگ و شەڕ، حەز و ئارەزووی کاولکاری دەردەبڕێت ئەوە ڕەفتارێکی خۆکوژییە و هەندێ کەس حەزیان لێیەتی و ئادەمیزادێکی زۆر بەرەو شەڕ لێدخوڕن و وەك قەسابخانەی پەرستاگاکان، دەیانکەن بە قۆچی قوربانی. لەگەڵ ئەوەشدا جەنگەکان لەگەڵ مێژووی شارستانییەتکاندا یەکیان گرتەوە، بەڵام ئەم یەکگرتنەوەیە، مانای ئەوە نییە، کە لەسەر ئاستی تاکەکەس یان بە دەستەجەمعی سیاسی و سایکۆلۆژی تاوانبار نەکراوە، بەڵام لەسەر ئاستی مێژوو، ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بناغەی جەنگ و شەڕ دامەزراون، سیاسەتەکەیان بوو بە هۆی قڕکردن واتا قڕکردنێکی خۆکوژی نەك مردنێکی سروشتی، هەرچەندیشە یەکەم جار سەرکەوتنی گەورەی لێ پەیدابوو، بەنموونە وەك شەڕەکانی ئیسپارتە و ئومەوییەکان و تەتار و نازییەکان. سەرکەوتنیش لە شەڕدا زمانیان زێتر شیرین دەکات، کە شەڕی زێتر بکەن، وەك ئەو پڵنگەی کە تامی گۆشتی ئادەمیزاد دەکات و لە تامی هەموو گۆشتەکانی تری پێ خۆشترە و

دەبێتە پیاو خۆر، سەرئەنجامی ئەو پڵنگەش، هەرچەندیشە خۆی لە گوڵ لابدات، بەڵام هەر بە گەڕی و گولی دەمرێت. هەروەها ئەوانەش کە هەوەسی داگیرکاری و فراوانبوون لە کەللەیان دەدات، ناتوانن شمشێرەکانیان بگەڕێننەوە ناو کالانەکانیان، گوێ بە حورمەتی گەلێکی بێوەی نادەن و بگرە لەگەڵ گەلەکەی خۆشیاندا لێبوردە نابن، بەڵام ئەگەر شتێکیشیان پێ بکرێت — بە نموونە ئەگەر بەڕم و شمشێر دەستکەوتێکیشیان دەست بکەوێت — ناتوانن بەبێ رم داسەکنێن. ئەوانەش کە دەست بۆ شمشێر دەبەن، بەشمشێر دەکوژرێن.

لەبەر ئەوە ئیمامی عەلی (ر.خ) دەڵێت:" مژدەی کوشتن، بدە بە بکوژ" — ولیان رالف ئینج —یش دەڵێت " ئادەمیزاد دەتوانێت بە زەبری خەنجەر کورسییەکی شاهانە بۆ خۆی دابین بکات، بەڵام ناتوانێت لەسەری دابنیشێت"

چوارەم: پێشکەوتنی ماددی، ڕێگای خەڵەتێنراو و سەر لێشواوییە:

بەڕای تۆینبی چاکسازی لە شێواز و ئامرازی تەکنەلۆژیای ماددیدا، بەڵگەی ئەوە نییە، کە کۆمەڵگەکە پێشکەوتووە و سەرکەوتووە، چونکە لەوانەیە ئەو شتە لە قۆناغی هەرەسهێنانی کۆمەڵگەکەشدا ڕووبدات، چونکە شێوازی تەکنۆلۆژی ئامێر و تاقیکردنەوەی ئامێر دەگرێتەوە، زەروریش نییە داهێنانی ڕوحی و هزری بگرێتەوە.

سەرکەوتن و پێشکەوتنی ڕاستەقینەی شارستانییەت ئەوەیە کە سەرکەوتن و پێشکەوتنی ڕوحی بگرێتەوە.

## پێوەندیی نێوان ئایینە گەورەکان و دەوڵەتەکان

ئەو جەنگانەی کە کەمینەی دەستباڵا، لە کاتی ئاژاوەدا هەڵیدەگیرسێنن، تۆینبی وەك باسمان کرد بە دیاردەی هەرەس و هەڵوەشانی شارستانییەت لە قەڵەمی دەدات.

خۆ ئەگەر ئەم کەمینەیە جەنگ پێشکەش دەکات، پرۆلیتاریای ناوخۆ، ئایینەکان پێشکەش دەکات. لەیەکەمیانەوە، دەوڵەتە گەورەکان (universal states) هەڵدەقوڵێت، لە دووەمیشانەوە ئایینەکان پەیدادەبن. ئایینەکان لەو یەکێتیە سیاسی

یان زمانەوانی یان شەرعاندن یان دارایی یان تۆڕی هاتوچۆی نێوان هەرێمەکانەوە پەیدادەبن و سوود وەردەگرن، چونکە ئەوانە هەمووی ڕێگای بلاّوبوونەوەی ئایینەکان خۆش دەکەن.

ئایینەکان، کە لە ماوەی ئاژاوە و پێکهێنانی ئیمپراتۆرییەکاندا پەیدادەبن، ڕۆڵی کرمۆکەکانی ناو قۆزاغەکان دەگێڕن، واتا ڕەگەزەکانی (مقومات) ژیان و داهێنان دەگوازنەوە (دەبەن) بۆ زۆر شارستانییەتی تازە. پاشان هۆی پەیدابوونی شارستانییەتەکانی نەوەی دووەم، دەگەڕێنرێتەوە سەر شارستانییەتەکانی پێش ئەو، واتا شارستانییەتەکانی نەوەی دووەم، لەوانەی نەوەی یەکەمەوە پەیدابوونە، ئینجا ئایینەکان ڕۆڵی دایك دەگێڕن.

بە نموونە، شارستانییەتی مەسیحییەتی ڕۆژهەلاّت ومەسیحییەتی ڕۆژئاوا لە شارستانییەت هێلیینی (گریك) دوە پەیدابووە و بە ڕێگەی بیروباوەڕی مەسیحییەتدا گوزەری کردووە. هەروەهاش ئایینی بوزییەکان، شارستانییەتی ڕۆژهەلاّتی دووریان لێکەوتووەتەوە. پاش ئەوەی کە ئایینی بوزی ڕۆڵی دایکیان گێڕا، واتا ئایینی بوزی (بوزییەتی مەهایانا)وەك دایك شارستانییەتی ڕۆژهەلاّتی دووری لە باوەش گرت و پێی گەیاند.

هەروەها شارستانییەتی هندی، لە شارستانییەتی سندییەوە پەیدابوو. لە ڕێگەی باوەری هیندۆکییەوە. هەرچی شارستانییەت ڕۆژهەلاّتی سەدەکانی ناوەڕاستیشە گۆشەی ئایینی ئیسلامە.

ڕۆڵی ئایینەکان هەر ئەوە نییە، کە تۆوی شارستانییەتە کۆنەکان لە باوەش بگرێت و شارستانییەتی تازەیان لیّ وەبەربێنیّ و پەیدا بکات، بەڵکو هەندیّ خەسڵەتی خۆیشی دەخاتە سەر ئەو شارستانییەتە تازانە و پاشانیش بزاڤ و چالاکیی داهێنانیان پیّ دەبەخشیّ" واتا ڕوحی تازەیان بەبەردا دەکات".

بە نموونە ڕێزگرتن لە ئیشی دەستی لە شارستانییەتی تازەی ئەوروپادا، ئەوە بەروبوومی ڕێنماییەکانی مەسیحییە، چونکە ئەو ڕێنماییانە ئیش بە فەرمانێکی بەرز

دادەنێت، لە کاتێکدا کە شارستانییەتی ئەسڵی (دایك) ئەوروپا بە چاوێکی سووك سەیری ئیشی دەستیی دەکرد، واتا شارستانییەتە هێلینییەکە، بە چاوێکی سووك لە ئیشی دەستی دەڕوانی و بە حەوانەوە و پاڵدانەوەی لە قەڵەم دەدا.

ئایینەکان لەناو پرۆلیتارییەکانەوە (جەماوەرەوە) سەرهەڵدەدات و پێویستیان بە دەوڵەتیش هەیە بیانپارێزێت تا خولی ژیانی خۆیان تەواودەکەن — هەرچەندیش کەس ئیسلامی نەپاراستووە. ئەوە بەهیچ جۆرێك مانای ئەوە نییە، کە ئایینەکان لەناو دەستەلاتدارە حوکبەدەستەکانەوە هەڵقولاّبن، یان بە ئایینەکەی خۆی بە کوتەك بەسەر مسکێنەکانیدا سەپاندبیّ.

جا لەژێر ناونیشانی "ئایا حوکمبەدەست بڕیار لەسەر ئایینی گەلی خۆی دەدات؟" تۆینبی بۆمان دەگێڕێتەوە و چەند نموونەیەکیشمان بۆ دێنێتەوە، کە ڕای خۆی دەردەخات و دەڵێت:" هەر کۆششێك بۆ سەپاندنی ئایینێك یان مەزهەبێك، بەزۆر بدرێت، نەك تەنیا هەر سەرناگرێت، هەرچەندیش بە شێوەیەکی کاتیّ سەربگرێت، بەلاّم بە کۆسپێك دادەنرێت لە ڕێگەی بلاّوبوونەوەی ئەو ئایینە یان ئەو مەزهەبەدا". ئایینی مەلیك، لە ئەسڵدا قەرزێکی مسکێنەکەیەتی لە ئەستۆی، واتا دۆخی سروشتی ئەوەیە مەلیکەکە بچێتە سەر ئایینی گەلەکەی و بڕوای بە ئایینی گەلەکەی هەبێت، چونکە هەردوو هێزی ئایین و دەوڵەتەکەش لەوەدایە، بەلاّم ئەگەر مەلیك بە زۆری کوتەك ئایینێك بەسەر جەماوەری گەلەکەی خۆیدا بسەپێنێت، ئەوە لە زەرەر زێتر هیچی تری لیّ پەیدا نابێت " هەرچەندیش، ئەو ئایینە سەپێنراوە لەگەڵ هەستی ڕاستەقینەی جەماوەرەکەدا چۆن یەك بێت، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو هێز و توانایەی نابێت کە بتوانێت دوای هەڵکردنی گێژاوەکە (زوبعە) خۆی ڕابگرێت و بمێنێت."

پاشان تۆینبی لە پایاندا، نموونەی تر دەهێنێتەوەودەڵێت: ئەخناتون هەرچەندە باوەڕێکی گەورەی هەبوو، بەلاّم نەیتوانی ئایینێکی یەکگرتووی خواپەرستی لە میسر بخولقێنێت، چونکە خۆی مەلیك بوو، بەلاّم ئەگەر ئەخناتون مەلیك نەبایە کاهین بووایە ئایینەکەی سەری دەگرت.

هەروەهاش مەئموونی کوڕی هاڕوونە ڕەشید نەیتوانی — کە وەکو دەڵێت- بەزۆر خەڵکەکە بێنێتە سەر بیرۆکەی خولقاندنی قورئان واتا نەیتوانی بیرۆکەی(موعتەزیلە) کانیان بەسەردا بسەپێنێت.

هەروەها تۆینبی لەبارەی ئامۆژگاریی یەکێك لە ڕاوێژکارانی ئیمپراتۆر "سلف الاکبر" ی مەغۆلی تەیموری (١٥٥٤- ١٦٠٥) زایینی کاتێك کە ئیمپراتۆرەکە ویستی ئایینێکی نوێ دابمەزرێنێت " کە ناونرابوو ئایینی ئیلاهی" دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئاین ئیشی مەلیك نییە و ناشبێتە ئیشی مەلیك" ئامۆژگاریشم بۆ مەلیکی گەورە ئەوەیە، کە نابێت باسی ئەم جۆرە شتانە بکەیت".

ڕۆسپییر لەسەردەمی شۆڕشی فەڕەنسادا هەوڵی دا، کە ئایینێکی نوێ بە ناوی (پەرستنی بوونەوەری بالا) بۆ فەڕەنسا دابنێت، لە جیاتی ئایینی مەسیحی، بەلام نەیتوانی و ئیشەکەی سەری نەگرت، کاتێکیش لیپۆ (Lepaux)ویستی پەرستشی "خۆشەویستی خوا و ئادەمیزاد" لە جیاتی مەسیحییەت دابنێت، تەنیا تالیران وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا، چاوەڕوانیی لێ نەکرد و هەستا و گوتی: "عیسای مەسیح لە پێناوی دامەزراندنی ئایینەکەیدا لە دار درا، بەلام لەناو مردووەکاندا دووبارە زیندوو بۆوە و گەڕایەوە، تۆش پێویستە لەسەرت ئیشێکی وەها بکەیت". ئەم نموونەیە و نموونەی دیکەش دەیسەلمێنن. کە پرەنسیپی "ئایین بە دەستی حوکمڕانە". بە شێوەیەکی گشتی گومڕاهی و خەڵەتاندن و تەڵەکەبازییە"

ئەم دۆخە، زۆر لەوە جیاوازترە کە خودی دەوڵەت پارێزگاری لە ئایینێك بکات، کە لەوەو پێش هەبوویێت و پاشان سەرۆکی دەوڵەتەکە چووبێتە سەر ئەو ئایینە و کردبێت بە ئایینی دەوڵەتەکەی. بەنموونە وەك پاراستنی ئایینی زەردەشتی لەلایەن کیسرەوییەکانەوە واتا لەلایەن خوسرەوییەکانەوە، یان بڕواهێنانی قوستەنتینی مەلیکی ڕۆما بە مەسیحایەتی. (ئایینی ئیسلامیش کێ پاراستی؟ شمشێری ئیسلام درا، لە ملی هەموو ئەو کەسانەی لە ڕێگەیدا دەوەستان، ئەندەنۆسیا و مالیزیا نەبێت).

ئەگەر ئەوە رۆڵی ئایینەکان بووبێت لە شارستانییەتەکانی رابردوودا، ئەی دەبێت رۆڵیان لە شارستانییەتە هاوچەرخەکاندا چۆن بێت، کە هیچ بواری پەیدابوونی ئایینی نوێی تێدا نەماوە؟

تۆینبی وەلاّمی ئەم پرسیارەش دەداتەوە - وێڕای ئەوەش کە یەکلای نەکردۆتەوە و، بە تەواوەتی قەناعەتی پێمان نەهێناوە — دەڵێت:" لە ڕابردوودا ململانێ لە نێوان ئایین و فەلسەفەدا هەبوو، وێڕای ئەوەش کە فەیلەسووفەکان هەندێکیان ویستیان هەردووکیان پێك بێنن" وەکو کۆششەکانی ئەفلاتوون لە شارستانییەتی گریکەکاندا، هەروەهاش وەکو کۆششەکانی (ئیبن روشد) لە شارستانییەتی ئیسلامیدا".

بەلاّم ئەم ململانێیەی ئەمڕۆ ململانێی نێوان ئایین و زانستە و کەسیش ناتوانێت پێکیان بهێنێت، بەڵکو پێویستە لێك جیابکرێنەوە بەو جۆرەی کە تۆینبی دەیەوێت، ئەوەتا دەڵێت:" پێویستە لەسەر ئایین هەموو بوارەکانی پسپۆری و تایبەت بە زانست بداتە دەست زانست، بێگومان ئەو بوارانەش گەلێ زۆر و فراوانن، ئەوەش مانای ئەوە نییە کە زانست لە جیاتی ئایین بەکاربێین و واز لە ئایین بهێنین، چونکە سەرکەوتنی زانست بەسەر ئاییندا، بەلاّیەك بۆ هەردووکیان پەیدا دەکات و ئاسەواری گەورەی بۆ هەردووکیان لێ دەکەوێتەوە.

گەورەترین کارەسات کە ئەمڕۆ هەموو جیهان ڕووبەڕووی بۆتەوە، ئەوەیە کە جەماوەر — نەخاسمە لە ڕۆژئاوا — لە جیاتی پەیدابوونی بۆشایی ئایینی، خۆیان بە مەزهەب و" ئایدیۆلۆژیا" گەلێکەوە خەریك دەکەن و بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی بەکاربردن و تێرکردنی غەریزەی خۆیان هانای بۆ دەبەن، کە لە رووی بتپەرستییەوە لە رووی تاکپەرستییەوە هیچی لە ئایینە سەرەتاییەکان کەمتر نییە، وەك تۆینبی دەڵێت: هەرچەندیشە خۆی لەژێر پەردەی بریقەدار و شاردبێتەوەو، لە شێوەی "بە ئیلاهکردنی تاکی فانی" دا خۆی دەربخات.

تۆینبی، بەهەڵەیەکی گەورەی دادەنێت مەزهەبە دنیەوییەکان لە جێگەی ئایینەکان دابنرێت و دەڵێت: تێگەیشتنی ئادەمیزاد لە قانوون و ڕێساکانی سروشت و

کۆنترۆڵکردنیان گرنگیی بەلای ئادەمیزادەوە زۆر کەمترە لەوەی، کە لایەنە ڕوحییەکەیان لە خودی خۆیدا دەوڵەمەند بکات.

ئەوەش کە ئەمڕۆ ئێمە دەیڵێین، بریتییە تەنیا لە قسەکانی سوکرات کە پێش دوو هەزار و چوارسەد ساڵ، کاتێك کە وازی هێنا لە لێکۆڵینەوەی گەردوون و دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەی ناو دڵی ئادەمیزاد و بە دوای وزەی نادیاری ناویاندا دەگەڕا، ئەوەبوو قسە بەناوبانگەکەی خۆی کرد و، وتی:" خۆت چاك بناسە".

ئەگەر ئایین نەبێت، نە ئاسایش بەرپادەبێت و نەئادەمیزادیش دڵنیا دەبێت. مێژوویش دەبێتە " چیرۆکێکی بێ مانای بێ سوود، کابرایەکی کە مفام دەیگێڕێتەوەو هیچی تر". بەلاّم ئەم شتە بێ مانایە، کاتێك کە ئادەمیزاد کاری یەك خوداوەند دەدۆزێتەوە، ئەو شتە بێ مانایە، مانایەکی ڕوحی لە خۆدەگرێت.

## کاتێ کۆمەڵگە، ڕێگەیەکی نەهات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فشارێکی شارستانییەتی دەسبالاّ هەڵدەبژێرێت:

یان کۆمەڵگەیەك، چۆن چۆنی لە دژی بێباکییەکی دەوڵەتێکی هاوسێ هەڵسوکەوت دەکات، کاتێ ئەو دەوڵەتە هاوسێیە بیەوێت لەسەر حیسابی خاکی ئەو ئیمپراتۆرییەت دروست بکات؟ یان ئەو کۆمەڵگەیە چۆن چۆنی بەهێزی ماددی یان تەکنەلۆژی لە ڕووی فشاری شارستانییەتی دەستبالاّدا دەوەستێتەوە؟

تاکەکەس، چۆن چۆنی ڕووبەڕووی فشاری واقیع دەبێتەوە؟ تۆینبی دەڵێت: دەبینین کە تاکەکەس لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، کاتێك کە لووتی بە شێوەیەکی بەهێز بەر واقیعێك دەکەوێت، هاوسەنگی لە گیانیدا نامێنێت و بەرەو هەرەسهێنان دەچێت و هیچی بە دەستەوە نامێنێت لەوە زێتر، کە یەك لەم دوو هەڵوێستەی خوارەوە پەیڕەو بکات. ئەو بەرکەوتنە شۆکە واتا (کار) ەکە، هەتا زێتر بەهێزبێت " کاردانەوەکە" "جەمسەرگیرییەکە" بەهێزتر دەبێت. هەڵوێستی یەکەم مۆرکی نەرێنی "قبووڵ نەکردن" لەخۆدەگرێت، بە کورتی بریتی دەبێت لە جیابوونەوە لەو واقیعەی کە هەیە و

خۆی لێ دادەماڵێت و بەوە ڕازی دەبێت لە یادەوەرییە خۆشە ڕابردووەکانیدا بژی و بەوە دڵی خۆی بداتەوە و قەرەبووی ئەو ترش و تاڵی و ئازارە بکاتەوە، کە لەو واقیعە ناهەموارە تووشی بووە، بەڵام هەڵوێستی دووەم، ئەوە مۆرکی ئەرێنی (گوێڕایەڵی) لە خۆدەگرێ، کە ئەو کەسە هەوڵ دەدات لەگەڵ تەوژمەکەدا بڕوات و گوزەرانی لەگەڵ دا بکات و بەسەریدا سەربکەوێت، واتا ئەو تاکەکەسەی کە ڕەفتاری تاك و تەنیایی هەیە، هەست بە خەتا و گوناهێك دەکات و لەژێر کاریگەریی ئەو هەستەدا پەنا دەباتە بەر حاڵەت یەکەم، کەچی ئەو تاکەکەسەی ڕەفتاری کرانەوەی هەیە، ئەو بەشێوەیەکی ئاسایی پەنا دەباتەبەر حاڵەتی دووەم، چونکە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی واقیعەکە و ناچارە نۆشی بکات، "واتا بارودۆخەکە قبوول دەکات، وەك هەنگاوێك بۆ ئەوەی پاشان بەسەریدا زاڵ ببێت".

حاڵەتی یەکەم، حاڵەتی خۆداماڵینە لەوەی کە ئێستا هەیە و خۆ لە قاپوورنانی ڕابردووە، وەلێ حاڵەتی دووەم، حاڵەتی دەستپێشخەرییە و خۆهەڵدانە بەرەو دواڕۆژ و ئایندە بە هەر نرخێك بێت. ئەوەیە حاڵەتی تاکەکەس کاتێك کە تووشی فشارێك دەبێت، لە ئیرادە و ویستی خۆی بەهێزتربێت.

**٢- کۆمەڵگە:**

مەسەلەکە، بۆ شارەستانییەتێك کە بەرەو لێژی بڕوات، هیچ فەرقی نییە واتا کاتێك شارەستانییەت ڕووبەڕووی شارەستانییەتێك لەخۆی بەهێزترو لەخۆی باڵاتر دەبێتەوە، ئەوا گوێڕایەڵییەکەی بۆ فشار (بێمنەتی) بە یەك لەم ڕێگەیەوە دەڕوات، کە هەردووکیشیان هەڵەن:

١- ڕێگەیەکیان، ڕێگەی گوێڕایەڵیی نەرێنییە، کە لە هەواو هەوەسی سەلەفیدا (Archaism) ٢٥٩ خۆی دەنوێنێت.

---

٢٥٩_ سەلەفییەت Archai القدمیە: بەکارهێنانی شێوازی وازلێنراو، تۆینبی ئەو ڕێچکەیە ناو دەنێ زیلۆتێسم zealotism کە لە ناوی دەستەیەکی جولەکەکان

٢- ڕێگەیەکیشیان، ڕێگەی گوێڕایەڵیی ئەرێنییە، کە لە هەوا و هەوەسی هەڵمەتی ئایندەخوازی دا (futurism) ٢٦٠ خۆی دەبینێتەوە.

هەرچی سەلەفییەتە ئەوە وەك تۆینبی دەڵێت:پەلامارێکە، بەڵام بەرەو پاشەوە قەڵەمبازێکەوە بەسەر تەوژمی واقیعدا بەرەو دواوە، قەڵەمبازێکە بەرەو ڕابردوو، بە بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستی دادەنرێت، کتومت لە مەلەوانێك دەچێت کە بە پێچەوانەی تەوژمی ئاوەکە مەلە دەکات.

---

وەرگیراوە کە زۆر بە توندی دەست بە رابردووەوە دەگرن، ئەوانە بۆ بەرەنگاربوونی تەوژمی شارستانەتیی هێلینی لەسەر ئاییني جوولەکەکان زۆر خۆپارێزانە لە قاوغی باوەڕی ئاییني خۆیاندا گیربوون. ئێستا وشەکە، وشکەڕوویی و پێشینان پەروەری دەگەیەنێ.

٢٦٠_ ئایندەخوازی_Futurism لمستقبلیە: تۆینبی ناوی لەم ڕێچکەیە ناوە هیرۆدیانی Herodianism. ئەم هیرۆدە فەرمانڕەوایەکی ڕۆمانەکان بوو لە هەرێمی جەلیل لە ئیسرائیل (فەلەستین) لە ساڵی (٤٧) ی پێش زایینیدا. ویستی دڵی سەرۆکەکانی و ئیمپراتۆر یۆلیۆس قەیسەر رابگرێت. و لەلایەکی تریشەوە جوولەکە لە خۆی رازی بکات، بەوەی هات سەرلەنوێ پەرستگاری دروست بکاتەوە، بەڵام زیلۆتییەکان (کەللەرەقەکان) سیاسەتەکەیان پەسەند نەکرد دوای ئەوەی شانۆیەك و یاریگەیەکی ڕۆمانی لە شاری قودس (ئورشەلیم) دروست کرد. وشەکە دەستنیشان کردنی شێوە گۆڕین و چەند رەنگییە، یان هاوتاگەری و گونجاندنی نێوان دوو شتی، ناکۆك بە زۆرە.

بزووتنەوەیەکی بەرەو پاشەوەی موستەقبەلییەو خۆکوتانێکە بەرەو پێشەوە بەبێ ڕەچاوکردنی سروشتی قۆناغەکە چیی دەوێ و چیی ناوێت، هەردووکیشیان بەئومێدی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەك لەوواقیعەی ئێستا باشتربێت، بەلاّم هەردووکیشیان دەیانەوێت لە مێردەزەمە و سەرئێشەی واقیع خۆیان دەرباز بکەن، بەلاّم چۆن؟ دەیانەوێت بە پەلە بەسەرکات و زەمەندا بازبدەن، بەلاّم جێگەکە بە شێوەیەکی نەگۆڕ بهێڵنەوە !

هەروەك تۆینبی دەڵێت:- ئەوانە دوو هەوڵن بۆ ڕاکردن و خۆخەشاردان لە ئێستایەکی پڕ ئێش و تەنگەبەر، کە بەسەریدا باز بدەن بۆ ماوەیەکی دیکەی تەوژمەکە بەبێ ئەوەی واز لە ژیانی سەر ئەم زەمینە بهێنن.

لەتەوژمی یەکەم، سستی و بە بەردبوونی ئاوەدانی دەکەوێتەوە و لە تەوژمی دووەم، دامەزراندنی شارەستانییەتی چاولێکراو دەکەوێتەوە.

ئەمە هەر لە بۆچوونەکەی شپینگلەر دەچێت، کە ئەم جۆرە شارەستانییەتەی ناو نا "پێکهاتنی (درۆزنانەی شارستانییەت).

سەرجەم، قسەکانی تۆینبی ئەوەیە، کە ئەم دوو هەوا و هەوەسە هەردووکیان هەواو هەوەسی کاولکارییە، چونکە هەردووکیان "گوێڕایەڵییەکی " نادروستن سەرەنجامیش ناتوانن قانەعەتێك پەیدا بکەن بتوانێت لە ڕووی "بێ منەتی " دا خۆی رابگرێت.

ئەوانەی بەرەو پێش دەڕۆن و خاکی خۆیان لە فشاری هێزێکی دەرەکی رزگاردەکەن، جا چ لە شێوەی سەلەفیی غەزریو، چ لە شێوە پێکهێنەرە موستەقبەلییەکان،مادامێکی هیچ چارەسەرێکی ڕیشاژۆیان پێ نییە، کەواتە کۆمەڵگە چۆن چۆنی دەتوانێت سەربکەوێت؟ ئەی گوێڕاڵییەکەی دژ بە بێمنەتی چۆن سەردەکەوێت؟

## پەیدابوونی سەرکردەی داهێنەر" فەرمانداری(مێژووکرد)"لە گوێڕایەڵیی (وەلامدانەوەی) مێژووکردیش دەردەکەوێت

بەرزبوونەوەی ڕاستەقینەی کۆمەڵگە — بەڕای توێنبی تەنیا تاکە کەسێك یان کەمینەیەکی داهێنەر، کە خەڵکانی گشتیی پرۆلیتاریا دەیکات، کە ڕۆڵی ئەویش ڕۆڵی چاولێکەرییە، ئەو بەرزبوونەوەیەش وەکو هەڵمەتێك و بازێکی بەرەو پێش وەهایە، ئەوەش تاقەناعەت بەبزووتنەوەکە ڕوونەدات ناکرێت.

یان ئەوەتا بۆ بزووتنەوەکە ئامادەباشی هەیە ئەو کەسەش کە دنە و گاڵی بزووتنەوەکە دەدات، کەسێکە بە شێوەیەکی بەردەوام — وەك فەیلەسووفی فەڕەنسایی — هــ.ل. بیرگسۆن H.L.Bergson، ١٨٥٩- ١٩٤١- خاوەنی بیرۆکەی (چالاکی vitalism وەها دەزانێ کە ئەو کەسە داهێنەرانە، ڕەوشی کۆمەڵگەکەی خۆیان بەرەو پێشەوە دەبەن، لە ئادەمیزاد گەورەتر و بالاترن، دەشتوانن ئیشی وەها بکەن، کە خەڵك بە موعجیزەی بزانێت، چونکە ئەو کەسانە خودی خۆیان چاکترین ئادەمیزادن یان سوپەر مانن (superman)یان لە ئادەمیزاد گەورەترن (واتا لەسەر و ئادەمیزادەوەن) هەر بە حەقیقەت نەك بە هەوەس.

بێرگسۆن دەڵێت: هەروەکو چۆن ئادەمیزادە بلیمەتەکان بۆ ئەوە دانراون، کە سنووری عەقڵی ئادەمیزاد گەورەتر بکەن. ئاوەهاش هەندێ کەسی بەهرەدار پەیدابوون، هەستیان کرد کە پێوەندییان بە روحی هەموو ئادەمیزادەکانەوە هەیەو لە جیاتی ئەوەی لە سنووری کۆمەڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و لە چوارچێوەی ئەو یەکگرتنە کەمەدا، کە سروشت پێکی هێناوە، قەتیس بخوات، نامەیەکی بەهێزی خۆشەویستی بۆ هەموو ئادەمیزادەکان بلاوکردەوە.

هەروەها پەیدابوونی ڕوحێك ئەم ڕوحانە، وەك خولقاندنی جۆرێکی تازە وەهایە کە بریتییە لە تەنیا یەك کەسی دەگمەن . ئەم کەسایەتییە داهێنەرە بەردەوام بەرەو پێش

پاڵ دەنرێت بۆ ئەوەی برادەرەکانی خۆی، لە ئادەمیزادەوە بگۆڕێت و بیانکات بە ئەسحابەی داهێنەری — وەك خۆی — بۆ ئەو کارەش بە چەشنی شێوەی خۆی دەیانخولقێنێتەوە.

ئەوانە بلیمەتن، دەتوانن بەسەر کەموکورتیی خودی کۆمەڵگەکەیاندا سەربکەون. هەموو کردارێکیش داهێنانا بێت. ئەوە کردارێکی ڕەسەنە و هی تەنیا تاکە کەسێکە، داهێنانی کۆمەڵایەتیش ئەوە لە ئەنجامی ئیشی تاکەکەسی بلیمەت یان کەمینەی بلیمەتدا پەیدا دەبێت. هەرچی زۆرینەی گەلە، ئەوە لە داهێنان بەتاڵە و ڕۆڵیش تەنیا ئەوەیە، کە گوێ بگرێت و چەپڵە لێ بدات و سەر بۆ کەمینەی داهێنەر شۆڕ بکات و بە گەورەی خۆی دابینێت و دان بە بەرزی و باڵاییدا بنێت. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو جەماوەری پرۆلیتاریا لە دۆخی ژیانی سەرەتاییەوە نزیك دەبێ، پێش ئەوەی ئەو وزە گەورانە بە هیمەتی بلیمەتەکان بتەقنەوە، کاتێکیش کە تەقینەوە ئەوجا پرۆلیتاریاش بە کۆششی یەکسانی یان چاولێکەری بەرز دەبێتەوە ئینجا تۆینبی دەچێتە سەر بابەتی لێکۆڵینەوەی ڕۆڵی ئەو تاکەکەسە بلیمەتانە لە کۆمەڵگەکەی خۆیاندا دەیگێڕن بۆ ئەوەی گوێڕایەڵیی دروست و سەرکەوتوو بۆ بێمنەتییەکان وەدی بهێنن و کۆمەڵگەکە بگاتە پلەیەکی بەرزی شارەستانییەت و هزر، کە لەوە پێش بەخۆیەوەی نەدیبوو.

تۆینبی ڕایگەیاند کە ڕێگای ژیانی ئەو دەگمەنانە نەخاسمە پێغەمبەرەکان بە دوو قۆناغدا ڕۆیشت:-

١- قۆناغی تەنیایی و گۆشەگیری:

ئەم قۆناغە کە بلیمەت (تاکەکەسی دەگمەن) پێیدا دەڕوات، قۆناغێکی پێویستە بۆ دەوڵەمەندکردنی ناوەوەو ڕۆشنکردنەوەی روحی خۆی دوور نییە، خۆی ئەم تەنیا بوونەی پێ خۆش بێت، بە حەز و ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردبێت ویستبێتی لە کۆمەڵگەکەی خۆی دووربگرێت و بۆ ئەوەی دەرفەتی پێگەیاندنی وزە و بەرزبوونەوەی روحی خۆی بۆ بڕەخسێت و لەوێ لەو دووره پەرێزە لە تەوژمی نەخۆشیی

کۆمەڵگەکەی کە لە خولی هەڵوەشاندایە دوور دەبێت و لەوێوە دەتوانێت بە وردی و لەسەرخۆ و بەبێ پەلە چاوی لە کۆمەڵگەکەی خۆی بێت، بەو بارودۆخەش دەڵێن " غەوارەیی expatriation.

لەوانەشە تەنیایی بەسەر بلیمەتەکەدا بسەپێت و ناچار گۆشەگیر ببێت، سا بە هەر حاڵ ئەم تەنیاییە لە هەردوو حاڵەتەکەدا، بۆی دەبێت بە دەرفەت و لەوانەشە مەرجێك بێت لە مەرجە پێویستەکانی دەرکەوتن و پەیدابوونی دەروێشی گۆشەگیر (Anchorite) ئەو تەنیاییەش ئامانج نییە، بەڵکو ئامرازێکە بۆ گۆڕران بەرەو سەرکەوتن. لەبەر ئەوە پێویستە حاڵەتێکی کاری ئەرێنیی لە قۆناغێکی دوای ئەودا بەدوادا بێت.

٢- قۆناغی هاتنەوە (گەڕانەوە):

لەم قۆناغەدا ئادەمیزادەکە دێتەوە ناو کۆمەڵگەکەی. ئەم هاتنەوە و گەڕانەوەیەش بە گشتی جەوهەری بزووتنەوەیەکە و هۆی نادیاری مەسەلەکەیە. کابرای خۆیەبەرز (المتسامی) دەگەڕێتەوە و بانگەواز بۆ بەهاگەلی بەرزی نوێ هەڵدەدات و داوا لە خەڵکی کۆمەڵگەکەی دەکات خۆیان بگۆڕن و چاك بن. پرۆلیتاریاش باوەڕ بە سەرکەوتنەکەی دەکات و چاوی لێ دەکات. ئەوەتا ڕەوشتی پێغەمبەران ئەوەمان نیشان دەدەن، ئەوەتا موسا بانگهێشت کراوە، سەرکەوتە سەر چیاکە بۆ دیتنی خوای خۆی، ئەویش فەرمانەکەی قبووڵ کرد و بە دەنگییەوە چوو، پاشان لە چیاکە دابەزی و چەند لەوحەیەکی بە دەستەوە بوو، شەریعەتەکەیان تێدا نووسرابوو. یەکەم شەریعەتی ئاسمانی لەسەر ئەم زەمینە ئەوەبوو، کە مژدەی ئایینەکەی (الناموس)ی بە گوێی خەڵکدا هەڵدا. (خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان بە جبرائیل دەڵێن ناموس) هەروەها بوزا حەوت ساڵ تەنیایی چێشت هەر بیری لە ئێش و ئازاری خەڵك دەکردەوە و ئاواتی ڕزگاربوونی بۆ دەخواستن پاشان دوای ئەوەی بە قۆناغی ڕۆشنکردنەوەی ناو روحی خۆیدا تێپەڕی، ئەوجا هاتەوە و گەڕایەوە بۆ ناو کۆمەڵگەکەی خۆی.

## خۆ دوورخستنەوە لە واقیع

مەسیحیش (د.خ) دوای ئەوەی لە چەمی ئوردون، لە فەلەستین غوسڵی کرد، ناچار ڕای کرد و چوو بۆ میسر، لە میسر کەوتە گۆشەگیری پاشان گەڕایەوە بۆ نیشتیمانی خۆی، بەڵام گەڕانەوەیەکی قارەمانانەی ڕزگارکەر، کە هەموو جەماوەری نیشتیمانەکەی، وەك ڕزگارکەر، پێشوازییان لێ کرد، خاتمی ئەنبیا، واتا پێغەمبەر نێردراوی نازداری خودا (د.خ) قۆناغی خوداپەرستیی لە ئەشکەوتی حەرا تەواوکرد، پاشان بە مژدەی بانگهێشتی ئیسلامەتییەوە گەڕایەوە ناو قەومەکەی خۆی.

ئەو دوو قۆناغە کە پێغەمبەران و پیری (القدیسون) پێیدا تێپەڕبوون،لەوانەیە کەسانی تری پێشەنگ و خاوەن ئیلهامی سیاسەتمەدار و بیرمەندیش پێیدا تێپەڕبن. وەك ئەوەی ئیمام غەزالی و ماکیاڤیللی و دانتی وئیبن خەلدون. بە نموونە ئەو دوو قۆناغە لەوانەیە تەنیا تاکەکەسان نەگرێتەوە، بەڵکو شار و میرنشینەکانیش دەگرێتەوە و هەمان ڕۆڵ دەگێڕن تا ڕۆڵی پێشەنگ لە شارستانییەتدا پەیدابکەن. بە نموونە ئەسینا لە گۆمەڵگەی هێلینیدا. هەروەها ئیتاڵیا دوای ڕووخانی شارستانییەتی ڕۆمانی بۆ ئەوەی ببێت بە پێشەنگی چاخی ڕێنیسانس ،هەروەهاش لە شارستانییەتی ئیسلامیدا لەگەڵ ڕۆڵی گەورەی فارسەکان لە شاری بەسرە لە خوارووی عیراق.لە ماوەی بەرزبوونەوەدا شارستانییەتەکان بە پێز و جۆراوجۆر دەبن و بەرزبوونەوەکە تەنیا یەك دیاردە ناگرێتەوە، بە نموونە وەك دیاردەی ئایین ئەگەر داهێنەرەکە (ڕزگارکەرەکە) نێردراوی خودا بێت، بەڵام ئەو وزەیەی کە دەیتەقینێتەوە هەموو دیاردەکانی (ئایین و زانست و هونەر و فەلسەفە و ئەدەب و شتی تری) شارستانییەتیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەم بەرزبوونەوەیە بێ گومان لە ناو ئەم دیاردانەدا چۆنیەك نییە، بە نموونە، وەك هونەر لە شارستانییەتی هێلیندا، وەك ئایین لە شارستانییەتی سندیدا، وەك داهێنانە ماددییەکان لە شارستانییەتی نوێی ئەورووپادا

(ئەی، شارستانییەتی ئیسلامی، لە کوێ ما؟).

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کە (گوێڕایەڵیی سەرکەوتووانە) وەك ڕەفتارێکی سایکۆلۆژی بەلای تۆینبییەوە ئامانجی ئەوەیە، روح و هزری کۆمەڵگە کە بەرزبکاتەوە و لە ڕەفتاری دەرەکیی غەزاو داگیرکردن یان چاککردنی تەکنەلۆژیادا دەرناکەوێت گوێڕایەڵیی دەشتەکییانەی (دەرەکی) بە بەشێکی زۆر کەم نەبێت، لە شارستانییەتدا بەشدار نابێت، بەڵام گوێڕایەڵیی خۆبەخۆ (ناوخۆ) بەشێکی گەورەی لە شارستانییەتدا دەبێت، چونکە لە ئەسڵ و رەسەنی دا بریتییە لە بەرزکردنەوە وزەی روحی و هزریی کۆمەڵگەکە تا ئەوپەڕی بالآیی کە بگونجێت و بلوێت.

## ڕەخنە لە بیروبۆچوونەکانی تۆینبی

وێڕای ئەوەش کە لەبارەی پێگە و جێگەی ئەم بیرمەندە گەورەیە قسەی باش گوتراوە، وەلێ بەر ڕەخنەی جۆرەها بیروبۆچوونی هزری کەوتووە و ڕەخنەکان گەلێ لایەنی جۆربەجۆری بەرنامەڕێژی و مێژوویی و فەلسەفی و ئایینی و سیاسیی تۆینبی گرتووەتەوە و بە وێنەی هەر بیرمەندێکی گەورە گفتوگۆی لەسەر مەسەلەی ترسناك و گەورەکان کردبێ، تۆینبیش بێ ئارەق دەرنەچووە.

ئەوەتا پیتەر گیا(pitter Geyl) و و. هـ.وولش(W.H.walsh) هەردووکیان ڕەخنە لە تۆینبی دەگرن و دەڵێن: بەرنامەی تاقیکردنەوەی زانستی لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا، بە خراپی بەکارهێناوە و بە باشی تەتبیقی نەکردووە. دەڵێن تۆینبی لە دیاردەکانی مێژوو تەنیا ئەو نموونانەی هێناوەتەوە کە لەگەڵ گریمانەکانی خۆیدا دەگونجێن و بەڵگەکانی خۆیشی بەجۆرێك هەڵبژاردووە، کە لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیدا یەك بگرنەوەو، بەجۆرێکی گونجاو لەگەڵ ئەو بیرۆکە گشتییە حازر بەدەستەدا، کە لێوەی دەستی پێکردووە لێکی داونەتەوە. وێڕای ئەوەش کە تۆینبی دان بە

دروستیی ڕەخنەکانی (پیتەر جیل) دا دەنێت، بەڵام قسەکانی تۆینبی نابنە بیانووی ئەوەی کە لە مەرجەکانی بەرنامەی تاقیگەیی لابدات.

مادامێکی لێکدانەوەکانی تۆینبی لەوەوە دەردەچێت، کە گوایا ئارەزووی خوداوەند لە سروشتی ڕووداوەکانی مێژوودا دەستی هەیە، کەواتە لێکدانەوەیەکی لاهوتییە، هەر لەبەر ئەوەشە کە بای داوەتەوە بۆ سەر ڕوحانی و لەسەر ڕوحانییەت سوورە و پێ دادەگرێت. ئەم لێکدانەوەیەی تۆینبی لە هیچ حاڵەتێکدا بە لێکدانەوەی زانستی بە مانای تاقیکردنەوەی بەرنامەی لێکۆڵینەوە و قانوونەکانی دروست نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی تۆینبی لە لێکدانەوەدا بیرۆکەیەکی مەسیحی ئاسایی نییە:" واتا بیرۆکەی چاودێری ئیلاهی نییە و لێکدانەوەی ئایینی نییە" واتا ئەو "سکالۆژییە نییە، کە قەشە ئۆگستین (s.t.Augustine ٣٥٤-٤٣٠ ). یان: فۆن شلیگڵ (schlegel ١٧٧٢ -١٨٢٩) و رینولد نیبور (Ncebuhr ١٧٧٦- ١٨٣١ ) بە نموونە، دانیان پێداناوە، جا لەبەر ئەم سووربوون و پێداگرتنە و تۆینبی لەسەر لایەنە ڕوحییەکان، نووسەران تۆمەتباریان کرد بەوەی، کە لە ڕوحی زانستی لێکدانەوەی ئابووری لایداوە و گوتیان ململانێی چینایەتی لە نێوان موڵکداران و کارگەراندا هەیە، لەبەر ئەوەش کە تۆینبی ڕقی لەم جۆرە لێکدانەوەیە، لێکۆڵەری مارکسی ی. کوزمنسکی (Y.Kosminski) ڕەخنەی لێدەگیرێت و دەڵێت: تۆینبی گوێی نەداوە بە پێکهاتەی چینایەتیی کۆمەڵگەکان، کە لە کتێبەکەیدا باسی کردووە، هەروەها ئەو گۆڕانکارییانەشی باس نەکردووە، کە بەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا (وسائل الانتاج) هاتووە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ڕۆڵی داهێنەری جەماوەر و کاری ئەو ڕۆڵەشی ئینکار کردووە و ئەو ڕۆڵەشی تەنیا لە شوێن پێ هەڵگرتنی دەستەبژێرە ڕۆشنبیرەکاندا" لە شوێن پێ هەڵگرتنی هەڵبژاردە داهێنەرەکاندا" هێشتووەتەوە، ئینجا کۆمەڵگە بەرەو بەرزبوونەوەی شارستانییەت تەکان دەدات.

بەو جۆرە تۆینبی پێوەندیی چەوساندنەوەی نێوان ئەو دوو چینەی باس نەکردووە. لەبارەی ڕۆڵی (بەرچاوی تاکەکەسی / قارەمان)یش — کوزمنسکی- ڕەخنە لە

هەڵوێستی تۆینبی دەگرێت و دەڵێت: تۆینبی تاکەکەسی مەزنی بەهێزی بزوێنەری پەرەسەندنی کۆمەڵگە و دروستکاری راستەقینەی مێژووی داناوە، نەك گەل، تاقیکردنەوەی ناوەوە (زاتیی) ی ئەو تاکەکەسانە، مەرکەزی وزەی داهێنانیانە سا ئەو پیاوانە پێغەمبەر بن، یان سیاسەتمەدار بن. یان سەربازی بن، یان فەیلەسووف بن، یان سۆفی بن هیچ فەرقی نییە. لێرەوە، تۆینبی لەگەڵ تۆماس کارلایل ThomasCarlyl کە لە کتێبەکەی خۆیدا (قارەمانەکان و پەرستنی قارەمانێتی Heroes and Hero-worship )یدا چەند پێشنیاز و بۆچوونێکی داناوە، بەلاّم دەمێکە پەناگیربووە و وەختە لە چاوی لێکۆڵەرەکانی مەسەلەی مێژوو بزر ببێت، فەرقێکی زۆری نییە، هەر لەبەر ئەوەشە تۆینبی بڕوای بە بیرۆکەی (پێشکەوتن) لە مۆرکە جیهانگیرییەکەیدا نەهێنا، کە لە سەدەی هەژدەم و نۆزدەمدا هەموو ئەوروپای گرتەوە و تەئکیدیشی کردەوە، کە خولەکانی شارستانییەتی هەر بەرەوژوور پێش دەکەوێت و بەبێ ئەوەی بوەستێت وەك ڕەوڕەوەیەکی خولاوە دەڕوات.

بەلاّم تۆینبی رایگەیاند کە مەبەست لە سەرکەوتن و پێشکەوتن تەنیا لایەنە ماددییەکەی نییە و لایەنی روحیشی پشتگوێ نەخستووە. ئادەمیزاد توانیویەتی شتی نائادەمیزادیش کۆنترۆڵ بکات، واتا شتی سروشتیش کۆنترۆڵ بکات- بەلاّم بەڕای خۆی لە شتی ئادەمیزادیدا زۆر پێش نەکەوتووە.

پاشان ئەم دواکەوتنە ترسناکە لایەنی روحیی گرتەوە، کە لە پێوەندیی نێوان خۆی و خوای خۆیدا دەردەکەوێت. ئەگەر بە لایەنی ماددییەکەی بەراوردبکرێت.

رەخنەیەکی تر کە لە تۆینبی دەگیرێت. ئەوەی پاتریك گاردنەرە ( Patrick Gardner) گاردنەردەڵێت: هەڵوێستی تۆینبی لە چارەنووسی شارستانییەتی رۆژئاوا، یەك بار نییە و لێك ناچێت، ئەو هەڵوێستە نالەبارەشی پێوەندیی بە بیرۆکە مێژوویییە گشتییەکەیەوە هەیە. جاری وەها دەبێت، دەبینین لە بۆنە و جێگایەکی زۆری کتێبەکەیدا باسی شارستانییەت دەکات، هەوا دەزانێت کە تەنگانەیەکە و وەختە بپروخێنێت و بەرەو هەڵدێرو کەوتن و هەڵوەشان، بڕوات. جاری وەهاش دەبێت

دەبینین ئەو قەوانە دەگۆڕێت ونایەوێت بگاتە ئەم جۆرە ئەنجامە پڕ ئێشە و حوکمی مردن بەسەر شارستانییەتی رۆژئاوادا بدات و دەڵێت : رەنگە خودا ئەم کەوتن و مردنە دوابخات و لە خوا دەپاڕێتەوە و پەشیمان دەبێتەوە لەو تێوەگلانەی رۆژئاواییەکان کە بەرامبەر بە شارستانییەتەکەی خۆیان و ئایینی خۆیان و بەرامبەر بەخۆیان تێوەگلاون (!) گاردنەر بڕوای وایە، بەشەکانی دواوەی کتێبەکەی تۆینبی دوودڵییەکی ئاشکرا و نالەبارییەکی گەورەیان دەربارەی ئەم مەسەلانە تێدایە.

ئەم جۆرە رەخنەیە لەوانەیە کەموکوریی بەرنامەڕێژیی فەلسەفەی تۆینبی دەربڕێت ، نەك زۆرتر راڕایی خودی تۆینبی دەربارەی چارەنووسی شارستانییەتی رۆژئاوا دەربڕێت. لەوانەشە گرنگترین رەخنەی مەوزوعی کە لە تۆینبی دەگیرێت لەسەر ئەو ناچوونییەکی و جیاوازییەی بێت، کە لەنێوان بیرۆکەی ئازادیی ویست بەگەلکردن(هەڵبژاردن) ولەنێوان بەڵگەهێناوە لەسەر زۆرەملێیی (الجبر) لە بزووتنەوەی مێژوودا دەری دەبڕێت. ئەم هەڵوێستە دووفاقییە و دوولایەنە لە هەڵوێستی ئەو کەسە دەچێت، کە بەڵگە لەسەر زۆرەملێیی (الجبر) دێنێتەوە و پاشان لەبەر هۆی دەروونی، لایەنی سەرپشکی (الاختیار) دەگرێت. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە کتێبەکەی تۆینبی زنجیرەیەکی زۆر بەڵگەی ئەوەی تێدایە، شارستانییەتەکانی رابردووی جیهان، چەندە بەهێز و گشتگیریش بووبن و چەندیش بەتەمەن بووبن. بەلأم ئەنجامی حەتمی و کۆتاییان هەر مەرگ بووە و نەماون. ئەو شارستانییەتانە نەیانتوانیوە مانەوەو تەمەندرێژی بۆ خۆیان هەڵبژێرن و بەسەر کۆسپەکاندا تێپەڕبن و دوارۆژ زامن بکەن، بەلأم کاتێك باسی چارەنووسی شارستانییەتی رۆژئاوا لە تۆینبی دەپرسن ،لە وەلأمدا دەڵێت کە : دەرگای دوارۆژ لەبەردەمیدا کراوەتەوە و ئومێدیش وایە بمێنێت و مێژووی رابردووش قەت و قەت پێمانی نەگوتووە، سبەینێ چی روودەدات.

رەنگە بەپێی ئەو شوناسییە کەمەی کە لە سەر هزری تۆینبی هەمانە. بتوانین ئەم کێشەی دووفاقی و دوولایەنییەی بەرامبەر بە شارستانییەتی رۆژئاوا چارەسەر بکەین. هەڵوێستی رەشبینیی تۆینبی بەرامبەر بە شارستانییەتی رۆژئاوا دوای کۆتایی

جەنگی یەکەمی جیهانی و پێش هەلایسانی جەنگی دووەمِ خستییەڕوو، کە ئەوەبووِ لە بەشەکانی پێشەوەی لێکۆڵینەوەکەیدا ئاگادارییەکی بە روحێکی رەشبینیەوە دەربارەی چارەنووسی شارستانییەتی رۆژئاوا بلاوکردەوە، بەلاّم لەبەشەکانی کۆتایی کتێبەکەیدا دوای ئەوەی کە هەلّوێستی ئەوروپا و هزری ئەم پیاوەش ، هەردووکیان پێشکەوتن و گۆڕان. ئەویش هەلّوێستی خۆی گۆڕی. جا لەبەر ئەوەی کە تێکەلّییەك لەنێوان ئایین و شارستانییەتدا لەلای ئەم پەیدابوو، کەوتە بەر رەخنەی گەورەو ترسناك . تۆینبی پەیدابوون و سەرکەوتنی شارستانییەتی لە چوارچێوەی پەیدابوونی ئایینەکاندا قەتیس کرد و دەیگوت پێویستە ئایینێکی تازە پەیدابیێت بۆ ئەوەی لە زەمەنی شلّەژاویی شارستانییەت رزگارمان ببێت، کە ڤیکۆ(G.B.vico) ش بە دوو سەدە بەر لە تۆینبی. هەر ئەو قسەیەی دەکرد، و تۆینبی دەشیگوت : دلّسۆزو داهێنەران، رەنگە تەنیا لەناو نێردراوانی خوا و لەناو پێغەمبەراندا هەلّبکەون. دەربارەی شارستانییەتی ئەوروپاش ، کە تووشی شلّەژاوی بووە، پێویستە ئایینێکی نوێ لەناو پرۆلیتاریادا واتا لەناو (کۆمەلّی گەل) ی مەسیحییدا سەرهەلّ بدات. ئایا خودی تۆینبی پێشبینی ئەوە دەکات؟ بڕوای پێی هەیە ؟

راستیشت دەوێت، پەیدابوونی شارستانییەت یان وریابوونەوەی شارستانییەتێك. تەنیا لەسەر پەیدابوونی ئایینی قەتیس نەماوە. ئێمە لەگەلّ ئەوەشدا کە رێز لەبەها رۆحییەکان و دروشمە بالاکانی سەرکەوتنی ئادەمیزاد دەگرین. بەلاّم ئادەمیزاد ئەو ئامادەگییەی نەماوە پێشوازی لە ئایینی نوێ بکات. کۆلّن ویلسون دەلّێت : ئێمە دەزانین ئەگەر شارستانییەتێکی کۆن بڕووخێت، شارستانییەتێکی نوێ لەسەر کەلاوەکانی دروست دەبێتەوە،بەلاّم ئەمڕۆ جیهان بچووك بووەتەوە، لەبەر ئەوە ناتوانین پێشبینی شارستانییەتی نوێ بکەین و سەرچاوەکەی بزانین، چونکە جیهان هەمووی ئێستا غەریب کەوتووە. ئەم قسەیەش هەمان ئەو قسەیەیە کە فرانسیس فۆکۆیاما لە کتێبەکەی خۆیدا (کۆتایی مێژوو) دەی کات. پاشان ئێمە ناتوانین بلّێین ناولێنانی شارستانییەتەکانی ئەمڕۆ کە تۆینبی ناوی لێ ناون. دروستە نەخاسمە شارستانییەتی

تازەی رۆژاوا لەئەوروپا، کە تۆینبی ناوی لێناوە (شارستانییەتی مەسیحی–کاسۆلیکی) بەتایبەتیش کە مۆرکی عەلمانیی دوور لە بۆچوونی ئایینی تێدا دەرکەوتووە، هەر بەو جۆرەش ناتوانرێت سیستەمی سۆشیالیستی لە یەکێتی شۆرەویی جاران بە کۆرپەی شارستانییەتی مەسیحییەتی رۆژهەلاتی (ئەرسۆدۆکسی) لەقەلەم بدرێت.

دەربارەی ئایینی ئیسلامیش بەم قسەیەی تۆینبی قایل نابین، کە دەلێت : " ئەگەر نێردراوی خودا محەمەد (د.خ) تەنیا لەسەر بانگهێشتی ئایینەکەی خۆی برۆیشتبا و دەستی لە سیاسەت و جەنگ وەرنەدابا، روحی ئایینی ئیسلام لە ئێستای بالاتر دەبوو.

لە راستیشدا تۆینبی کە بەو جۆرە ئیسلام هەلدەسەنگێنێت، ئەوە رای خۆی نییە، بەلکو راوبۆچوونی مەسیحییەو راوبۆچوونی مێژوو نییە. واتا رای تۆینبی لەبارەی ئیسلامەوە ، ئەوەیە کە ئایین لە دەولەت جیابکرێتەوە و وتەکەی ئینجیل ،کە دەلێت "ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەرە و ئەوەش کە هی خوایە ، بۆ خوا" بەسەر ئیسلامدا بسەپێنێت، چونکە خۆی مەسیحی بوو، نەك بەو سیفەتەی کە مێژوونووسێك بێت و واقیعی مەسەلەکە دوای لێکۆلینەوەو قولبوونەوە هەلسەنگێنێت.

"گرونباوم" دەلێت : ئەگەر تۆینبی تێکەلکردنی ئایین بەسیاسەت بە سووکایەتیی ئایین لێك دەداتەوە، خۆ ئیسلامەکان – لانی کەم لەو دەمەدا – پێچەوانەی ئەو بۆچوونەیان بەدروست دەزانی. باشتر وابوو وەك بۆچوونی ئیسلام سەیری ئەم مەسەلەیە بکرابا، نەك وەك بۆچوونی مەسیحییەت . چونکە تۆوی ئیسلامەتی، لەشاری مەککە گەشەی کرد و خەملی دوای هیجرەت بۆ مەدینە ئەو تۆوەش ئەگەر بە غەزاو داگیرکاریی نەبایە بلاو نەدەبۆوە و تەشەنەی نەدەکرد.

یەك لە رەخنەکانی (سۆرۆکن – Sorokin) ئەوەبوو، کە تۆینبی: خولی پەیدابوونی شارستانییەت بە ماوەی ئاشتیی بەردەوام دادەنێت.

ئەمەش واقیعی رووداوەکانی مێژوو رەتی دەکاتەوە و پێی رازی نابێت وزێتر لە بەڵگەیەکیشی لەسەرە چونکە (بە نموونە شارستانییەتی رۆژئاوا بەرای تۆینبی، بەر لەسەدەی پازدەم خولی گەشەسەندنی بە خۆیەوە گرتبوو، حەقیقەتیش ئەوەیە کە ماوەی سەدەی سێزدەو سەدەی چواردەی زایینی لە هەموو مێژووی ئەوروپادا... سەرباری ئەوەش خولەکانی هەڵوەشان، لە گەڵی شارستانییەتدا زۆرجاران لە خولەکانی پەیدابوون و خەملین، زیاتر ئاشتەوایی بوون.

پاشان سەیر دەکەی تۆینبی کەوتووەتە ژێر کاریگەریی فەلسەفەکەی شپینگلەر و وەکو ئەو شارستانییەتەکان لێك دەداتەوە و زۆربەی نیشانە زاڵ و بەرچاوەکانی "ستاتیکا لەلای گریك و ئایینی لەلای جوولەکە و ئوستورەیی لەلای ئیسلام و ئامێرکاری — تەکنیکی لەلای ئەوروپییەکان) هەمووی دەخاتە پاڵ شارستانییەت، کە ئەم حاڵەتانەش واقیعی مێژوو رەتی دەکاتەوە و قبوڵی ناکات. شارستانییەتی رۆژئاوا مۆرکی ئایینی لە خۆگرتبوو، بەهیچ جۆرێك ئامێرکاری و تەکنیکی نەبووە.

هەرچی شارستانییەتی ئیسلامییە هەر لەسەدەی هەشتەمەوە تا سەدەی سێزدەی زایینی دا "واتا هەر لەسەدەی دووەمی کۆچی تا سەدەی حەوتەمی کۆچی" مۆرکی زانستی لەخۆگرتبوو،لەو دەمەدا شارستانییەتی رۆژئاوا بە تۆزی پای دا نەدەگەیشت. ئیدی بەو جۆرە ئەوەی کە تۆینبی ناوی دەنێت (تایبەتمەندیی بەرچاوی سروشتی شارستانییەتەکان) لە واقیعدا بریتییە لە چەند حاڵەتێکی گۆڕاوی شارستانێتی لە نێوان شارستانییەتیە جۆربەجۆرەکاندا، واتاکەوتووەتەژێرکاریگەریی بیرۆکەکەی شپینگلەرەوە)، بریتی نییە لە تەنیا شارستانییەتیەك. هەروەها گەلێ کەس لەگەڵ تۆینبی هاورانین، کە لەنێوان شارستانییەتییەك و شارستانییەتییەکی تردا کەلێن هەبێت ، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا مانای کارلێك و تێکەڵاوی لەناو شارستانییەتە جۆربەجۆرەکاندا نامێنێت .ئەوەی پێوەندیشی بە شارستانییەتی کۆنی میسرەوە هەبێت ، دیسان گەلێ کەس لە دژی رای تۆینبی وەستان، کە دەڵێت :" ئەم شارستانییەتییە پێوەندیی منداڵڕاگرتنی (البنوة) بەهیچ شارستانییەتیەکی

تـرەوە نـەبووە و هـیچ شارسـتانییەتییەکیش پێوەنـدیی باوکایـەتیی (الابـوة)ی لەگـەڵی دا نـەبووە، مـادامێکی شارسـتانییەتی کـۆنی میسـر بـێ بـاوك بـووە، کەواتـە وەجـاغکوێریش بـووە!!! ئـەم قسـەیەش مانـای وایـە کـە شارسـتانییەتی میسـر، لـە خۆیـەوە لـەدایك بـووەو پاشـان بووەتـە بـەرد و کۆتـایی هـاتووە و هـیچ ئاسەوارێکیشـی لەسـەر شارسـتانییەتەکانی دوای خـۆی بـەجێ نەهێشـتووە و ئـەمڕۆ کـەس نەماوەتـەوە ئەو شارستانییەتە بنوێنێت و هیچ شتێك لەسەر و سیمای کۆنی نەماوەتەوە .

خۆشبەختانە ئەم بیرمەند و مێژوونووسە گەورەیە، ئەوەندە ژیا. هەمواركردنی هەندێ لایەنی هزر و بۆچوونی خۆی بە چاوی خۆی دیت، ئەوەبوو ئەوانەی راستکردەوە و بیر و هزری تازەی لە جێگەیان دانا، هەرچەندیش بیرۆکە ئەسڵییەکەی راست نەکردەوە نەخاسمە بیرۆکەی بێمنەتی (التحدی ) و گوێڕایەڵێیەکەی (الاستجابە) . رەنگە ئەگەر چەند ساڵێکی دیکە بمابا. چەند لایەنێکی تریشی لە بیرۆکەکەی راستکردبایەوە، ئەمەیە مەسەلەی هزری (هەندە بەسە).

هەروەها تۆینبی بەپێوەری سیاسەت شارستانییەتەکانی دەناسییەوە و هۆکاری هەرەس و رووخانی شارستانییەتەکانیشی دیسان لەسەر بنەمای سیاسەت لێك دەدایەوە. سەرباری ئەوانەش تۆینبی ئەزموون و شارەزایی لە ئەنسرۆپۆلۆجیا (ئادەمیزادزانی) و سۆسیۆلۆجیا (زانستی کۆمەڵایەتی ) و شارستانییەتدا نەبوو. تۆینبی بە تەقریری پرەنسیپەکانی هەندێ زانای کۆمەڵایەتییەوە خەریك بوو، وەك (سارد، ئەمیل دۆرکهایم و ، ماکس ڤیبەر) و زانایانی تریش، ئەوان پێش تۆینبی لێکۆڵینەوەیان لەسەری تەواوکردبوو، بە نموونە وەك لێکۆڵینەوەی : پرەنسیپی چاولێکەری و قانوونەکانی و پێوەندیی هۆکارەکانی دەمارگیری و جوگرافیا بە مەسەلەی پەیدابوونی شارستانییەت، کە تۆینبی پشتگوێی خستبوون. یان بۆی نەکرابوو سەیریان بکات.

هەروەها سۆرۆکن رەخنەی ئەوەی لێ گرت، کە مانای هەندێ زاراوەی کە بەکاری هێناون، وەك :" تەواوکاری(intergration) و یەکێتی(unity) و

تاکەکەسی(individuality) و زاراوەی تریشی لێك نەداوەتەوە و ڕێسای بۆ دانەناون، ئەو زاراوانە وەسفی شارستانییەتەکان و ڕۆشنبیرییەکانی پێ دەکرێت. مانای ئەو زاراوانە ڕوون نییە و لای تۆینبی دیاری نەکراون، زۆرجاریش لە مانای جۆربەجۆردا بەکاری هێناون. هەروەها تۆینبی زاراوەی سەیر و نەبیستراوی بە نموونە وەك (ین Yin) و (یانگ Yan)ی بەکارهێناوە .

## سەرچاوەکانی توێژینەوە

١- د. احمد محمود صبحى: في فلسفة التاريخ طبعة مؤسسة الثقافة الجامعية، الاسكندرية، ١٩٧٥.

٢- تؤينبي، ارنولد، ج، بحث في التاريخ، ترجمة: طه باقر، طبعة بغداد - ١٩٥٥- ١٩٥٦، جزءات.

٣- الكتاب نفسه دراسة للتاريخ - ترجمة: الادارة الثقافة في جامعة الدول العربية القاهرة ١٩٦٠، اربعة اجزاء.

٤- د. رافت غنيمى الشيخ: فلسفة التاريخ دارالثقافة والنشر والتوزيع. القاهرة. ١٩٨٨.

٥- د. رجاء ريان، مدخل لدراسة التاريخ، دار ابن رشيد للنشر والتوزيع، عمان - الاردن - ١٩٨٦.

٦- شفيتسر، البرت. فلسفة التاريخ. ترجمة: د. عبدالرحمن بدوى، طبعة المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة.

٧- صلاح المختار: ملاحظات حول معنى الحضارة، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٦.

٨- د. عبد الجليل الظاهر: مسيرة المجتمع، طبعة المكتبة العصرية، صبرا - بيروت - ١٩٦٦.

٩- د. عالية احمد سوسة، د. هاشم صالح التكريتى: بحوث مهرجان المؤرخ توينبي، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٩.

١٠- د. عفت محمد الشرقاوى: في فلسفة الحضارة، دار النهضة العربية، بيروت - ١٩٩٨.

١١- عمادالدين خليل: التفسير الاسلامى للتاريخ، مطبعة الميناء، بغداد، ١٩٧٨.

١٢- د. فؤاد محمد رشيد: توينبي مبتدع المنهج التاريخى الحديث، طبعة الهئية المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٥.

١٣– كارليل، توماس الابطال و عبادة البطولة، ترجمة: محمد السباعى، دار الكاتب العربي للتاليف والترجمة والنشر، بيروت، (د.ت).
١٤– كولنجوود، ر.ج: فكرة التاريخ، ترجمة: محمد بكر خليل، منشورات لجنة التاليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٦٨.
١٥– مجلة (عالم الفكر) الكويتية، عدد خاص عن فلسفة التاريخ، منها مجموعة بحوث رصينية.
١٦– محى الدين اسماعيل، توينبي.
١٧– منح خورى: التاريخ الحضاري عند تؤينبي، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٠.
١٨– د. نورى جعفر: التاريخ مجال و فلسفته، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٥.
١٩– ول ديورانت: مناهج الفلسفة، ترجمة: د. احمد فؤاد الاهوانى، القاهرة (د.ت).
٢٠– ولس، و. هـ: مدخل لفسفة التاريخ، ترجمة: احمد حمدى محمود، مؤسسة سجل العرب، القاهرة، ١٩٦٢.
٢١– ويدجرى، البان، ج: التاريخ وكيف يفسرونة. ترجمة: عبدالعزيز تؤفيق جاويد، طبعة الهئية المصرية، القاهرة، ١٩٧٢.
٢٢– ويلسون، كولن: سقوط الحظارة، ترجمة: انيس زكى حسن دار الاداب بيروت، ١٩٧١.

سەرچاوەكان بە زمانی ئینگلیزی:

٢٣- The Encyclopedia of philosophy.
٢٤- Geyl, Toynbee and Sorokin, The pattern of past, ١٩٤٩.
٢٥-Kosminski, Teynbee,
crisis, Moscow, ١٩٦٦. History of philosophy
٢٦- Von Grunebaum,
.Toynbees Concept of Islami Civilization

**پرۆسەی شێواندنی وێنەی ڕاستەقینەی پاڵەوان** لە مێژوودا حاڵەتێکی ئاساییە و لە قولایی مێژووی مرۆڤایەتیدا نامۆ نییە و بوونی چەسپاوی خۆی هەیە. ڕەنگە هۆکاری سەرەکی ئەم دۆزەش بریتی بێت لەوەی، کە پاڵەوان بەزۆری بانگەشە بۆ هزرگەلێك دەکات، کە دابڕاوە لەگەڵ ئەو تێڕوانین و ترادیسیا وەستاوانەی کە جەماوەر نەوە بەدوای نەوە وەك میراتییێك پێکیان هێناوە و پارێزگارییان لێکردووە.

جا کاتێك ئەو کەسانانە (پاڵەوانان) ئەو واقیعە تێدەپەڕێنن و بانگەشە بۆ هزرگەلێکی نوێ دەکەن و کار بۆ فەراهەمهێنانی ئامراز و شێوازی جۆراوجۆر دەکەن بۆ گۆڕینی واقیعی کۆمەڵایەتی و پاککردنەوەی لە چەمکە پەکخەر و مردووەکانی نێو کۆمەڵگە، بێگومان ئەوەش شەپۆلگەلێکی گەردەلوولیی لێ پەیدا دەبێت، کە هەژانی کۆمەڵایەتی قووڵ دەورژێنێت و دۆخی بێدەنگی و وەستاوی دەشڵەقێنێت.

ئەو کات کۆمەڵگە بە چەند بەرەیەکدا دابەش دەبێت و لە ڕووکەشدا دووانیان بەدیار دەکەون، یەکێکیان لایەنگیری ئەو (کۆن)ە دەکات، کە لە پێشینەکانەوە بە میراتی بۆی ماوەتەوە، بەڵام ئەوی دیکەیان پەیوەندی بە کاروانی چاکخواز یا شۆڕشگێڕ یاخود نوێکارەوە دەکات و تەبەنی هزرە نوێیەکان دەکات و لە پێناو سەرلەنوێ بونیاتنانەوەی کۆمەڵگە لە چوارچێوەی ئەو هزرگەل و رزگارکردنی لە چەمکە کۆنەکان تێدەکۆشێت.

ئەمە لە کاتێکدا بەرەی یەکەم بەتوندی بەرگری هەر هەوڵدانێك دەکات بۆ پێداچوونەوەی رابردوو و خوێندنەوە و شیکردنەوەی پێکهێنەر(مکونات)ەکانی، تێڕوانینی کلاسیکی و هەموو شێوازێك کە توانای بەسەردا بشکێت دەگرێتەبەر بۆ

لەباربردنی ئـەو هەولآنـە، جـا ڕەنگـە شـێواندنی هـزری چـاکەخواز و ناشـرینکردنی وێنەکەی و وروژاندنی گومان دەربـارەی پـەیام و بانگەوازەکـەی یەکـەم و ئاسـانترین ئامراز بن، کە رابردووخوازان پشتی پێ دەبەستن.

بەم شێوەیە لەلایەکـەوە ئەگـەر واتـای پاڵـەوان لـەوەدا چـڕبکەینەوە،کە هـەوڵی تێپەڕاندنی بارودۆخە وەستاوەکە دەدات و دەیـەوێت بـارودۆخێکی نـوێی پێشـکەوتوو بەدیبهێنێت، لەم پرۆسەیەشدا سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

لەلایەکی دیکەشەوە بواری کارکردنی پاڵەوان لە ئەمڕۆدا سنووری تەقلیدییـەکانی تێپەڕاندووە، واتا ئەگەر تا دوێنـێ ئـەو واتایـە لـە کەسـایەتییەکی سیاسـی یـاخود فەرمانڕەوایەکدا بەرجەستە دەبوو، ئەوا (کارلیل) ئەو واتایەی فراوانکرد و پاڵەوانی لە شێوەی (خوداوەند و پەیامبەر و شاعیر و قەشەو نووسەر و پاشـا)دا وێنـاکرد. دواتـر بەپێی قوتابخانەی ماددی بۆ مێژوو جەماوەر کرایـە پاڵـەوان و ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ ئـەو کایە هێندە فراوان کرا، کـە ئـەمڕۆ دەتـوانین بڵـێین بـە پێـی ئـەو ڕۆڵـە داهێنـەر و تێپەڕاندنانەی کە لە کایە جیاوازەکانی ژیاندا دەیگێڕن و بەدی دێنن پاڵەوان زیاتر لـە هەزار رووی هەیە.

بە تایبەتیش ڕۆڵی کەسایەتییەك،کە بیەوێت لە کۆمەڵگەیەکدا و لەسـەر ئاسـتی زانکۆ و خوێندنی باڵا گۆڕانکارییەکی داهێنەرانە بخولقێنێـت و کۆتـایی بـە شـێواز و میتۆدێکی دەق پێوەگرتووی چەندین ساڵە بهێنێت. دواتر باشـترین بـەدیل بـۆ ئەمـە بخاتەڕوو، ئەوا ناکرێت وەك کەسایەتییەکی سادە و تەنانەت خوێنـدەوارێکی زانکـۆیی تەقلیدیی تەماشای بکرێت، بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەوەش ڕوویەکی تری پاڵەوانێتییە.

لـەم سـەروبەندەدا مامۆسـتام (د. موحسـین محەمـەد حوسـێن) سـنووری بـاو و تەقلیدییەکانی تێپەڕاند و توانی لەگەڵ خۆیدا روح بەبەر جەستەیەکدا بکات، کـە تـا

ئەو کاتەی ئەو بە (جدی) کاری تێدا نەکرابوو، وەك جەستەیەکی خامۆشکراو وابوو، دیارە جەستە بێ روحەکان بێ چرپە و بێ بزووتنەوەن، بێ کاریگەری و رۆڵ بینینن.

مێژوو ئەو جەستەیە بوو، کە لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە روح دابڕابوو، بێگومان روحی مێژووش فەلسەفەیە.

(فەلسەفە) و (مێژوو) تەنها لەو روانگەوە پێکەوە گرێنەدراون، کە مێژووی فەلسەفە گوزارشتی لێدەکات، واتە تێبینیکردنی مێژووی هزری مرۆیی و گۆڕانکارییەکانی، بەڵکو لەو ڕوانگەشەوە کە (فەلسەفەی مێژوو)ە پێکەوە گرێدراون، واتە بیرکردنەوە لە پەرەسەندنی مێژوو و بزوتنەوەکەی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی قانوونێك کە ئەو پەرەسەندنە بەڕێوە ببات. بێگومان نە فەلسەفە تیۆرێکە لە بۆشاییدا هاتبێتە ئاراوە و نە مێژووش کۆمەڵە رووداوێکی هەڕەمەکییانەی مرۆڤەکانە. تەنانەت خودی مێژووی فەلسەفە بە درێژایی مێژوو رێگەیەکی مردووی رەوت و تیۆرە فەلسەفییەکان نییە ، بەبێ گەڕانەوە بۆ بارودۆخە مێژووییەکەی و گوزارشتکردنی لە گیانی سەردەم. بەڵکو بریتییە لە زانینی ئەو ئەزموونە مرۆییە تاکی و کۆمەڵایەتی و مێژوویيانەی کە ئەو فەلسەفانەی لێ بووە هەڵقوڵاون، بەم شێوەیە بە درێژایی مێژوو، مێژووی فەلسەفە مێژووی (گیان)ی مرۆڤایەتییە لە رووبەڕووبوونەوەی واقیعدا . بۆیە فەلسەفە نەوەی سەردەمەکەیەتی و گوزارشت لە قەیرانی سەردەمەکەی دەکات و هەوڵدەدات چارەسەرگەلێك بخاتەڕوو، کە بەهەمان شێوە گوزارشت لە قۆناغە مێژووییەکەی دەکات و هەوڵی تێپەڕاندنی بۆ قۆناغێکی دواتر دەدات.

فەلسەفەی مێژوو گەڕانە بەدوای کۆمەڵە بنەمایەکدا کە پەرەسەندنی کۆمەڵگە مرۆییەکانی پێوە بەندە، ئەوەش ڕاڤەکردنی ڕەوتی مێژوو لە ژێر تیشکی دیمانەیەکی گشتی ــ وەك گشتێك نەك دابەشکردن بۆ ڕووداوەکان-دا دەگەیەنێت، بەم شێوەیە

فەلسەفەی مێژوو بنەڕەتێکی فەلسەفەی بۆ زانستی مێـژوو دادەنێـت کـە لـە واتـای مێژوو و بوونی هۆکارێتی (السببیه) ڕووداوە مێژووییەکان و بـوونی ئـەو قانوونانـەی ڕووداوە مێژووییەکان بەڕێوە دەبەن و بـوون و دیـاریکردنی ئاڕاسـتەکانی بزووتنـەوەی مێژوو دەکۆڵێتەوە. واتە فەلسەفەی مێژوو تـەنها شـەنوکەوکردنی ئـەو ڕێبـازەی کـە مێژوونوسان دای دەنێن و گفتوگـۆکردن و شـیکردنەوەی سەرچـاوەکان و توێژینـەوەی زاراوەکانی مێژوونوسان ناگەیەنێت، واتە کارکردنیان لە ڕابوردودا، بەڵکو فەلسـەفەی مێژوو سنووری ڕابردوو تێدەپەڕێنێت و ئێستا و داهاتووش لەخۆدەگرێت.

لێرەوە بێگومان گرینگی دانمان بە فەلسەفەی مێژوو بۆ تێگەیشتنی ڕووداوەکـانی سەردەممانە، واتە بێئاگابوون لە فەلسەفەی مێژوو بێئاگابوونە لەم قۆناغەی ژیانی تێدا دەگوزەرێنین! لەبەر ئەوە نامۆ نییە لە ئێستادا بە ڕۆڵی نەوە ڕابردووەکان ببیـنین و لـە نێوماندا بزووتنەوەی سەلەفییەت (السلفیه) دەربکەوێت. یا بەرۆڵی نەوەکانی داهاتوو هەڵبستین و لە نێوماندا ڕەوتە مارکسی و عەلمانییەکان دروست بن، یاخود لە ئێستادا هیچ ڕۆڵێك ەبینینن و لامان باری بێباکێتی (لامبـالاة) دروست ببێـت، بـەبێ ئـەوەی بزانین ئێمە لە قۆناغی دەرچووندا ین لە تەقلیدێتییەوە بۆ ئازادی و لـە کۆنەخوازییـەوە بۆ نوێخوازی و لە ڕابردووەوە بۆ داهاتوو. بێگومان فەلسەفەی مێژووە ئەم ئەرکـە لـە ئەستۆ دەگرێت و مەشخەڵەکانی ڕێگەمان بۆ دەخاتە بەرچاو.

(د. موحسین محەمـەد حوسـێن) خـۆی گوتـەنی و لەسـەرەتای خوێندکارێتییـەوە چەمکە فەلسـەفییەکان سـەرنجی ڕاکێشـاوە و لەناویانـدا بـە تێڕوانینـەکانی (ئـیبن خەلدوون) و تێڕوانینەکانی لێکدانەوە عەقڵانییەکان بۆ بزووتنەوەی مێژوو ئاشـنابووە. دواتر لە زانکۆدا و بەتایبەتی لە بەشی مێژوو وەرگـیراوە، زیـاتر گرنگـی بـە بابـەتی فەلسەفەی مێژوو داوە. پاشتر و لەنێوان ساڵانی (١٩٦٦ _ ١٩٧٠) لە شاری هـەولێر

لەسەر رۆشنایی فەلسەفەی مێژوو، ماددەی مێژووی لە خانە و پەیمانگەی مامۆستایان داوەتەوە. لە ساڵی (١٩٨٢ ـ ١٩٨٣) بەشێوەیەکی کرداری لە بەغداو لە بەشی مێژوو بابەتی فەلسەفەی مێژووی داوەتەوە. دیارە تا ئەو کاتە نەك پسپۆڕێك لە بواری فەلسەی مێژوو لە عێراقدا نەبوو، بەڵکو لە بوارەکانی دیکەی هزری مێژووییشدا نەبوو.

دەتوانین بڵێین لێرە بەدواوە وتنەوەی ئەو مادەیە گرنگی پێدانەکانی ئەوی بۆ کایەی فەلسەفەی مێژوو گواستەوە. هەر بۆیە چەندەها توێژینەوەی زانستی دەربارەی گەورە بیرمەندانی فەلسەفەی مێژووی وەك (ئیبن خەلدون و ڤیکۆ و شپینگلەر و تۆینبی و... تاد) خستەڕوو.

هەموو ئاواتەکانی ئەویش بریتی بوو لەوەی، کە زانکۆکانی کوردستان گرنگی بە فەلسەفەی مێژوو بدەن و خوێندکارانی خوێندنی باڵا پسپۆرییەکانیان لەو کایەدا چڕبکەنەوە. واتە ئامانجی لە گرنگی دان بەو جۆرە توێژینەوانە و بابەتی فەلسەفەی مێژووی لە زانکۆ و خوێندنی باڵادا بۆ تێپەڕاندنی واقیعی مەنگی کۆمەڵگەی کوردی بوو، چونکە وەك پسپۆڕێکی مێژوو بەباشی لەوە گەیشتبوو، کە داگیرکەرانی کوردستان بە درێژیی مێژوو بە چ شێوەیەکی ترسناك کاریان لەسەر شێواندن و دواخستن و وێرانکردنی کۆمەڵگەی کوردی کردووە. بەهەمان شێوەش ئەو زوو لە رۆڵی فەلسەفەی مێژوو وەك زیندووترین کایەی مەعریفی زانستە مرۆڤایەتییەکان تێگەیشتبوو، هاوکات پەی بە رۆڵی زانکۆ بردبوو لە پرۆسەی گۆڕان و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەدا. بۆیە بەردەوام هەوڵی دەدا و خوێندکارانی خوێندنی باڵای ئاراستە دەکرد، تا ئاوڕێك بەلای فەلسەفەی مێژوودا بدەنەوە. لەو بوارەشدا شوێن دەستی دیارە.

لێرەدا بە گرنگی دەزانین ئاورێك لەو گوتە بەناوبانگەی (ڤۆلتێر) بدەینەوە، کە دەڵێت: "هەندێ لە مێژوونووسان گرنگی بە جەنگ و رێکەوتنامەکان دەدەن، بەڵام دوای خوێندنەوەی باسی سێ هەزار تا چوار هەزار جەنگ و سەدەها رێکەوتنامە، دانایەتییەکی تێدا زیاد نەکردم، تەنها ئاشنابوون بوو بە رووداوگەلێك کە ئەو ماندووبوونەی نەدەهێنا کە مرۆڤ لە رێگەی زانیندا تووشی دەبێت. واتە چ دانایەتییەك لەو زانستەوە بەدیدێت کە لە سایەی سەرۆکایەتی فەرمانڕەوایەکی یاخی بەسەر گەلێکی بەربەریدا بەدەست دێنێت، جگە لە داگیرکاری و وێرانکردن نەبێت؟

بۆیە دەبێت بواری مێژوو بۆ لەوە گرنگتر فراوان بکرێت، تا بەدوای رەوتی ژیری مرۆڤایەتیدا بگەڕێت، لە فەلسەفە و رەوانبێژی، هۆنراوە و رەخنەگرتن، وێنەگرتن و هەڵکۆڵین، مۆسیقا و وێنەکێشان، تەنانەت لە چنین و دروستکردنی کاتژمێرەکان، هەموو ئەوانەی کە کەسێتی گەل دەنوێنن، بە گشتی ئەمانە شیاوترن بۆ گرنگیپێدان، نەك مەعریفەیەکی جوزئی دەربارەی هەوڵی پاشایەك یاخود گفتوگۆی نێو کۆشکەکان، بێگومان سەرکردەکان چاوگی خێر و چاکەی مرۆڤایەتی نین، بەڵکو ئەوە فەیلەسوف و زانا و شاعیرەکانن. ئەگەر پرسیارم لێ بکرایە: کام لەم پیاوانە مەزنترن: (ئەسکەندەر)، یا (قەیسەر)، یا (تەیمورلەنگ)، یاخود (کرمۆیل)؟ ئەوا وەڵامم دەدایەوە کە: (ئیسحاق نیوتن) لە هەموویان مەزنترە.

پێوەری مەزنێتی ڕاستەقینە کە لە بەخششی بلیمەتیدا دەدرەوشێتەوە و ئاسمان بە مرۆڤێکی دەبەخشێت، سوودبەخشین و ڕووناککردنەوەی رێگەیە بۆ کەسانی دیکە بەو بلیمەتییەی کە پێی بەخشراوە. دواتر پیاوێکی وەك (نیوتن) کە رەنگە زەمەن هەر دە سەدە جارێك کەسێکی وا بەخۆیەوە ببینێت، ئەوە مەزنی ڕاستەقینەیە. بەڵام ئەو سیاسەتمەدارو سەرکردانە کە سەدەیەك نییە ئەوانی تێدا نەبن، بەڵکو لە ڕاستیدا جگە

لە خراپەکار شتێکی تر نین. بۆیە دواتر خۆمان لەوەدا دەبینینەوە کە پابەندیین بە سەردانەواندنمان بۆ ئەو گەورەییەی کە گەردوونی راڤەکرد، نەك بۆ ئەو کەسانەی کە دەی شێوێنن".

ئەگەر هەمان پرسیار لە خۆمان بکەین کە: ئایا سەرکردە سیاسییەکان گەورەترن یاخود پسپۆڕەکەی بواری فەلسەفەی مێژوو؟ ئەوا بەوپەڕی پێزانین و نرخاندنی خەبات و تێکۆشانی سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی ڕێگەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لەم قۆناغەی ئێستادا دەڵێین ئەگەر لەسەر ئاستی سیاسی و شۆڕشگێڕی خەباتیان کردبێت و تەواوی ژیانی خۆیان بۆ ئەم بوارە تەرخان کردبێت، ئەوا (د. موحسین محەمەد حسێن) قووڵ و دووربین بۆ کۆمەڵگەی روانیوە، چونکە ئەم دەمێك بوو درکی بەو ڕاستییە کردبوو، کە هەر بزووتنەوەیەکی سیاسی و شۆڕشگێڕی گەر فەلسەفەیەك لە پشتییەوە نەبێت و بۆ سەر ئاستی تاك و کۆمەڵگە دانەبەزێنرێت، ئەوا تەواوی هەوڵەکان ڕووکەشی دەبن و گۆڕانکارییەکانیش لەباتی ئەوەی بە ئیجابی بشکێتەوە ئەوا بە خراپی دەشکێتەوە.

واتە ئەگەر سەرکردایەتی کوردی سەرکەوتوو بووبێت لەوەدا کە توانیبووی چەك بەتاکی کوردی هەڵبگرێت و بیخاتە کۆڕی خەباتەوە، ئەوا ئەم پسپۆڕە ئەوە لە تاکەکان دەگەیەنێت، کە بۆچی و کەی دەبێت چەك هەڵبگرن؟ بەواتایەکی تر ئەو هەوڵی داوە کار لەسەر مەودایەك بکات، کە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا کاری لەسەر نەکراوە.

بەکارهێنان و بەگەڕخستنی ژیری و شارەزابوون لە تیۆرە فەلسەفییە جیاوازە دەوڵەمەندەکانی جیهان ئەو پێداویستییە بنەڕەتییەی کۆمەڵگەی کوردی بوو، کە تا ئەو کاتەی بە (جدی) کاری تێدا نەکرد، لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا جگە لە چەند هەوڵێکی سەرەتایی شتێکی ئەوتۆمان بەرچاوناکەوێت.

هەرچەندە هیواو هەڵپەکانی (د. موحسین محەمەد حسێن) بۆ کۆمەڵگەکەی لە ئاستێکی بێپایاندایە، بەڵام هێشتا هەوڵەکان و تێگەیشتن لە خەونەکانی ئەو لەلایەن کۆمەڵگە و تەنانەت لە ناوەندە ئەکادیمییەکانی وەك زانکۆکانی کوردستانیش لە ئاستێکی زۆر نزم دایە.

بێگومان بۆ کۆمەڵگەیەکی کوردی وەك هەرکۆمەڵگەیەکی تری ڕۆژهەلاتی ڕەوشە ئاساییە، چونکە لەم کۆمەڵگەیانەدا ئەوەندەی مردووەکان گرنگی و پیرۆزیی و گەورەییان پێدەدرێت، نیو ئەوەندە زیندووەکان ناخوێندرێنەوە. ڕەنگە بەشێکی ئەو فەرامۆشکردنەش بۆ نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و مەعریفی خودی کۆمەڵگەکە بگەڕێتەوە، بەشێکیشی پەیوەندی بە ئیرەیی بردنی کەسانی خودی ناوەندە ئەکادیمییەکانەوە بێت، دەشێت بەشێکیشی کە بەلای ئێمەوە (پشکێکی گەورەی) هەیە، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ژیان و بەرهەم و هەوڵەکانی ئەو زاتە نەکرابێت، ڕەنگە چاوەڕوانی مردنی بکەین و بۆ دوای مردنی ئەومان هەڵگرتبێت، چونکە پاڵەوان لای ئێمە ئەو کەسانەن، کە دەستەویەخە لە بەرانبەر دوژمندا قارەمانێتی دەنوێنن، یاخود ئەو کەسانەن کە مردنەکەی دەمانهەژێنێت و ئاوڕێکمان بەلای ژیانی پێشینەیدا پێدەداتەوە. هەر بۆیە وا ڕاهاتووین (بەشێوەیەکی گشتی نەك ڕەها) دوای مردنی کەسایەتییەکان لە هەوڵ و بەرهەمەکانیان دەکۆڵینەوە و دەبنە مایەی سەرنجڕاکێشانمان، نەك ژیان و زیندوێتییان!

*ئەم بابەتە گۆڤاری کۆچ ئامادەی کردووە و لە ژمارە (١١ و ١٢)، سلێمانی ساڵی ٢٠٠٩، ل: ٣٩٤ _ ٤٠٠ دا بڵاوبووتەوە.

## سەرچاوەکان

١- د. احمد بدر: اصول البحث العلمي و مناهجه، طبعة وكالة المطبوعات. الكويت، ١٩٧٨.

٢- د. احمد محمود صبحى: في فلسفة التاريخ، طبعة الثقافة الجامعية. الاسكندرية . مصر، ١٩٧٥.

٣- ادوالاد كار. ماهو التاريخ؟، ترجمة: احمد حمدي محمود. مؤسسة سجل العرب. القاهرة، ١٩٦٢.

٤- ارنست كاسيرر: في المعرفة التاريخية ،ترجمة: احمد حمدى محمود. دار النهضة العربية. القاهره، ١٩٦٢.

٥- د. اسحق عبيد: معرفة الماضي من هيرودوت الى توينبى ،القاهرة، ١٩٨١.

٦- د. اسد رستم: مصطلح التاريخ. بيروت. ط٣، ١٩٥٥.

٧- ايمرى نف : المؤرخون وروح الشعر، ترجمة: د. تؤفيق اسكندر . مكتبة الأنجلو _ المصرية . القاهرة، ١٩٦١.

٨- آرنولد توينبى ، بحث في التاريخ،ترجمة: طه باقر. مطبعة التفيض . بغداد، ١٩٥٥.

٩- جوزف هورس: قيمة التاريخ، ترجمة: نسيم نصر. منشورات عويدات . بيروت، ١٩٧٤.

١٠- د. حسن عثمان: منهج البحث التاريخي طبعة دار المعارف. طبعة خامسة . القاهرة، ١٩٨٤.

١١- د. حسين مؤنس: التاريخ والمؤرخون، مجلة"عالم الفكر"الكويت.الجلد الخامس، ١٩٧٤.

١٢- د. حسين مؤنس : الحضارة ،الكويت، ١٩٧٨.

١٣- د. خليل سعيد عبدالقادر: منهج البحث التاريخى، مطبوعات : جامعة بغداد، كلية التربية للبنات, ١٩٨٨.

١٤-ابن خلدون، عبدالرحمان بن محمد(م٨٠٨ك/١٤٠٦م): المقدمة، مكتبة المدرسة و دار الكتاب اللبنانى للطباعة والنشر الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٧٩.

١٥- راوس .م. ل: التاريخ أثره و فائدته ،ترجمة: مجد الدين حفن ناصف . مؤسسة سجل العرب. القاهرة، ١٩٦٨.

١٦- د. رأفت غنيمى الشيخ: فلسفة التاريخ،ط. دارالثقافة والنشر والتوزيع. القاهرة، ١٩٨٨.

١٧- د. رجاء ريان: مدخل لدراسة التاريخ، طبعة دار ابن رشد للنشر والتوزيع . عمان . الاردن ١٩٦٨. .

١٨- السخاوى، شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (م٩٠٢ك/١٤٩٧م)،الاعلان بالتوبيخ لمن ذم التاريخ. طبعة القاهرة، ١٣٤٩ه.

١٩- د. شاكر مصطفى: التاريخ هل هو علم: مجلة (عالم الفكر) الكويت الجلد الخامس. العدد(١)، ١٩٧٤.

٢٠-طاش كبري زادة، احمد بن مصطفى (م٩٦٨ك/ ١٥٦١م):مفتاح السعادة ومصباح السياده، منشورات دار الكتب الحديثه، مطبعة الاستقلال الكبري،القاهرة، ١٩٦٨.

٢١- طه باقر و عبدالعزيز حميد: طرق البحث العلمي في التاريخ والاثار ،طبعة جامعة الموصل، ١٩٨٠.

٢٢- د. عبدالرحمن بدوى : مدخل جديد الى الفلسفة ،مطبعة وكالة المطبوعات، الكويت. دار القلم، بيروت ١٩٧٩.

٢٣- عبدالعليم محمد: التراث بين الاصولية والعلمانية ، مجلة (المنار)،باريس، العدد (٥٠)، ١٩٨٩.

٢٤- عبدالمنعم الخضنى: المثالية والمادية وازمة العصر، طبعة المركز العربي للثقافة والعلوم، بيروت(د.ت).

٢٥- د. عرفان عبدالحميد: المدخل الى معاني الفلسفة ،طبعة دار الشؤون الثقافية العامة. بغداد، ١٩٨٦.

٢٦- د. عفت محمد الشرقاوى: في فلسفة الحضارة الاسلامية ،مطبعة دار النهضة العربية. بيروت. طبعة الثالثة، ١٩٨١ .

٢٧-فرانز روزنتال: علم التاريخ عند المسلمين ، ترجمة: د. صالح احمد العلي. بيروت. مؤسسة الرسالة . طبعة ٢، ١٩٨٣.

٢٨- فرانسسوا دوس: ميشال فوكو الفيلسوف الملتزم، مجلة (المنار) باريس. العدد. (٢) . ١٩٨٥

٢٩- د. فؤاد زكريا: الفلسفة والدين في المجتمع العربي المعاصر،طبعة مركز دراسات الوحدة العربية . بيروت . ١٩٨٥

٣٠- د. قسطنيطين زريق . نحن والتاريخ، طبعة دار العلم للملايين. بيروت الطبعة الخامسة، ١٩٨١.

٣١- كنت ، ايمانويل: التاريخ العام. فصل من كتاب (النقد التاريخى) ترجمة: د. عبدالرحمن بدوي طبعة، وكالة المطبوعات،الكويت،طبعة، ١٩٧٧.

٣٢-كولنجوود: فكرة التاريخ، ترجمة: محمد بكر خليل. طبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر ، القاهرة، ١٩٦٨.

٣٣_ ليدل هارت: التاريخ فكراً استراتجياً، ترجمة: د. حازم مشتاق طالب، طبعة الدار العربية، بغداد، ١٩٨٨.

٣٤- لويس جوتشلك: كيف نفهم التاريخ؟، ترجمة: د. عائدة سليمان عارف و د. احمد مصطفى ابو حاكمة، طبعة دار الكاتب العربي، بيروت، ١٩٦٦.

٣٥- د. محمد الطاليي: التاريخ و مشاكل اليوم والغد، مجلة (عالم الفكر) الكويت، المجلد(٥) العدد(١١)، ١٩٧٤.

٣٦- محى الدين اسماعيل: توينبى منهج التاريخ وفلسفة التاريخ، طبعة دار ايظ. بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٨٢.

٣٧- المسعودي، علي بن الحسين بن علي(م٣٤٥ك/ ٩٥٦م)،مروج الذهب و معادن الجوهر، بيروت، ١٩٦٥.

٣٨- د. نورى جعفر : التاريخ مجاله و فلسفته، مطبعة الزهراء ، بغداد، ١٩٥٥.

٣٩- هرنشو. ف.ج. علم التاريخ، ترجمة: عبدالحميد العبادي ، طبعة دار الحداثة، الطبعة الثانية ، بيروت، ١٩٨٢.

٤٠-هنرى جونسون: تدريس التاريخ ، ترجمة: ابو الفتوح رضوان طبعة دار النهضة العربية ، القاهرة، ١٩٦٥.

٤١- هيجل ج. ف: محاضرات في فلسفة التاريخ ، ترجمة: امام عبدالفتاح امام. طبعة دار الثقافة للطباعة . القاهرة، ١٩٨٠.

٤٢- ول ديورانت: مناهج الفلسفة، ترجمة : د. احمد فؤاد الاهواني.

٤٣- وولش . و. هـ: مدخل لفلسفة التاريخ، ترجمة : احمد حمدى محمود ، طبعة مؤسسته سجل العرب ،القاهرة، ١٩٦٢.

٤٤- ويد جيرى. البان. ج: التاريخ. وكيف يفسرونه، ترجمة: عبدالعزيز توفيق جاويد. طبعة الهئية المصرية القاهرة، ١٩٧٢.